MEMILEKETÎ 'ÎŞQ

کتێبی دووەم

# مەملەکەتی عیشق

پرنسیپی عیشق





ماکوان کەریم

بسم الله الرحمن الرحیم

# مەملەکەتی عیشق

## پرنسیپی عیشق

### کتێبی دووەم

نووسینی: ماکوان کەریم

پێداچوونەوە: شەوبۆ جەلال

کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی



بەڕێوەبەری گشتی: محمد خضر احمد 07824671394 - 07504671394
بەڕێوەبەری هونەری: مصطفى محمد کوردی 07509998182
فەیسبووک: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/M.Ktebxana
ئنیستگرام: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/M.Ktebxana
لقی یەکەم: چوارڕیانی شێخ مەحمود - بەرانبەر مزگەوتی مەحمود عەلاف
لقی دووەم: بەرانبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری
ئیمێل: mdmaktaba@gmail.com

نەخشەسازی ناوەوە: مصطفى محمد کوردی

نەخشەسازی بەرگ: برەو نەججار

چاپی دووەم: ٢٠٢٥

پێوانە: ١٤ * ٢١

تیراژ: ١٠٠٠

لاپەڕە: ٣٤٤

نرخ: ٨٠٠٠

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان

ژمارەی سپاردنی (١٣٧٦) ساڵی (٢٠١٧)ی پێدراوە.

لەکوێدا تەواوی ڕێگاکان دەگیرێن
خوای پەروەردگار ڕێگای نوێت بۆ دەکاتەوە
ئەوەندە بەسە کە بزانین کە
زاتی بەرزی دەبینێت، دەزانێت و دەتوانێت

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## پێشەکی پرنسیپی عیشق

هەموو کتێبێک خاوەنی کەسایەتی تایبەتی خۆیەتی، لەهەمان کاتدا کتێب ئاوێنەی نووسەرەکەیەتی.

کتێبەکە دەریدەخات کە توانا و بەهرەکانی تا چ ئاستێکە، پاشان کتێب دەبێتە ئاوێنە بۆ خوێنەر تا بونیادی کەسایەتی خۆی پێ بکات.

نووسینی کتێب چەند جۆرە:

جۆرێکیان زانستییەو لەسەر بنەمای تیۆر و بەڵگە دادەمەزرێت و دەنووسرێت، ئاراستەی ئەم جۆرە نووسینە لە خاڵێکەوە دەست پێدەکات تا کۆتایی لەسەر بنەمای زانستەکە هەر بەو خاڵەش کۆتایی دێت.

تیۆرێک دەدات بە دەستەوە وەکو کتێبە زانستییە گرنگەکانی دنیای کیمیا، فیزیا، فەلەکناسی و ...هتد.

جۆرێکی تر لە نووسین ئەدەبیاتە جوان و داڕشتنی ڕێزمان و خاڵبەندی تێدا دەردەکەوێت، ئەم جۆرە زۆرێک لە بوارەکان دەگرێتە خۆ وەکو ڕۆمان، نۆڤێل و چیرۆک و داستانەکانی مێژوو لە بوارەکانی شۆڕش و خەبات و...هتد.

جۆرێکی تر بریتییە لە فەلسەفە و فیکر زمانی تایبەتی خۆی هەیە پڕە لە زاراوە و نموونەی تایبەت، دنیایەک هونەری نووسینی تێدا بەکاردێت و داڕشتنی تایبەتی خۆی هەیە، پاشان ڕەخنەو جوڵاندنی پرسیارە گرنگەکانە ...هتد.





جۆرێکی تر نووسینە کلاسیکییەکانە، ئەم جۆرەش بە چەندین شێوە نووسراونەتەوە، دەشێت داڕشتن و ڕێزمان و خاڵبەندییان جیاواز بێت دەنا هەر یەک سەردە و هەمان زانیاری دووبارە بۆتەوە، نموونەی ئەوانە زۆرن وەکو کتێبەکانی سیرەی پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەران بە گشتی سەلامی خوایان لێ بێت، هاوەڵان و پیاوچاکان و...هتد.

ئەڵبەت نووسەر ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە تاموچێژ پێدان بە جۆری ئەو نووسینانەی کە ناومان هێنان، هەموو ئەوانەی باسم کرد خەڵکی بەتوانا و خاوەن ئەزموون دەتوانێت بینووسێت، کارەکەیان گەورەیەو منیش زۆر بە بەرز دەینرخێنم، بەڵام بەداوای لێبووردنەوە پێناچێت نووسینەکانی من کە ناسراوم بە ماکوان کەریم لەم جۆرانە بچێت، خاوەنی ڕێڕەوی تایبەت بە خۆیەتی، هەموو ئەوانەی باسم کردن بە دڵنیاییەوە لەمن بە تواناترن و بەئەزموونترن، بەڵام خاوەنی ڕێچکەی تایبەتی خۆمم ئەو کتێبانەی کە من نووسەرەکەیم چوار بنەمای تایبەتیان هەیە، زمانی نووسینم زۆر سادەیە کە دەڵێم سادەیە بەواتای زمانی گفتوگۆی ناو خەڵکییە، نەک زمانی نووسین، ئەم جۆرە لەتوانای هەموو کەسێکدا نییە و تەکنیکە، ڕاستە سادەیە بەڵام لەناو خودی خۆیدا جۆرێکە لەتوانا و جۆرێکیشە لە تەکنیک.

لەبەر ئەوە هەموو ئەو ئاراستە کراوانەی لە ئێستادا هەن لە بینرا و بیسترا و خوێنراوی ناو دنیای تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانیش لە ئەمڕۆدا یەکجار زۆرن و چاو و مێشک و گوێی خەڵکیان ماندوو کردووە، خەڵکی زمانی نووسینی ئاسانی دەوێت تا بتوانێت زانیاری لێوەربگرێت و پەیوەندی لەگەڵ ئەو نووسراوەدا ببەستێت، چی ئاسان بێت دوای دەکەوێت. ئەمەش زانیارییەکی نوێ نییە، بەڵکو سروشتی مرۆڤ وا هەڵکەوتووە کەواتە نووسینی بەندە زۆر سادەیە و زمانی گفتوگۆیەو لەسەر ئەم نووسین و شێوە داڕشتنە چوار بنەما تایبەتەکەم بۆ خۆم داناوە کە بریتین لە:

یەکەم: زۆرێک لەو کتێبانەی کە نووسیومە وزەی ئەرێنی و هێز و توانا دەداتە خوێنەر، ئەوە ئامانجی سەرەکی منە، ئەگەر هێز نەداتە خوێنەر





کەواتە نووسەرێکی شکستخواردوو بووم، ڕاستە من ناتوانم بڕیاری لەسەر بدەم و خوێنەر ئەو بڕیارە دەدات، بەڵام خۆشبەختانە لەلایەن خوێنەری کتێبەکانمەوە ئەو وەڵامەم دەست کەوتووە کە هەزارەها خوێنەر گەواهی ئەوە دەدەن کەوا ئەو وزە و هێزو توانایەیان وەرگرتووە لە کتێبەکان، بەدڵنیاییەوە ئەمەش سوپاسی خوای پەروەردگاری دەوێت، منیش لە ئیسلام و خواناسییەوە فێربووم.

دووەم: پڕە لە زانیاری بۆ ژیانی خوێنەر، خوێنەر هەرگیز لە دووڕیاندا بەجێ ناهێڵم، بەڵکو لەکاتی نووسین لەگەڵ کەسایەتییەکان دەڕۆم، لەگەڵیان دەژیم و لەگەڵیان خەموخەفەت دەخۆم تا بەو زانیارییانە کەسایەتییەکان بونیاد بنێم، پەروەردە دەبێت بۆ کۆمەڵگە و بەباشترین جۆری کواڵیتی پەروەردەی دەکەم، ئەمەش وتەی هەزاران لاوی کوردستانە لە ڕۆژهەڵات و باشور کە بۆم گەڕاوەتەوە.

سێیەم: وزەی ئەرێنی و زانیاری زۆر کافی نییە بۆ خوێنەرەکانم، بەڵکو مەشقی چاونەترسی، ئازایەتی، دڵسۆزی و جوامێری زیاتر دەخەمە سەر پێناسەی خۆیان و ئەگەر پیاوە کامڵ دەبێت، ئەگەر گەنجە وریاتر دەبێت، ئەگەر ژنە دەبێتە خانمی سەرەکی لە بوارەکانی ژیاندا وەکو دایک و شێرەژنێک بەرپرسیارێتی دەگرێتە ئەستۆی خۆی و دەبێتە خاوەن غیرەت و ئازایەتی.

هەموو ئەمانەش بۆ هەموو چین و توێژەکانە لە خانە و کاتەگۆرییەکانی مۆراڵدا کۆدەبنەوە کە بریتییە لە دابونەریتی ڕەسەن، ئاکاری جوان، ڕەوشتی بەرز، گەواهی ئەوەم بۆ دراوە لە خوێنەرانەوە کە کتێبەکانم بەم ئاراستەیەدا دەڕۆن.

چوارەم: خواناسی و دینداری و گەڕان بەدوای پرسیارە ونبووەکاندا و دۆزینەوەی وەڵامەکانی، بیروهۆشی قیامەت و پاکبوونەوەی دڵودەروون و بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆح بۆ پلەی فریشتەیی ئەمەش فەزڵی خوای پەروەردگارە بەسەرمەوە کە سەدان کەس بەهۆکاری کتێبە سادە و



ساکارەکانی ماکوان کەریم کە لەوپەڕی دنیاو لە زینداندایە گەڕاونەتەوە بۆ ئەم ئیسلامە، بەدڵنیاییەوە کەرەم و فەزڵی خوای موتەعاله بۆم، الحمد الله.

کۆتا وتە: پرنسیپی عیشق هەموو ئەمانەی تیا کۆبۆتەوە، کتێبی دووەمی مەملەکەتی عیشقە پڕ پڕە لە زانیاری کۆمەڵایەتی، ئایینی، سیاسی، بەهاکانی ڕەوشتی ئیسلامەتی و کوردەواری بفەرموون بۆ ناو دنیای مەملەکەتی عیشقی ماکوان بەڵام بە پرنسیپی عیشق.

ماکوان کەریم
٢٠٢٤/٠٣/١٥
زیندانی ئیولەشمۆ/ نەرویج

# نەبەزە شووم

ساڵی ۲۰۱۳ گۆڤاری ڕێگام داخست، پاشان داوام کرد لە سەندیکای ڕۆژنامەنووسان کە گۆڤارێکی تر دەکەمەوە بە ناوی (بزاڤ) لە مانگی دەی هەمان ساڵ گەڕامەوە کوردستان، وەکو پیشەی هەمیشەیی پاسەوان و پۆلیسەکانی فڕۆکەخانە گێچەڵێکی ترم پێکرا، دوای ماندوو بوون دەیانوت فەرموو بڕۆ...

هاتمەوە دەرەوە زۆر پەست بووم پارەی عێراقیم پێ نەبوو چاوەڕوانی براکەم بووم بێت بە شوێنمدا کە بەهۆکاری قەرەباڵغی و ترافیکی شەقامی سالم هەندێك دواکەوت، منیش لەسەر لێواری شۆستەی تەکسییەکانی فڕۆکەخانە دانیشتبووم چاوەڕوان بووم.

لەپڕ سەیارەیەکی ئاسایش هات و لەتاسەکان هێواشی کردەوە، شۆفێرەکەو کەسێکی تری لەگەڵ بوو سەیری منیان دەکرد، وتم دیسان گێچەڵێکی ترە، داخۆ ئەم کەسانە کامیان ڕقیان لە منە، بزانین چی ڕوو ئەدات.

سەیارەکە ڕاوەستاو کەسێکی لێ دابەزی ڕووەو من هات سێ ئەستێرەی بەسەر شانەوە بوو، لێم نزیک بوویەوە هەر لەسەرجادەکە، بەدەم پێکەنینەوە وتی خۆ هەردەبێت پیاوی فەقیر بێت بۆلای دەوڵەمەند، کە نزیکتر بوەوە ناسیمەوە کە (نەبەزە شوومی)ی هاوڕێی منداڵی و گەڕەکە.

باوەشمان کرد بەیەکدا و دوای ئەحواڵ پرسی و چاکوچۆنی، نەبەز وتی: ناتوانم بتگەیەنم، چونکە لە دەوامم بەڵام خۆشحاڵ بووم بە بینینت.

ماکوان: بەڕاستی منیش خۆشحاڵ بووم کاک نەبەزی بەڕێز.

نەبەز: توخوا با هەروەک جاران بین و ڕەسمیات و جدیات نەبێت لە نێوانماندا، دەزانم ئێستا ناسراوی بە ماکوان کەریم و بویت بە ئیسلامی.

ماکوان: باشە نەبەز گیان تۆش هەر برای عەزیز و خۆشەویستی جارانی کاتی خۆی خۆم کردمیت بە یەکێتی، لە کۆمیتەوە ناردمیت بۆ کولیەی سەربازی لە قەڵاچوالان، بەڵام مادام لە خزمەتی نیشتمان دایت پەشیمان نیم، ئەگەر نوێژ و خواناسی بکەیت؟

نەبەز: بەخوا چووم بۆ عومرە و سەرم بڕوات نوێژم ناڕوات، بەخوا ئەو کاتەی تۆ نوێژت نەئەکرد من هەر نوێژم ئەکرد.

ماکوان: باشە نەبەز گیان خوای گەورە لێت قبوڵ بکات، ئەوە پێشڕەوی برام هات ژمارەی مۆبایلەکەت بدە بە پێشڕەو، نووسینگەکەی من لە بازاڕی ڕەشەمۆڵە یەکتری دەبینینەوە. پاش ساڵانێکی زۆر لەو جێگایەدا بینیمەوە و ژمارە تەلەفۆن گۆڕایەوە و دیمەنەکەم لا جوان بوو، پاشان لە گەڵ پشڕەو سەرکەوتین و لەدوای هەواڵ پرسین...

پێشڕەو: کاکە ئەوە نەبەزە، خۆ ئەزانی بەچی ناسراوە؟

ماکوان: بەڵێ؛ نەبەزە شووم، بەڵام بەخوا من بڕوام بەو شتانە نییە.

پێشڕەو: بۆ خاتری خوا تۆ دەزانی ئەم کوڕە زۆر نەگبەت و شوومە، باوکی پەرەمێزی چاک دەکرد ئەم ئەحمەقە باوکی گڕی گرت لەجیاتی ئاوی پیا بکات یەک تەنەکە نەوتی کرد بە باوکیدا بەو هۆکارە گیانی لەدەستدا.

دەستم کرد بە پێکەنین، لە ڕاستیدا خەتای نەبەز نەبوو ئێ باوکی پەرەمێزی دروست دەکرد، نەبەزیش نەیزانی نەوتە، وای زانی ئاوە چیبکات فەقیرە شڵەژا ئیتر بۆیە ئەوە ڕوویدا، ئەوە چی پەیوەندی هەیە بە شوومییەوە.

پێشڕەو: ئەی باشە لە شەڕە گەڕەکدا هەرچی ئەومان لەگەڵدا بوایە دەماندۆڕاند یان دەچووین بۆ فەریکە نۆک هێنان ئەومان لەگەڵدا بوایە

دەیانگرتین، ئەی ئەو کاتەی کە جەژن بوو لگاومان دەکرد هەر ئەو بهاتایە پارەمان پێ نەدەما یان ڕەسم ڕەسمێنەمان دەکرد بهاتایەتە لای هەرکەسێکمان دەیدۆڕاند، ئەی بۆچی ناومان نابوو نەبەزە شووم.

ئەوەندەی تر کەوتمە پێکەنین بە قسەکانی پێشڕەو، ویستم تەفسیری بۆ بکەم کە پەیوەندی نییە بە شوومی نەبەزەوە، بەمنداڵی نەبەز قەڵەو بوو نەیدەتوانی ڕابکات بۆیە لە شەڕە گەڕەک و فەریکەنۆک هێنان سەرکەوتوو نەدەبوین، بۆ قومارەکەش خۆ ئەوە خێر و چاکە نەبووە، ئیتر وایە یان دەدۆڕێیت یان دامانبردەوە.

پێشڕەو هەر قەناعەتی نەبوو، بە قسەیەک گرتمی وتی ئەی بیرتە جارێک لێتدا لەبەرئەوەی هەرچی ڕەسم بوو دۆڕاندت وتت هەتیو تۆ شوومی.

لەتاو پێکەنین و بیری سەردەمی منداڵی تووشی ژانە سەرێکی یەکجار عەجیب بووم کە نەمدەتوانی قسە بکەم.

پێشڕەو: خوا ڕەحم بکات ئەوە شوویمییەکەی تۆی گرت، زۆر بەجدی بوو.

لەڕاستیدا ئەوەندە ئازاری سەرم زۆر بوو حەزم ئەکرد لەلاشەمی بکەمەوە هەرگیز وا سەرم نەئێشابوو، بەڵام وتم لەوانەیە ماندوێتی ڕێگاو کەم خەوی و هۆکاری فڕۆکەکە بێت، چونکە گوێچکەشم لەگەڵی دەئێشا.

هەرچۆنێك بێت گەیشتینە ماڵەوەو دەستی دایکم ماچ کرد و دوو حەبی ئازارشکێنم خوارد و لێی خەوتم بە ئارامی کە هەستام سەرئێشەکەم باش بووبوو.

بۆ ڕۆژی دواتر دەرچوومە دەرەوە هەندێک ئیشوکاری گۆڤارەکەم هەبوو چاوم کەوت بە ستافەکە و کاک محمد سالار پاشا لەجیاتی من هەستا بە کارە فەرمییەکانی گۆڤارەکە و چاوەڕوانی مۆڵەت بووین لە

نووسینگەی ڕێگای کۆن ڕۆژانە لەوێ کۆدەبووینەوە و دۆست و ناسیا و خۆشەویستان دەهاتن بۆ سەردان.

لەکوردستان هەموو خەڵکی یەکی دوو ژمارە تەلەفۆنی هەبوو، منیش ژمارەی دایکمم بەکار دەهێنا یاخود ژمارەیەکی پێشڕەوی برام بەکار دەهێنا بۆ ئیشوکارەکانم بەوشێوازە منیش دوو ژمارە تەلەفۆنم پێبوو.

زۆرجار ژمارەیەکیانم لای دایکم بەجێ دەهێشت کامیان باڵانسی زۆری تیا بوایە لەگەڵ خۆم هەڵم دەگرت.

پێشڕەو: کاکە، نەبەز دوو جار پەیوەندی کردووە، تەلەفۆنێکی بۆ بکەوە.

تەلەفۆنم بۆ کردەوە دوای هەواڵ پرسی دەعوەتی کردم بۆماڵی خۆیان، منیش ڕازی بووم و بڕیارمدا سبەی کە نانڕواتە دەوام لە بازاڕ یەکتری ببینین و نانی نیوەڕۆ بەیەکەوە بخۆین، یەکترمان بینی و چووینەوە بۆ ماڵی ئەوان وامزانی ژنی هێناوە، بەڵام لەگەڵ دایکی و خوشکێکی دەژیا باوکی کۆچی دوایی کردبوو بەهۆکاریی تەنەکە نەوتەکە.

یادگاری زۆر خۆشمان باسکردن، دایکی نەبەز ناوی نەسرین خان بوو چوو گوڵەباخێکی بۆ هێنام و دایە دەستم زۆر لام سەیر بوو.

نەبەز: دایکە بۆچی ئەو گوڵەت هێنا بۆ ماکوان؟

دایکی وەڵامی نەدایەوە، کەچی نەبەز وتی مامە ماکوان ناشێت دایکم حەزی لێ کردبێت! دایکی تەمەنی ٥٨ ساڵ بوو منیش ٣٦ ساڵ بووم ئەوکاتە، بۆیە دەستم کرد بە پێکەنین و پرسیم..

ماکوان: ئەرێ نەسرین خان ئەو گوڵە چی بوو بۆت هێنام، حەز ئەکەم هۆکارەکەی بزانم.

من و نەبەز گوێمان لێبوو دایکی دەگریا و هەنسکی هەڵدەدا و زۆر بەکوڵ دەگریا، نەبەز چوو بۆلای منیش تەماشای گوڵەکەم دەکرد، هەستم



دەکرد کە ئەو گوڵە لە کەسێک دەچێت، بەڵام ماندووبوونی ژیان و گەورە بوونم لە بیری بردمەوە تا بزانم ئەو گوڵە لەکێ دەچێت.

نەبەز هاتەوە لێم پرسی دایکی بۆ دەگری؟

نەبەز: نازانم وەڵامم ناداتەوە، سەیرانی خوشکیشم قسەی لەگەڵ دەکات وەڵامی ئەویش ناداتەوە، نازانم بۆ وا دەکات لەدوای مردنی باوکم ئەوە یەکەم جارە ئاوا بەو شێوەیە بگری.

ماکوان: هەڵسە پێکەوە بڕۆین بزانین چی بووە، یادگاری کۆنی باوکتی بیرکەوتۆتەوە یان نەخۆشە، باشە بۆ دانیشتنەکەی لێ تێک داین؟

نەبەز: هەستە با بڕۆین، ئێ بە خوا منیش نازانم تووشی شۆک بووم.

چووینە لای دایکی و دەستی دایکیم ماچ کرد و سەریم ماچ کرد وتم چی ڕوویداوە، خوای گەورە لەکاک عەطای هاوسەرت خۆش بێت، هەمووومان هەر دەمرین.

نەسرین خان: کورە بێ ئەقڵ بۆ تۆ ئەگریم!

نەبەز دایە پڕمەی پێکەنین...

ماکوان: بۆ نەسرین خان من ساغ و سەلامەتم، چی بووە ناشێ منیش نەمردبێتم و بەخۆم نەزانیبێت.

هەمووومان دامانە قاقای پێکەنین...

نەسرین خان هەندێك قسەی کرد کە وەکو ناپاڵم و قومبەلەی ئەتۆم دای لە دڵی من، پێی وتم کاتێک گوڵەکەم بۆ هێنایت وامزانی تۆش دەگریت.

دەستی کرد بە گێڕانەوەی یادگارییەک و وتی بیرتە دەهاتیتە حەوشەکەمان و گوڵەکانت لێ دەکردەوە ئەچویت ئەتدا بە دالیا لە ڕێگای قوتابخانە، بیرتە گوڵت بە باخەکەمانەوە نەهێشتبوو؟





هاتم بۆلای باپیرت شکاتم لێکردیت ئەویش زلەیەکی لێدایت، تۆش لەداخا لەنەبەزت دا، منیش بانگم کردیت وتم باشە بۆ وادەکەیت؟

تۆش وتت ئاخر دوکانی گوڵ فرۆشتن نییە لەشاری سلێمانی تا گوڵ بۆ دالیا بکڕم، لە گیرفانتا ١٧ دیناری تیا بوو وتت شکاتم لێمەکە من لەمەولا گوڵەکانت لێ دەکڕم، عەطا ئەوکات پارەی لێ دەسەندی و تۆش دەهاتی گوڵت لێ دەکڕین، دوای کە دالیا کۆچی کرد ئیتر تۆ گوڵت لێ نەدەکڕین و دەهاتی زۆر لارە مل بوویت منیش بەزەیم پیاتا ئەهاتەوە، ئێستا ئەو گوڵەم بۆ هێنایت وتم بەدیاری بیبە بۆ سەر گۆڕەکەی دالیا!

بەچاوی پڕ فرمێسکەوە سەرم داخست و گوڵەکەش هەر بەدەستمەوە بوو، ئەو نیوەڕۆیە خواردنی لێ کردم بە زەهری مار، نەبەز هەر فریا دەکەوت دەسڕ بداتە دەستی منو دایکی و سەیرانی خوشکی.

دیسان سەرئێشەکەم بۆ هاتەوە و داوام لەنەبەز کرد کە بمباتەوە بۆ ماڵەوە، ئەوەندە ئازارم هەبوو توانای قسەکردن و پێکەنینم نەمابوو، لەسەر قەنەفەکەی ماڵی نەسرین خان پاڵکەوتم، ئاگام لێبوو نەبەز و سەیران لەدایکیان تووڕە بوون وتیان بۆ ئەم دانیشتنەت لێکرد بە زەهری مار.

نەسرین خان: جا ڕۆڵە من چیم کردووە و چیم وتووە، خۆ باسی شتی خراپم نەکردووە، هەر ویستم بیری بخەمەوە.

دوو حەبی ئازار شکێنم خوارد کەمێک باش بووم، لەگەڵ نەبەز چوومەوە بۆ ماڵەوە.

شوێنی دانیشتنی من تەنها نووسینگەکەی خۆم بوو لە بازاڕی ڕەشەمۆڵ، نهۆمی دووەم، نەبەز دەهات بۆ ئەوێ بۆلام، چەند جارێک ئەو سەرئێشەیەم توش بوو، هەرچەندە بە حەبی ئازارشکێن باش دەبووم.

ڕۆژێک لە نووسینگە هەمان ئازار دایەوە لێم، نەبەز ئاگای لێبوو لەگەڵ چەند هاوڕێ و ئازیزێکی تر کە لەوێ بوون.



نەبەز: کاکە وانابێت هەستە بڕۆین بۆلای دوکتۆر بزانین چییە؟

ماکوان: ئاساییە هەر سەرئێشەیەکی ئاساییە و چاک دەبم، ئیتر سەرئێشەکەی من بوو بەباسی ئەو ڕۆژە، هەریەکەو ناوی دوکتۆرێکی ئەبرد، تا کاک دلێر عەبدوڵلا وتی من پێم باشە بڕۆین پشکنین بکەیت، ئەگەر هیچ نەبوو ئەوا وازی لێ بهێنە خۆ ئەگەر شتێک بوو خوانەخواستە بۆ ئەوەی زوو چارەسەری بکەیت.

پێشنیارەکەیم بەدڵ بوو لەگەڵ نەبەز کەوتینە ڕێ بەرەو شەقامی ئۆردزی تا بچمە لای دوکتۆرێک و پشکنین بکەم، کە چووینە لای دوکتۆر بۆی نووسیم تا بچم لە تاقیگەیەک پشکنین بکەم، چووینە تاقیگەیەک ئەو کەسەی لەوێ بوو من و نەبەزی دەناسی، ناسراوێکی دوری ساڵی ٩٠کان بوو، تاقیگەکەش جێگایەکی باش بوو هەموو ی سەر و پشکنینی خوێنم کرد.MRI جیهازێکی پشکنینی پێشکەوتوی لێبوو،

پرسیارم لێکرد کەی بێمەوە بۆ نەتیجەکان، وتی لێرە دوکتۆرمان هەیە دەبێت دوکتۆر سەیری بکات، لەبەر ئەوەی ئەمڕۆ زۆر سەرمان قاڵە و نەخۆشی زۆری لێیە، پێ ڕاناگەین هەر ئەمڕۆ وەڵامەکانت بدەینەوە، بیخەیتە بەیانی باشترە، کە تەواو بوو خۆمان پەیوەندیت پێوە دەکەین بۆ وەرگرتنەوەی تەنیجەکان.

سوپاسم کرد و خواحافیزیمان کرد و هاتینە دەرەوە، لەگەڵ نەبەز چوین بۆ فالودە خواردن، ماوەیەکی زۆر لە بازاڕدا گەڕاین دوای ئەوە چوومەوە بۆ ماڵەوە، وا چوار ڕۆژە لە کوردستانم سەرئێشە و ماندووبون و بیری دالیاو قسەکانی نەسرین خان زۆر بێزاری کردبووم و ماندوو بووم.

تەلەفۆن کرا بۆ ڕەقەمەکەی دایکم لە تاقیگەوە، دایکم وەڵامی دایەوە، گوێم لێبوو پێیان وت بە کاک خەسرەو بڵێ با بێت بۆ وەرگرتنەوەی نەتیجەی فەحسەکانی.




دایکم: ڕۆڵە لەکوێ پشکنینت کردووە؟ تەواو بووە تەلەفۆنیان کردووە ئەڵێن بابێت وەریبگرێتەوە، چیتە خۆ شوکر سەلامەتیت؟

ماکوان: کورە هیچ نییە، کەمێک ماوندوو بووم سەرم دەیەشا جەماعەت زۆریان لێ کردم بچم پشکنین بکەم، هەر ئەوەیە.

دایکم: جا ڕۆڵە خۆ ئێمە هەموو بنەماڵەکە سەرئێشەی لەگەڵایە، دوو حەب بخۆ باش ئەبیت.

ماکوان: هەروایە، زۆر جار خەڵک کێچێکت لێ ئەکەن بە گایەک، حەزم نەکرد قسەی هاوڕێکانم بشکێنم بۆیە چووم.

هاتمە دەرەوە و چووم بەرەو تاقیگەکە بۆ ئەوەی نەتیجەی فەحسەکان وەربگرمەوە، کەچوومە تاقیگەکە خێرا ناسیاوەکەم کە جێگری پزیشک بوو هات بەدەممەوە، وتی کاک خەسرەو با بچینە ژورەکەی خۆم، منیش سوپاسم کرد.

ناوی سالار بوو، پێم وت کاک دکتۆر سالار خێر، هەر بۆ خۆشی وتم خۆ تووشی سەرەتان نەبووم؟!

سالار: بۆ پێشتر دەتزانی کەوا سەرەتانت هەیە؟

ماکوان: ئەوە تۆ دەڵێی چی، من بە گاڵتەوە وام وت، نەوەڵڵا سوپاس بۆ خوا عەیبم نییە.

سالار: بەداخەوە پشکنینەکانت واناڵێن، تەماشای نەتیجەی ئەشیعەکە بکە و هەروەها ڕێژەی هۆرمۆن لە خوێنەکەتدا وا نیشان دەدەن کەوا تووشی سەرەتانی دەماغ بوبیت، هەروەها لە قۆناغی گەشەسەندن دایەو پلەکەی ژمارە دووە، دەبێت بە زوترین کات نەشتەرگەری بکەیت و چارەسەری کیمایی بکرێیت خۆ وانەکەیت لەوانەیە تەنها چەند مانگێکی تر لە ژیاندا بیت.

ماکوان: دوکتۆر سالار بە جدیتە یاخود گاڵتەم لەگەڵ دەکەیت؟



سالار: نەوەڵڵا کاک خەسرەو جەنابت دەزانیت ئامێرەکانی ئێمە باشترین جۆری ئامێرن، ئەتوانیت بچیت بۆ جێگایەکی تریش پشکنین بکەیت، من ئامۆژگاریت دەکەم بچیت بۆلای دوکتۆر چالاک کوڕێکی زیرەکە لە وڵاتی بەریتانیا لە لەندەن خوێندویەتی و لێرە خزمەت دەکات، هەروەها دوکتۆرێکی عەرەب هەیە بەناوی (کامل جادرجي) ئەویش زۆر بەتوانایە و هاوکاری نەخۆشخانەی هیوایە بە خۆبەخش کار دەکات، ناونیشانی عەیادەی هەردوکیانی دامێ.

زۆر سوپاسم کرد، ئەژنۆم نەمابوو، هەموو ژیانم وەکو فیلمێکی سینەمایی هاتەوە بەرچاوم، دەستم دایە وەرەقەی پشکنینەکەم و ویستم فڕێی بەم، بەڵام لەبەر حورمەتی ئەو برادەرە ئەوکارەم نەکرد. زۆر توڕە بووم خۆشم نەمدەزانی لەکێ توڕەم، هاتمە دەرەوە لەسەر شۆستەی شەقامەکە لێی دانیشتم، تەماشای کارتی دوکتۆر چالاک و دوکتۆرە عەرەبەکەم دەکرد، لەپڕ کەسێک هات وتی کاک ماکوان بەیەکەوە ڕەسمێک بگرین؟ منیش سەرم بەرز کردەوە کوڕێکی گەنجی قۆز بوو، هەرچەندە لەخۆم بێزار بووم وتم بەخۆشحاڵییەوە، هەڵسامەوە وێنەکەم لەگەڵ گرت و کەوتمە ڕێ بەرەو نووسینگە، ئەوەندە بێزار و بێتاقەت بووم نەمدەزانی چی بکەم، هەر لە نووسینگەوە تەلەفۆنم کرد بۆ عەیادەی دوکتۆر چالاک و داوام کرد کە ئەتوانم ئەمڕۆ ببینم، چونکە باری تەندروستیم زۆر ناجێگیرەو پشکنینەکانم دەڵێت تووشی سەرەتانی دەماغ بووم و ماوەیەکی کەمم ماوە لەژیان!

کەوام وت سکرتێرەکە وتی ئەمڕۆ کاتژمێر شەشی ئێوارە وەرە، ئەوکاتەی تەلەفۆنم کرد کاتژمێر چوار بوو، نەتیجەی فەحسەکانم لەسەر مێزەکەم دانابوو، چەند ڕۆژنامەنووسێک هاتن منیش خستمە ناو چەکمەجەکە بۆ ئەوەی نەیبینن، بەبێزاری بەخێرهاتنم کردن، بە ناڕەحەتی و بێزارییەوە یەکێک لە ڕۆژنامەنووسەکان کە زۆر ماندووکەر بوو پرسیاری





ئەوەی لێ دەکردم، کە بۆچی گۆڤاری ڕێگام داخستووە و گۆڤارێکی تر بەناوێکی تر دەکەمەوە؟!

منیش وتم بۆ ئەوەی لە شوعییەت نەجاتم بێت! چونکە تەلەفزیۆنی شیوعی ناوی ڕێگا بوو بۆیە بۆ خۆشی ئەو قسەیەم کرد، کەچی ئەو برادەرە نەمزانی بوو دەنگەکەی تۆمار کردبووم و چوبوو لەیەکێک لە سایتەکان بەناوی لێدوانی ماکوان کەریم بڵاوی کردبوەوە دواتر تووشی کێشەیەکیشی کردم، تەلەفۆنم بۆ کرد بۆ ئەو کارەی کردووە و بەدرۆی دەخەمەوە، کەچی وتی وەڵا دەنگەکەت تۆمارە لای من ناتوانیت ئەو کارە بکەیت.

ڕۆژنامەنووسەکان ڕۆشتن و منیش بەرەو لای دوکتۆر چالاک بەڕێ کەوتم، بەڕاستی دوکتۆرێکی بەڕێز بوو، بەخێرهاتنی کردم. دیار بوو سکرتێرەکەی ئاگاداری باری دەروونی منی کردبوو کە چوومە لای و فەحسەکانم نیشان دا، وتی باشترین ڕێگا نەشتەرگەرییە.

ماکوان: هیوای چاک بوونم هەیە؟

د. چالاک: چەندین جۆر سەرەتانی دەماغ هەیە، چارەسەری دەگەڕێتەوە بۆ جۆر و شێواز و پلەی نەخۆشییەکە، دەتوانرێت بە نەشتەرگەریی گرێکان لابرێن، بەڵام چارەسەری تەواوەتی لە سەرەتانی مێشکدا ڕێژەکەی کەمە، بەڵام لەدوای لابردنی گرێکان دەتوانیت ئاسایی بژیت و بەردەوام عیلاج بەکاربهێنیت و بەردەوام لەژێر چاودێری پزیشکیدا بیت.

دەشێت بەهۆکاری نەشتەرگەرییەکەش بەشێک لەخانەکانی مێشک تووشی لەناوچوون بن، یاخود بەهۆکاری خانە سەرەتانییەکانەوە لەناو چووبن و هەندێك جووڵە و ئەندامەکانی جەستەت وەک جاران نەتوانن هەڵبسن بە ئیشەکانی خۆیان.

ماکوان: وەکو چی؟



د. چالاک: لەوانەیە تووشی شەلەل، یاخود توانای بینینت نەمێنێت یان زۆر لاواز بێت، یاخود توانای قسەکردنت سنوردار بێت و لە داهاتوودا لەدەستی بدەیت.

ماکوان: کەواتە مردن هەر مسۆگەرە لە هەموو حاڵەتەکاندا؟

د. چالاک: کەی بەم حاڵەتەت زانیووە؟

ماکوان: ئەمڕۆ چەند کاتژمێرێک پێش ئێستا زانیم، ئەگەر دەکرێت سەرلەنوێ با پشکنینی تر بکەمەوە، نەوەک ڕاست نەبێت.

د. چالاک: تۆ خۆت ئازادی، بەڵام ئەم تاقیگەیە یەکێکە لە باشترین تاقیگەکانی شاری سلێمانی، کۆتا بڕیاریش لای خۆتە.

ماکوان: دوکتۆر گیان من لە ئەوروپا دەژیم، ئایا نیسبەتی باشبوون و سەرکەوتن بەسەر ئەم نەخۆشییەدا زیاتر نییە؟

د. چالاک: بەدڵنیاییەوە لە ئەوروپا شێوازی چارەسەر و کوالێتی چارەسەرەکان باشترە، بەڵام زانست هەر زانستە، ئەوەی لێرە پێم وتیت لەئەوروپاش هەروات پێ دەڵێت.

ماکوان: ئەی ئامۆژگاریت چییە؟

د. چالاک: من وای دەبینم نەشتەرگەری بکەیت، تۆ گەنجیت و ژیانت زۆر لەبەردەمتایە، ئەگەر شوێنێکی تر لەدەست بدەیت باشترە لە مردن و کۆتایی، ئەوە بۆچوونی منەو خۆشت بڕیاردەری.

ماکوان: زۆرباشە دوکتۆر گیان، تکایە باری دەروونیم جێگیر نییە، ئێستا بڕیارم بۆ نادرێت کاتم بدەرێ با بیربکەمەوە و بزانم چیبکەم و چی نەکەم و حساباتی خۆم ڕێک بخەم، بەڵام تکایە با پەیوەندی تەلەفۆنیم لەگەڵ جەنابتان هەبێت.

د. چالاک: من هەندێک نەخۆشی ترم هەیە بۆ سوکبوونی باری دەروونیان کۆدەبنەوە و بە شێوازی گفتوگۆ لەگەڵ من وچەندین کەسی




تر کە نەخۆشی سەرەتانیان هەیە دەکەن، تا کەمێك باری دەروونیان لەسەر سوکتر بێت و ورەیان بەرزتر بێتەوە، کە پێی دەوترێت (چارەسەری قسەکردن) هەفتەی دوو جار کۆدەبینەوە و قسەدەکەین، کۆبونەوەکانیشمان لە باخەکەی خۆمە، جا ئەگەر پێت خۆش بوو تۆش بەشدار بەو وەرە بۆ ئەوێ.

کاک ماکوان من باوکم بە نەخۆشی سەرەتان مردووە، هەر بۆیە ئەم پیشەیەم هەڵبژاردووە تا هاوکاری خەڵکی تر بکەم کەوا ئەم نەخۆشییەی هەیە، لای من پارە و مادە گرنگ نییە، با کۆپی فەحسەکانت لای من بێت؟

هەستم کرد کەسێکی زۆر بەڕێزە، زۆر حورمەتم لێ گرت و ماڵئاوایم لێ کرد و هاتمە دەرەوە هەموو فەحسەکانم بۆ بەجێ هێشت نەمدەزانی بەرەو کوێ بڕۆم و بەکێ بڵێم، چی بکەم و لای کێ باسی بکەم، بەپێ سەرکەوتم لەباخی گشتییەوە بۆ کانی ئاسکان، گوێم لەبانگی عیشا بوو خۆم کرد بە مزگەوتی کانی ئاسکان دا، لەوێ نوێژەکەم کرد خوای گەورە سەبوری دا بەدڵ و دەروونم، بەڵام قوڕگم پڕ لەگریان بوو، زۆر پاڕامەوە بەدەم گریانەوە بۆ ئانای کچم دەگریام، تەمەنی سێ ساڵ بوو، خێزانم مژدەی دابومێ کەوا منداڵێکی تر بەڕێگاوەیە.

لەدوای پاڕانەوەکەم دایکم تەلەفۆنی کرد وتی: ڕۆڵە لەکوێیت میوانت هاتووە وەرەوە بۆ ماڵەوە کەسوکار هەموویان لێرەن.

وتم باشە لەمزگەوتم و لەگەڵ هەندێک هاوڕێم پاش کەمێکی تر دێمەوە، کە ئاوڕم دایەوە کۆمەڵێک گەنج لەگەڵ مامۆستایەکەدا وەستابوون تەماشای منیان دەکرد، کەسێکیان هات وتی کاک ماکوان، ماشاءالله لەو هەموو ئیمانە، چۆن وا دەگریایت؟ توخوا تۆزێک قسەمان بۆ بکە با ئێمەش ئیمانمان بەرز بێتەوە!

دڵیانم نەشکاند باسی ئەوەم کرد بۆیان کەوا بە فرمێسکی خەڵکی تێمەکەون، مەرج نییە پەیوەندی هەبێت بە ئیمانەوە لەوانەیە تووشی



کێشەیەکی گەورەی دنیایی بوبێت، زۆرجار لەتاو لاوازی ئیمان دەگری، کەچی مامۆستاکە فەرمووی ئاخر قوربان ئەوەش هەر بەهێزی ئیمانە.

لەوکاتەدا بەو وشەی جەنابی مامۆستا سەرلەنوێ من بیروباوەڕم داڕشتەوە و سوپاسوستایشی خوای موتەعالم کرد، ماڵئاوایم لەوان کردو گەڕامەوە بۆ ماڵەوە لەخزمەت میوانەکانمدا بووم، دایکم وتی ڕۆڵە بۆوا ڕەش هەڵگەڕاوی فەحسەکەت چی بوو؟

خوا ڕەحمی پێ کردم لەلای ئەو دوکتۆرە بەجێم هێشت، چونکە لەناو میوانەکاندا کوڕێکی دوکتۆری تیابوو وتیان بیهێنە باو ئەو سەیرێکی بکات بۆت، منیش وتم هیچی تیا نەبوو بۆیە هەرلەوێ فڕێم دا، تەنها وتیان ماندوویت پێویستت بە ئیسراحەت هەیە، پەیوەندی بەکەم خەوی و ماندووبونەوە هەیە.

دایکم: دەی ڕۆڵە ئیسراحەت بکە، کەم بنووسە و دابنیشە بەسەر کۆمپیوتەرەوە، هەموتان کوێر بوون بەهۆی تەلەفۆن و کۆمپیوتەرەوە.

میوانەکان ڕۆشتن ، لەکاتی سەردانییەکانم بۆ کوردستان و سلێمانی میوانم دەهات بۆ بەخێرهاتنەوە کردنم، منیش ئەو شەوەی کە هەواڵی مردن و ژیانم پێ درابوو، قورسترین شەو بوو لام، نەبیرم بۆ دەکرایەوە نە خەوم لێ دەکەوت، ئۆقرەم لێ بڕابوو، حەزم دەکرد قسە بۆ کەسێک بکەم و حاڵەتەکەمی بۆ باس بکەم، بۆ دایکمی باس ناکەم، دەمزانی ئەگەر پێی بڵێم پێش مردنی من دەمرێت، بۆ خێزانمی باس بکەم ئەگەر خۆی هیچی لێ نەیەت بەدڵنیاییەوە منداڵەکەی لەبار دەچێت، بۆ براکانمی باس بکەم دەمزانی لە دەمیاندا ناوەستێت و بڵاو دەبێتەوە، هەرنەمدەوێرا باسی بکەم لای خوشەکەکانم، ئەی خوای پەروەردگار فریام بکەوە و هێزوتوانام پێببەخشە.

ئەو شەوە تا نوێژی بەیانی خەوم لێنەکەوت، دوای نوێژ خەوم لێکەوت دنیایەک خەوی ناخۆشم بینی، دایکم و کەسوکارم هەستیان پێ کردبووم




کە شتێک هەیە، بەڵام دیار بوو هەریەکەو تەفسیرێکی تایبەتی خۆی هەبوو، بیریان نەدەچوو بۆلای نەخۆشییەکەی من، ئەو ڕۆژە لەگەڵ ئەوەشدا زۆر نەخەوتبووم سەرم زۆر نەدەئێشا و زۆر ئاسایی بووم، تەلەفۆنم کرد بۆ دوکتۆر چالاک وتم: دەمەوێت زیاتر قسەت لەگەڵ بکەم.

د. چالاک: سبەینێ وەرە بۆ باخەکەم لە زڕگوێز لەگەڵ نەخۆشەکانی تردا کۆبونەوەمان هەیە لەوێش تەعاروف لەگەڵ ئەواندا بکە، ئەم دانیشتنانە زۆر باشە بۆ ئارامبوونەوەی دەروون، لێرە یەکەم جارە من بەکاری دەهێنم لە کوردستان ئەم جۆرە ڕاهێنانە بوونی نییە.

زۆر سوپاسم کرد ئەوەندی تر ڕێزی زیاتر بوو لەلام، بڕیارم دا ئەو ڕۆژە بڕۆم بۆ سەر گۆڕی باوکم و لەوێ دەردەدڵێک بکەم و هەندێک سەبووریم بۆ بێت.

کاتژمێر ١١ی نیوەڕۆ بوو نەبەز تەلەفۆنی کرد، بەدەنگیا دیار بوو کە زۆر شڵەژابوو، پرسی لەکوێیت؟

ماکوان: لەماڵەوەم!

نەبەز: وەرە ئیشی زۆر زەروورم پێتە، بەیەکەوە بڕۆین بۆ کەبابخانەی تایەر پێنجوێنی لەوێ نان بخۆین و قسەی زۆرم پێیە بۆت باس بکەم، دوای دە خولەکی تر دێم بە شوێنتا لەسەر ٣٠ی مەتریەکە چاوەڕێم بکە، ئێمە لە هەواره بەرزە بووین ئەوانیش لە شەهیدانی ئازادی، هات لەناو سەیارەکەیدا دەموچاوی یابوو بەیەکدا و هەر هەناسەی هەڵدەکێشا، لەپڕ وتم ئەوە چییە؟ بۆ ئەڵێی تایەی سەیارەیت و پەنچەریت، قسە بکە چی ڕوویداوە؟

نەبەز دەستی کرد بەگریان!! پێم وت: لە دایکت و سەیرانی خوشکت ڕزگارم بوو نۆرەی تۆیە بۆ گریان، بڵێ بزانم چی بووە؟



نەبەز: دوێنێ لە شەقامی ئۆردزی بووم، چوومە لای سالار و باسی فەحسەکانی تۆی بۆ کردم، ئیتر لەدوێنێوە ئۆقرەم لێ بڕاوە، چی بەمن دەکرێت بۆت بکەم.

ماکوان: نەبەز گیان دایکت و سەیران نەزانن، تکا دەکەم با بێجگە خۆمو خۆت کەسی تر نەزانێت، ئەوە داوای سەرەتاو کۆتایی منە لەتۆ.

نەبەز: بێخەم بە باسی ناکەم و لای کەسیش نەمدرکاندووە، بەڵام کاکە تۆ کوڕە شەهیدی لە نەخۆشخانەی هیوا و شۆڕش تۆ هەموو شتێکت بە خۆڕاییە.

ماکوان: کاکە گیان من بڕیارم داوە چارەسەر ناکەم تا ئەو کاتەی دەمرم، چونکە چارەسەرەکەی مردنی زیاتر بەدوادا دێت، دوێنێ شەو زۆرم لەسەر خوێندەوە ئەم نەخۆشییە زۆر ترسناکە، چارەسەری زۆر ئاستەمە و قەدەری خوای گەورەیە، بەڵام لە دوو شت دودڵم، بڕیارم بۆ نادرێت کە ئایا لە سلێمانی بمرم یان لە نەرویج، ئێستا سەرقاڵی ئەوەم کە لەکوێ بمرم باشە؟

نەبەز: بۆ خاتری خوا بۆ وا لەسەر خۆت و منیشی قورس دەکەیت، خوای گەورە تەمەنت درێژ بکات، شیفا لای خوای گەورەیە.

ماکوان، بەدڵنیاییەوە وایە نەبەز گیان، خۆ ئەگەر بشمرم بۆ شوێنێکی دوور ناڕۆم، دەچمەوە بۆلای خوای گەورە، ئەگەر دەکرێت بەیانی دوای نوێژی جومعە بمبە بۆ زرگوێز لەگەڵ دوکتۆرەکەم قسە بکەم و پێی بڵێم بڕیاری ئەوەم داوە کە نەشتەرگەری ناکەم.

نەبەز: بۆ عەیادەکەی لە زرگوێزە؟ بەسەرچاو بەخۆشحاڵییەوە بەیانی هچ ئیشم نییە و لەگەڵتا دێم.

ماکوان: ئاخر نازانم ئایا ڕازی دەبن کە تۆ لەگەڵم بمێنێتەوە، ئەو جێگایە وەکو عەیادە وایە، بەڵام باخێکە وەکو ئەوەی بۆی باسکردووم بەشێکە لە چارەسەری نەخۆشی سەرەتان، پێ دەچێت نەخۆشی تری لێ بێت، کێ دەڵێت ئەو ڕازی دەبێت کە تۆ بێیتە ژورەوە، با بچین بزانین چۆن دەبێت.




نەبەز: ماکوان بیکە بەخاتری خوا خۆت نەکوژیت؟ وەکو جاران شێت بیتەوەو گوێ بەهیچ نەدەیت، چارەسەر لای خوای گەورەیە.

ماکوان: ئێ کوڕی باش من خۆم دەمرم ئیتر چۆن خۆم بکوژم، من و تۆ هەردوکمان بێ تاقەتی مردنی منین، خۆم لەسەر لێواری مەرگم ئیتر چۆن خۆم بێدین دەکەم و خۆم دەکوژم، ئەوە کەی قسەیە برا، چۆن کاری وا دەکەم، ئەزانی چەندە تاوانێکی گەورەیە؟

نەبەز: دەباشە، دەمانچەکەتم بەرێ

ماکوان: فەرموو، خستمە ناو داشبۆردی سەیارەکەی.

دەیزانی لەکوردستان دەمانچەم پێیە لەبەر پاراستنی کەرامەتی خۆم دەڵێم نەوەک خوێڕییەکی مولحید یان سوکێک قسەی بەرزو نزم بکات و سێ چوار کەس بێنن و بەدەست دەرەقەتیان نەیەم، خۆت باش دەزانی من بڕوام بە چەک و تەقەمەنی نییە، بەڵام وا ئێستا هەر پێویستم پێی نەما.

نەبەز: باشە بە پشتیوانی خوا هەموو شتێک باش دەبێت، بەڕاستی منیش بیرم بۆ ناکرێتەوە، ئەوەی بە من بکرێت لەخزمەتام.

ماکوان: بەخوای گەورە ئەوەی ترس بێت لەمەرگ نیمە، خۆت باش دەزانیت نەبەز گیان من لەسەر قازانج و سوود ماوم، دەبوو لە ڕاپەڕینەکە بکوژرامایە، کوا گوێم بە مردن داوە لە ژیانمدا، بەڵام ئێستا جێگای مردنم بۆ هەڵنابژێردرێت نازانم لەکوێ بمرم باشە.

نەبەز: خۆزگە هەردوور بومایە و نەهاتمایە بۆ لات لە فڕۆکەخانە.

ماکوان: دەی برا وازم لێبێنە بڕۆ، خۆ بەزۆر بانگم نەکردوویت (بەپێکەنینەوە).

زانیم مەبەستی خراپ نییە، ئەیەوێت پێم بڵێت کە زۆر خەمبار و ناڕەحەتە بۆ من.



نەبەز: بەخوا مامە ماکوان مەبەستم ئەوە نەبوو، لەتاو تۆ کە تووشی ئەم ناڕەحەتییە بویت وام وت، بەخوا دڵی خۆمت پێشکەش دەکەم، بۆ زانیاریت بەپارەی گوڵ کڕینی تۆ دایکم من و سەیرانی گەورە کردووە، هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە، شەماڵی مچەسور لەمنی یا لەگەڵ براکەیا تۆ و پێشڕەوی برات چوون منتان برد لە شەماڵ و شۆڕشی برایتان دایەوە لەسەر من، برا یادگاری و چاکەی تۆ لەبیر ناکەم، ڕاستە برام نەبوو بەڵام تۆ برام بویت، هەرچەندە زۆریشت لێداوم بەڵام هەر خۆشەویستیت، کاتی خۆشی تۆ ناوت ناوم (نەبەزە شووم).

هەردووکمان دەستمان کرد بە پێکەنین و بەرەو گردی سەیوان کەتمە ڕێ بەرەو لای باوکم، لەسەر گۆڕی باوکم دەستم کرد بە قورئان خوێندن و دوای نزاو پاڕانەوە بۆ لێخۆشبوونی باوکم، دەستم کرد بە قسە کردن لەسەر گۆڕەکەی و وتم بابە بەم نزیکانە دێمە لات، زۆر دەمێکە بیرت دەکەم، خەسرەوی کوڕت تووشی سەرەتانی مێشک بووە، پێناچێت بتوانم گەنجێتیم تەواو بکەم.

لەم قسانەدا بووم لەگەڵ خۆمدا لەسەر گۆڕەکەی باوکم، دایکم تەلەفۆنی کرد وتی: میوانت هاتوە لەهەولێرەوە، دەیانەوێت ئەمڕۆش بگەڕێنەوە، خێرا وەرەوە بۆماڵەوە.

ماکوان: بەخوا پێم دەچێت لەسەرقەبرانم پێیان بڵێ تا دێمەوە سەرجادە و تەکسی دەگرم تۆزێکی پێ دەچێت.

دایکم: بۆچی لەسەر قەبرانی کێ مردووە؟

ماکوان: باوکم مردووە، لەسەر گۆڕی هاوسەرەکەی تۆم!

دایکم: دەی ڕۆڵە با بەمنیشت بوتایە بهاتمایە لەگەڵت.

ماکوان: بۆجارێکی کە.






لەدڵی خۆمدا وتم وابڕوات تۆ زۆر دێیت بۆ ئەم گردی سەیوانە، تەلەفۆنەکەم نەخستەوە گیرفانم لەسەر کێلەکە دامنا، چونکە زۆر دانیشتبووم قاچم سڕ بوبو، هەڵسام بڕۆم وردە وردە کەوتمە ڕێ، نزیکی ١٠ خولەک بەپێ ڕۆشتم تەکسیم دەست نەکەوت، وتم با تەلەفۆن بۆ نەبەز بکەم یان پێشڕەو بێن بە شوێنما، کە دەستم کرد بە گیرفانما مۆبایلەکەم بیر چوبوو لەسەر قەبران.

ناچار گەڕامەوە، دڵنیا بووم کەس نایبات مەگەر جەڕەسی زۆرم بۆ بێت و خەڵک گوێی لێ بێت بیبینن بیبەن.

سەرکەوتمەوە بۆ گردی سەیوان و لای فولکەی گۆزەکان بوو زۆر دوورکەوتمەوە، بەڵام چارەنەبوو بەپەلە گەڕامەوە بۆ ئەوەی تەلەفۆنەکەم بهێنم، خەمی ژمارەکانی ناویم بوو لەدەستم بچێت، زوو زویش بەخۆمم وت تۆ دەمری ئیتر ژمارەت بۆ چییە، گەیشتمەوە سەر گۆڕی باوکم تەماشا دەکەم کچێکی گەنجی زۆر جوان بەسەرپۆشێکی ڕەشەوە لەسەر قەبری باوکم دانیشتووە و دەگری!

سڵاوم کرد لە کچەکەو لێم پرسی بێزەحمەت ئەم مردووە چی بەرێزتانە؟

کچەکە بەلوت بەرزییەوە: جاتۆ پەیوەندیت چییە بەسەر ئەوەوە کێیەو چی منە؟

ماکوان: ئاخر کچی باش ئەوە باوکی منە و تەماشای مۆبایلەکەم بکە تۆزێک پێش ئێستا لێرە بووم لەبیرم چوو، مۆبایلەکەشم لە جێگای خۆیدا بوو، بۆیە ئەپرسم کە چی جەنابتە؟

کچەکە: وەڵڵا ئەوە باوکی منە، باوکی تۆی چی؟

ماکوان: فەرموو من ناوم خەسرەو عبدالکریم محمد سعیدە.

کچەکە: فەرموو منیش ناوم گەنم عبدالکریم محمد سعیدە.





تەماشام کرد ڕاستە وایە، وتم: باشە کاتێک من باوکم شەهید بوو ناشتیان تۆ لەکوێ بویت؟

گەنم: ئەوکات من دوو ساڵ بووم

ماکوان: بۆ خاتری خوا خۆم دەردم کەم نییە، تۆش شێتم مەکە، خوشکی خۆم ئەمە باوکی منە، لەوانەیە تۆ لێت تێکچووبێت، خۆ کامێرەی شاراوە نییە؟

گەنم: نا من بەدرێژی ژیانم بەدوای ئێوەدا گەڕاوم، تۆ برامی و منیش خوشکتم.

ماکوان: هەروا بەو ئاسانییە، من و تۆ خوشک وبراین؟ دایکم لەوکاتەدا تەلەفۆنی کردەوە و وتی ڕۆڵە ئەو میوانانە چاوەڕێن دە زووکە وەرەوە.

بەسەرچاو بە پێشڕەو بڵێ با بێت بە شوێنمدا، نەوەک تەکسیم دەست نەکەوێت و زیاتر دوابکەوم.

دایکم: کورە ڕۆڵە چی زۆرە تەکسی، دە زوو وەرەوە بۆ ئەوەندە ئیهمالی.

گەنم: ئەوە دایکت بوو؟ ناوی چییە؟ من سەیارەم پێیە ئەتبەمەوە.

ماکوان: بۆ لەکۆڵم ئەبیتەوە! دایکم ناوی ئامینەیە، جاخۆ بزانێت تۆ کچی باوکمی قژ بەسەر دایکتەوە ناهێڵێت، ئیتر نازانم چارەنوسسی تۆ چی دەبێت؟ خوا بکات باوکیشم لەگۆڕەکە دەرنەهێنێت.

گەنم خوشکی خۆم هەروا ئاسان نییە تۆ بێیت و بڵێیت من کچی عبدالکریمی حەمەی سەعیدم؟ تەلەفۆنەکەی خۆم دایە وتم ژمارەکەتم بۆ بنووسە بالام بێت، بەڵام جارێ من و تۆ هەموو پێنج دەقەیە یەکتریمان ناسیوە، بۆ ئەوەی بمگەیەنیت زۆر سوپاست دەکەم میوانی زۆرم هاتووە لەشاری هەولێرەوە زوو بمگەیەنە ماڵەوە.

گەنم: بەسەرچاو، بابڕۆین.






کە ڕۆشتین سەیارەیەکی لاندگرۆزەری مۆدێل بەرزی پێ بوو، دوو پیاوی تێدا بوو، وتی ئەوەیان باوکمە و ئەوی تریشیان پاسەوانیەتی.

ماکوان: بۆ گەنم گیان ئەی ئەو پیاوەی کەلەناو گۆڕەکەدایە چیتە؟ یان ئەمە باوکی زیایەیە کە تۆ هەتە؟

گەنم: ببورە، باوکی من نییە بەڵام ئەو منی گەورە کردووە و هاوسەری دایکمە.

ماکوان: پەلە مەکە، ئێستا کە سەرکەوتم و پرسیان ئەم کوڕە کێیە تۆ چی دەڵێیت؟

گەنم: دەڵێم برامە. ئەگەر ڕازیش نیت ئەوا دەڵێم هاوڕێمە لەزانکۆ، یان دەڵێم مامۆستامە لە زانکۆ، ماشاءالله لەمامۆستای زانکۆ دەچیت.

ماکوان: زۆرباشە؛ مامۆستای زانکۆکە ڕێگای تێئەچێت، بابڕۆین.

کە نزیک بوومەوە لەسەیارەکە پاسەوانەکە دابەزی و باوکی گەنم دابەزی زۆر بەڕێزەوە وتی من ناوم (جمال فەرەج)ە، منیش خۆم ناساند و وتم ماکوان کەریم، کەوام وت گەنم تەماشای کردم، چونکە بە خەسرەو تەماشای پێناسەکەمی کردبوو، کە وتم ماکوان کەریمم یەکسەر کاک جەمال وتی: ماکوان کەریمی ڕۆژنامەنووس و خاوەن ئیمتیازە گۆڤاری ڕێگا؟

ماکوان: بەڵێ خۆیەتی.

جەمال: کاکە بۆ وامان پێ دەکەن، ئێوەی ڕۆژنامەنووس، پەڕوباڵتان کردووین، هەندێک لەباسەکانتان ڕاستەو هەندێکی زۆری موبالەغەیە.

ڕێگای بەهەڵە گرت من پێم وتن: دەڕۆم بۆ سەر ٣٠ی مەتریەکە و ماڵمان لەوێیە، بۆ ئەوەی هەر ناحەقییەک دەرحەقت کراوە کاک جەمال خۆم و گۆڤارەکەش لەخزمەتاین دەتوانین لەکەناڵی منەوە وەڵام بدەیتەوە، خۆ ئەگەر ناڕاستی هەیە تۆ ئاشکرای دەکەیت من پۆزشت بۆ دەهێنمەوە،



بەڵام من سوپاسی گەنم خان دەکەم کە ئەمڕۆ هاوکاری کردم لەگەڵ جەنابتان منتان گەیاند، بەڵام من مامۆستام لە زانکۆ هەرکارێکی تر هەبوو من لە خزمەتاندام، گەنم هەر نەیوت ئەم کەسە کێیە، وتم نەوەک تووشی کێشە بێت بەتەواوەتی هەستی برایەتیم بۆی جوڵا و نەمدەزانی بیر لەخۆم بکەمەوە یان گەنم.

لەبەردەمماڵی حاجی ڕەوف دابەزیم وتم ئەوە ماڵی ئێمەیە، چەند ماڵێکمان لەنێواندا بوو، وتم نەوەک فرت و فێڵێک بێت، ماڵئاوایم لێکردن ئەوان ڕۆیشتن، تەقەم لەدەرگای ماڵی حاجی ڕەوف دا، وتم ئەگەر کردیشیانەوە ئەوا هەواڵی حاجی ڕەوف دەپرسم و دەڵێم خەوم پێتەوە بینیوە، باش بوو دەرگایان نەکردەوە و لەماڵەوە نەبوون، چوومەوە ماڵەوە بۆلای میوانەکانم و زۆر داوای لێبووردنم لێکردن و لەخزمەتیاندا دانیشتم.

نەمدەزانی بیر لەگەمی خوشکم بکەمەوە یان لە مەرگ و مردنی خۆم.

شەو لەگەڵ دایکم دانیشتم وتم دایە تۆ بڵێی باوکم خوا عافوی بکات ژنی تری نەبووبێت و ئێمە نەمانزانیبێت؟

دایکم: جاخۆ ڕۆڵە پیاو هەموو شتێکی لەدەست دێت، بەس من بڕوا ناکەم، چونکە باوکت زۆر منی خۆشئەویست.

ماکوان: ئەی ئەگەر گریمان باوکم ژنێکی تری هەبوو، منداڵیشی لێی هەبوو، ئەگەر دۆزیماننەوە و زانیمان هەڵوێستی تۆ چی دەبێت؟

دایکم دەموچاوی یا بەیەکدا و وتی وەڵلا بەگاز دەیپچڕم، ناشێ شتی وای نەکردبێت باوکت؟

ماکوان: بۆ خاتری خوا، من دەمەوێت قسەی خۆشت لەگەڵ بکەم، ژنی چی باوکی فەقیرم ساڵی ۹۲ شەهید کراوە.

دایکم: وا قسە ئەکەیت خەڵك دەخەیتە گومان، نەوەڵلا ڕۆڵە من خۆم باش دەزانم باوکت هەرگیز کاری وای نەکردووە، چونکە منی خۆش






دەویست و منیش زۆر ئیحتیرامم دەگرت و چەندین ساڵ لە پێشمەرگایەتی بەو شاخەوە لەگەڵیدا بووم، هەرگیز قسەیەکی ناخۆشم نەکرد لەگەڵیدا لەو بارەیەوە.

هەمیشە ماڵو میوانم بۆ بەڕێ کردووە، ئەویش خوا هەڵناگرێت پیاوێکی چاوباشقاڵ نەبوو.

ماکوان: بەدڵنیاییەوە وایە.

لەدڵی خۆمدا وتم ئەگەر دەزانیت، بەخوا منیش دەردەکاتە دەرەوە، عەرزی دایکمم کرد بەڕاستی جەنابیشت بەوەفا بویت دوای باوکم بە سەرمانەوە دانیشتیت و شوت نەکردەوە لەکاتێکدا مافی خۆت بوو ئەوکارە ئەنجام بدەیت.

کەوام وت دایکم توڕە بوو وتی: ئەرێ ڕۆڵە عەیب ناکەیت چۆن قسەی وا ئەکەیت، شوی چی چۆن دوای باوکت بیر لە شتی وا ئەکەمەوە، هەر بیریشم لێ نەکردۆتەوە، ئەم قسە نامەعقولانە چییە ئەیکەیت، تۆ چۆن وا بەمن دەڵێیت، شەرم بکە لەخۆت.

بیرم کەوتەوە کە دایکم زۆر عەشایەرە و بیروباوەڕی عەشایەری لە مۆخیدایە، وتم دایە گیان ئەوە شەرعی خوایە من دەزانم بیرت لێ نەکردۆتەوە، گەورەیت دەگەیەنم، بەڵام خۆ ئەگەر شتی واش ڕووی بدایە نە حەرام بوو نە عەیبە.

دایکم: من ناڵێم حەرام بوو، بەڵام بەڕاستی بۆ من عەیبە بوو، توخوا هەر قسەمەکە باشە.

ماکوان: زۆر ببورە خەجاڵەتم کە توڕەم کردیت، دەستم بەرێ ماچی بکەم، جارێکی تر دووبارەی ناکەمەوە، بەڵام پرسیارێک ئەی ئەگەر من ژنی دووەم بهێنم چی دەبێت، ئاساییە؟

دایکم: نەوەڵڵا حەدت نییە ژن بهێنیت، ئەی ژنی خۆت چییەتی؟



ماکوان: هیچی نییه، بەڵام حەز دەکەم دوو ژن و سێ ژنم هەبێت.

دایکم: بۆ تۆ مەسئولی؟

دەستم کرد بە پێکەنین و داوای ئیجازەم کرد بڕۆم تۆزێ قورئان بخوێنم شەوی هەینییە.

لە خزمەتی دایکم هەندێک قسەی خۆشمان کرد، پاشان چوومە ژورێکی تر سورەتی الکهف-م دەخوێند، تەلەفۆنەکەم لە خوارەوە بەجێهێشتبوو سەرقاڵی خوێندنەوەی قورئان و پەرتوکی تر بووم، لەپڕ دایکم هاواری لێ کردم وتی وەرە نەبەزی نەسرین خانە دەیەوێت قسەت لەگەڵا بکات، وەرە خوارەوە من پشتم دێشێت ناتوانم تەلەفۆنەکەت بۆ بێنمە سەرەوە.

لەدڵی خۆمدا وتم ئەبێ نەبەز پەشیمان بوبێتەوە و بەیانی نەمبات بۆ ڕزگوێز، بە یەکێک لەبراکانم دەڵێم بمبەن.

چوومە خوارەوە لەگەڵ نەبەز قسەم کرد وتم خێرە، وتی زۆر زەرورە ئەم شەو قسەت لەگەڵ بکەم، پێموت ئەی مەگەر بەیانی ناچین بۆ ڕزگوێز بەیەکەوە لە ڕێگا قسە دەکەین.

نەبەز: زۆر زەرورە دێم بە شوێنتا و پیاسەیەک دەکەین.

ماکوان: بەخوا مامە نەبەز هیچ شتێک لای من زەروور نەماوە، من مەرگی خۆم لا گرنگ نییە داخۆ ئەم شتە زەرورەی تۆ چی بێت.

نەبەز واهاتم و خۆت بگۆڕە بۆ ئەوەی لە دەرەوە قسە بکەین!

خۆم گۆڕی و چاوەڕێی نەبەزم کرد هات و ڕۆیشتین بۆ دۆندرمەخانەیەک لەکارێزە وشک لەوێ دانیشتین، پرسیم خێرە چی بووە؟

نەبەز: ساڵی ١٩٩٧ لە کۆتایی هاویندا بیرتە چووین بۆ زێوێ؟



ماکوان: بەڵێ؛ بیرمە کۆتا سەیرانمان بوو لەگەڵ کوڕی گەڕەک ڕۆشتین لە ڕێگا سەیارەکەی سەردار صالۆنصاکەی تەقی و پێمان ڕابوارد، زۆرباشم بیرە ئێ چییە؟

چەند شەوو ڕۆژمان پێ چوو؟

ماکوان: بیرم نییە ٣ شەو ڕۆژ بوو یان ٤ شەوو ڕۆژ، بۆ؟

نەبەز: لەوێ کچێکت ناسی ناوی تاڤانە ڕەش بوو، بیرتە؟

ماکوان: بیرمە، دەی جا چی بووە؟

نەبەز: ئەی کوڕێکی تر هەبوو لە نزیک هەواری تازە ڕقت لێی بوو بەس بیرتە ئەتوت ئەم هەتیوە وەکو جگەرە وایە، خۆشە و بەڵام زۆر خراپە، ئەزانی کێ دەڵێم؟

ماکوان: دەزانم سەروەرە خێل، ئێستاش ڕقم لێیەتی، دەی ئەم عەتیقەیە چییە، ئەمانە چین و چ پەیوەنیان هەیە بە من و تۆوە؟

نەبەز: دوینێ کە تۆم برد بۆسەر قەبران، سەروەر تەلەفۆنی بۆ کردم، وتی نەبەز تۆم لەگەڵ خەسرەوی شەهید عبدالکریم بینیوە وابووە؟ منیش وتم خۆی بوو لە ئەوروپاوە هاتۆتەوە، پاشان بانگی کردم بۆ دوکانەکەی خۆی هەر لەهەواری تازەیە، شتێکی بۆ باس کردن بڕوام پێ نەکرد، تاکو لەتۆ دڵنیا نەبم قسەکەی بەڕاست وەرناگرم.

ماکوان: خۆ نەیوتووە پارەم لای خەسرەوە؟ درۆ ئەکات خوێڕی وا خۆت دەزانی ئامادە بوو بۆ پارە خوشک و دایکی خۆی بفرۆشێت هەر لەبەر ئەوەش بوو کە ڕقم لێی بوو، وایە؟

نەبەز: ئەزانم کەوایە و ئێستا زۆر لەجاران خراپترە، منیش باسەکەم ئەوەیە ئەو حەدی نییە بڵێت پارەم لایەتی، بەڵام دەڵێت خەسرەو کوڕێکی هەیە لە تاڤان، بەناوی شێرکۆ تەمەنی کوڕەکەی ماکوان ١٣ بۆ ١٤ساڵە! شتی وا ڕوویداوە؟



ماکوان: سەگ بابی وا درۆ ئەکات من لە سەیرانگای زێوێ هیچ کارێکی وام لەگەڵ تاڤان نەکردووە درۆ ئەکات، شتی وا ڕووینەداوە، ڕاستە لەگەڵ تاڤان قسەم کرد بەڵام هیچ کات دەست تێکەڵ بونم لەگەڵ ئەو ئافرەتە نەبووە، ئەو کاتیش تەنها بۆ کات بەسەر بردن بوو قسەم لەگەڵ ئەکرد، خوای گەورە لێم خۆش بێت، هەرزەکار بووین خۆت باش دەزانیت، شکستێکی خۆشەویستی ترم خواردبوو لە شاری مەریوان لەگەڵ ئەو کچەی ناوی ئێران بوو، بەڵام هیچ شتێکی لەو بابەتانە لەنێوانی منو تاڤان ڕووی نەداوە.

باشە وەرە پێم بڵێ ئەو حەقی تاڤانی عەزە بێ سمێڵی چییە؟

نەبەز: ئاخر ئێستا ژنی سەروەرە.

ماکوان: مەنجەڵ بەسەر سەرقاپی خۆیدا دەگەڕێت، هەتیو نەبەز زۆر پەستم لە تۆ، بەڕاستی تۆ شومی، هێشتا هەفتەیەک نییە لە ئەوروپا هاتومەتەوە هەر تۆم بینی ئەم هەموو کارەساتە چییە بۆ من ڕوونەدات.

زۆر بە ناشرینی قسەکەم کرد، بەڵام نەبەز زۆر پیاو بوو وتی کوڕی باش من هاوکاریت دەکەم، ئەو خوێڕییە دەیەوێت لە پاڵتۆک و سایتەکان ئەو هەواڵە بڵاوبکاتەوە و کەرامەتی تۆی پێ بشکێنێت، بڕۆ من ئەتبەمەوە بۆ ماڵەوە و ئیتر حەقی هیچم نییە، برا من پیاوەتیم کرد، ئەمەش چاکەو پیاوەتی تۆ بوو بۆ من.

ماکوان: زۆر ببورە حەق لای تۆیە و گەردنم ئازاد بکە، برا بەخوا دوێنێ کە لەسەر قەبری باوکم بووم تووشی شۆک بووم هەروەکو ئێستا چۆن تۆ تووشی شۆکت کردم، کچێک لەسەر گۆڕی باوکم دەگریا چوم وتم تۆ کێیت؟ کەچی وتی ئەوە گۆڕی باوکمە! لە ئێستادا خوشکێکی ترم هەیە، جا ئەوکاتەی کەوای وت دایکم تەلەفۆنی کرد وتی میوانت هەیە وەرەوە، باوە پیاوەکەی منی هێنایەوە بۆ ماڵەوە، لە خوشکەکەم نەپرسی دایکی ناوی چییە و براو خوشکی ترم هەیە، لەتاو دەردی خۆم ئەو کێشەو




خەمەی تریشی هاتە سەر. دەی برا لە قوسورم عەفو بە، توخوا گەردنم ئازاد بکە، من ئەگەر بوومەتە مایەی شوومی بۆ تۆ وازم لێ بهێنە، بەخوا ئێستا تۆ لەهەرچی کەسمە نزیک تری نەبەز گیان، هەرچەندە سێ ساڵ لەتۆ گەورەترم، ببەخشە بەو سێ ساڵە قسە ناخۆشەکانم.

نەبەز: برا گەردنت ئازاد بێت، چۆن لەم کاتەدا واز لەتۆ دەهێنم و جێت دەهێڵم، تۆ بڵێی ئەوەندە نامەرد بم هەر گوێی مەیەرێ.

ماکوان: هەڵسە بابڕۆین بۆلای ئەو سەگە، بزانم ئەم بێجاییانە چییە کردویەتی.

نەبەز: تکات لێدەکەم دان بەخۆتدا بگرە، لەوێ تورە مەبە بزانم چی بووە نەوەکو ساختەچی بێت، ئەزانم تۆ تیا نەوەستاوەی وەعدم بدەرێ کە تورە نەبیت و بە هێمنی و هێواشی قسەی لەگەڵ بکەیت.

ماکوان: هەوڵی جدی خۆم ئەیەم کە تورە نەبم.

چووین بۆ دوکانەکەی، خەریکی کاری بۆری و بەلوعە بوو، کە چووین خێرا هات بە دەممانەوە و لەدەرەوەی دوکانەکەی دانیشتین و نەبەز دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵیدا وتی:

مامە سەروەر خەسرەو دەڵێت: هیچ ڕووینەداوە لەنێوانی من و تاڤان دا و ئەو قسەیە ڕاست نییە، جا تۆ لەکوێوە ئەو قسەیەت هێناوەو بەڵگەت چییە بۆ ئەو قسەیەت؟

سەروەر: هەمووومان مامە خەسرەو باش دەناسین، منیش هەروا لەخۆمەوە ئەو قسەیە ناکەم، ئەزانم کە خەسرەوە سور تورە بوو چی دەکات، دەتوانین پشکنینی DNA

بکەین، پاشان ڕووداوەکەم لەدەمی تاڤانی خێزانم گوێ بیست بن، جا نازانم کاک خەسرەوە سور چی دەڵێت و هەڵبەت بۆ سوکایەتی دەیوت (خەسرەوە سور) ڕاستە وام پێ دەوترا، بەڵام خوێڕی وا جورئەتی نەبوو





بەخۆم بڵێت خەسرەوە سور، مەگەر هاوڕێ خۆشەویستەکانم بەو ناوەوە بانگیان بکردمایە، هەربۆیە کە دەستم کرد بە قسە کردن منیش بۆ شکاندنی وەڵامم دایەوە و وتم:

سەروەری بەلوعە من نازانم تۆ خاوەنی چ ئابڕو حەیایەکی چۆن ژنەکەت دەهێنی باسی ئەوە بکات کە من و ئەو بەیەکەوە چۆن خەوتووین.

نەبەز: مامە دان بە خۆتا بگرە ئێمە بۆ شەڕ نەهاتووین بۆ قسەکردن هاتووین.

سەروەر: دەستی کرد بە پێکەنین و وتی مامە خەسرەو لێشم بدات ئاوڕی لێ نادەمەوە، لەجیاتی ئەوەی سوپاسم بکات کە شەرەفی کچێکم بۆ داپۆشیوە و کوڕەکەیشیم بەخێو کردووە ١٦ ساڵە، کەچی سوکایەتیشم پێ دەکات.

ماکوان: بە توڕەییەوە؛ درۆ دەکەیت من کاری وام نەکردووە.

تەزبیحێکم بەدەستەوە بوو خۆم بۆ نەگیرا تەزبیحێکم تێ سرەواند، نەبەز گرتمی ئەگینا دەکەوتمە سەروگوێلاکی.

سەروەر: مامە نەبەز خەسرەو نایەوێت تێبگات، لە دادگا یان عەشایەری یان هەرچی پێ خۆشە من دەمەوێت کێشەکەی بۆ چارەسەر بکەم و چارەنووسی ئەو کوڕەی هەروا نادیار نەبێت، ئاخر خۆ کوڕی خۆیەتی، هەڵەیەکەو کراوە فەرموو ئێستا چی بکەین؟

هەر زۆر بەجدی قسەی ئەکرد!

نەبەز: تۆ چیت دەوێت؟

سەروەر: مافی ئەوەم بۆ بگەڕێنێتەوە کە کوڕەکەیم بەخێو کردووە.

ماکوان؛ خوێڕی من مانگاو بزنم یاویتێ بۆم بەخێو بکەیت؟ ئەی چەند ساڵە بۆ ئەم گووەتان نەخواردووە؟







سەروەر: جا بۆ کەس دەیزانی تۆ لەکوێیت؟ ئەگەر من نەبوومایە ئێستا عەزە بێ سمێڵ تاڤان و شێرکۆی کوشتبوو.

ماکوان: تۆش و عەزە بێ سمێڵیش سەرتان دای لەبەرد، ئێوە پیاوی ئەوە نین چۆلەکەش بکوژن، هەڵسە نەبەز با بڕۆین چی لەدەست دێت با درێغی نەکات، ئەوەی دادگا و عەشایەری و کام کێوە بەرزە بڕۆ بیگرە.

## سەرەتایەکی پڕ لەئازار و بن بەست

لە دوای کاتژمێر ١١:٣٠ هەڵساین و نەبەز منی گەیاندەوەماڵەوە، کە دابەزیم دایکم تەلەفۆنەکەی بەرەو ڕوو هێنام وتی ڕۆڵە تەلەفۆنەکەی ترت بیر چووە، گەنم ناوێك زۆر زەنگی بۆ لێدایت وابزانم نامەشی بۆ ناردویت، کاکە ئەم گەنم ڕەنگە کێیە؟

ماکوان: ئەوە کچێکی ڕۆژنامەنووسە دەیەوێت بێتە ناو ستافەکەمان، بەڵام جارێ نایناسم، ئەویش زۆری پەلەیە، تازە کات درەنگە بەیانی تەلەفۆنی بۆ دەکەمەوە.

دایکم: باشە جێگام بۆ ڕاخستویت بڕۆ بخەوە و ئیسراحەت بکە، دیارە زۆر هیلاکیت، هەرکاممان زوو خەبەرمان بویەوە ئەویتر هەڵبسێنێت بۆ نوێژی بەیانی، هەرچەند من هەر خەبەرم دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر تۆ زوو بەئاگا هاتیت من خەبەر بکەوە با بەیەکەوە شەونوێژ بکەین.

ماکوان: بەسەرچاو، دەست خۆش، چوومە ژورەکەی من و پێشڕەو لێی دەخەوتین، باش بوو هێشتا پێشڕەو لە کۆکردنەوەی کەلوپەلی دوکانەکەی بوو نەهاتبوە ماڵەوە، خێرا تەلەفۆنم کردەوە بۆ گەنم و بۆ ئەوەی بزانم چی دەوێت. وەڵامی دایەوە بە دەنگێکی بەسۆز و خوشکانەوە وتی کاکە ماکوان تۆ ناوت چییە؟

دەستم کرد بە پێکەنین وتم: گەنم گیان من ناوم خەسرەوە، بەڵام نازناوی شیعری و نووسین و کاری سیاسیم بە ماکوان کەریم ناسراوم، جاتۆ کامیانت پێ خۆشە بەو ناوە بانگم بکە.

گەنم: کاکە خەسرەو چەند خوشک و برای ترم هەیە؟




ماکوان: گەنم گیان دوو براو دوو خوشکی ترت هەیە لەباوکەوە، ئەی ئێوە چەند خوشک و بران؟

گەنم: تەنها من خوشکتانم، بەڵام خوشکوبرای ترم هەیە لە بابە جمال.

ماکوان: باشە گەنم گیان دایکت ناوی چییە؟

گەنم: دایکم ناوی شیرینە

ماکوان: خەڵکی کوێیە؟

گەنم: خەڵکی ناوچەی پشدەرە

ماکوان: سەیرە، باشە چۆن لەگەڵ باوکم یەکیان ناسیووە، لێت نەپرسیوە؟

گەنم: باجارێک لێم پرسی، بەڵام لێم تورە بوو وتی جارێکی تر پرسیاری وام لێمەکە، منیش لەبەر بابە جەمال ئیتر پرسیارم لێ نەکردەوە.

ماکوان: ئەی باوکت بە وێنە بینیوە، لەماڵی ئیوە هیچ وێنەیەکی باوکم هەیە.

گەنم: بەڵێ، وێنەی زۆرە.

ماکوان: گەنم گیان، ببورە ناچارم دایبخەم، وابزانم کەسێك دەیەوێت بێتە ژورەکەم، بەیانی قسە دەکەینەوە.

تەلەفۆنەکەم داخستەوە و پێشڕەوی برام هاتە ژورەوە، منیش خۆم سەرقاڵ کرد بە کتێب خوێندنەوە، بەیانی نەچوومە دەرەوە تا کاتی نوێژی هەینی زۆر باش لێی خەوتم، بەڵام دوای نوێژ وەکو شێت و هارم لێهات نەمئەزانی بیر لە مەرگی خۆم بکەمەوە، یان لە گەنمی خوشکم یاخود لە شێرکۆی کوڕم!

هەردەبوو کەسێک ئاگادار بکەمەوە لەنزیکەکانم، ئەوەی زۆر متمانەم پێی بوو باپیرم بوو، تەمەنی ٧٥ ساڵ بوو، ئەگەر هەڵە نەبم تازە زاوا بوو.





ژنی خۆی هێنابوو لە ئێران چوبوەوە بۆ ماڵە خەزورانی و خزمانی ئەو وڵاتە ئەویش لە سلێمانی نەبوو.

کاتژمێر ٢ی دوانیوەرۆ نەبەز هات بە شوێنمدا بمبات بۆ زڕگوێز بۆ باخەکەی دوکتۆر چالاک، هەڵبەت لە دووری ئەو ناوچەیەش بوو، بەڵام باخێکی جوان و ماڵێکی خۆشی تێدا کردبوەوە، لە ڕێگا لەگەڵ نەبەز کەوتینە گفتوگۆ دەربارەی تاڤانی عەزە بێ سمێڵ و سەروەری بەلوعە، من زۆر دڵنیا بووم لەخۆم هەرگیز کاری بێمانای وام نەکردووە، دڵنیاییەکەم نەبەزی گەشبین کرد، بەڵام نەبەز وتی بەقسەم بکە بابڕۆینە بنجوبناوانی تۆ دوژمنت هەیە خەڵکی خوا خوایەتی کێچێکت لێ بکەن بە گایەک، سوێند بەخوا درۆ بکات خۆم زیندانی دەکەم.

ماکوان: سوێند خواردنی ناوێت بەدڵنیاییەوە درۆ دەکات، واتا تۆ بڕوا بەمن ناکەیت؟

نەبەز: بەدڵنیاییەوە بڕوام بە قسەکەت هەیە، بەڵام مەبەسم ئەوەیە بزانم بۆ ئەم قسەیە دەکات لەم کاتەدا، ئەوەم منی شیت کردووە.

ماکوان: من ئێستا لە حاڵەتێکدام هیچ بیرم بۆ ناکرێتەوە، بێجگە تۆ کەس لەدەردی من نازانێت، دنیا بەسەرمدا ڕووخاوە، نازانم چۆن خۆم کۆبکەمەوە، لەچوار لاوە هەڵبڕژاوم بەسەریەکدا، با ئەمڕۆ بزانم ئەم چارەسەرە چییە، لەمە دڵنیا ببمەوە ئینجا کێشەی گەنم چارەسەر دەکەم و دوای ئەوە بڕۆین بۆلای تاڤان ڕەش و سەروەری بەلوعە، ئاخر مەعقول نییە من خاوەنی منداڵ بم لەو کەسانە، ئاخر تۆ بڕوا دەکەیت بەشتی وا نەبەز؟

نەبەز: نا، هەرگیز بڕوا ناکەم، بەڵام ناهێڵم هەروا بڕوات، داوام کردووە لە سەروەر کە لەگەڵ تاڤان دابنیشم بزانم دەڵێت چی و دەمی تاقی بکەمەوە.







ماکوان: زۆرباشە منیش پێم باشە بە وردی خۆت، ئاقڵانە بڕۆ بزانە ئەم ئاشە چییە ناویانەتەوە، وابزانم گەیشتینە باخەکە، ئەوە ئەو ناونیشانەیە کە دوکتۆر چالاک داوینەتێ چووینە بەردەم باخەکەو دوکتۆر چالاک هات بەدومانەوە، دوای سڵاوکردن وتم دەکرێت کاک نەبەزیش لەگەڵماندا بێت؟

د. چالاک: ببورە کاک ماکوان خۆت دەزانی ئێرە تەنها بۆ نەخۆشە جا کاک نەبەز لێمان ببورێت ئەگەر من و جەنابت ڕازی بین، ئەوا ئەو کەسانەی تر ڕازی نابن، من دڵنیام کاک نەبەز زۆر باش لێمان تێدەگات، ئەگەر بۆ گەڕانەوەی جەنابیشتانە ئەو دەتوانێت بڕوات من خۆم دەتگەیەنمەوە شار و لەخزمەتدا دەبم.

ماکوان: زۆر سوپاس دوکتۆر گیان.

کاک نەبەزیش داوای ئیزنی کرد و ماڵئاوای کرد، منیش لەگەڵ دوکتۆر چالاک بەناو باخەکەیدا گەڕاندمی و چوومە لای نەخۆشەکان و دوکتۆر چالاک منی ناساند.

هەریەک لەنەخۆشەکان خۆیان ناساند، وتی زیاد لە ١٥ کەسین، بەڵام ئەو ڕۆژە تەنها ١١ کەس ئامادە بوون بە منەوە.

د. چالاک: دەستی کرد بە قسەکرد و وتی با سەرەتا باسی ئەم جۆرە چارەسەرەت بۆ بکەم، لە کوردستان لەڕووی چارەسەر و زانستەوە هیچ بەهاو نرخێکی بۆ دانانرێت، بەڵام لەوڵاتانی پێشکەوتوو بە (تێراپی) یاخود ڕاهێنانی دەروونی کە بەشێکە لە چارەسەر لەگەڵ دەرمان، جا من دەمەوێت لێرەوە بۆ زانکۆکانی بسەلمێنم لەگەڵ دوکتۆرە هاوڕێکانمدا کە ئەم جۆرە چارەسەرە زۆر گرنگە و باشترینە.

بەرنامەی کارەکانمان بەم شێوەیە دەبێت، هەرکەس کە دێتە ناوەوە دەبێت ئەمانەت بپارێزێت و نهێنی کەسی تر ئاشکرا نەکات، واتا لە گوروپەکەمان زیاتر نەڕواتە دەرەوە، بێ هیچ کۆمێنتێک مەجلیسەکە



بەجێ دەهێڵێت و کەس بۆی نییە پرسیاری لێبکات کە بۆچی هەڵساوە مەجلیسی بەجێ هێشتووە. لەکاتی قسەکردنی هەر نەخۆشێک کەسێکی کە قسەی پێ نابڕێت و ئەگەر ئارگۆمێنتێک یاخود کۆمێنتێکی هەبوو ئەوا دەست بەرز ئەکاتەوە و داوای کات دەکات، بەڵام یەکجار ئەم کارە بکات تا کەسی قسەکەر بێزار نەبێت، دانیشتنی ئێرە خۆبەخشییەو کێ توانای هەبوو دەتوانێت خواردن و خواردنەوە بهێنێت کارێکی باشە و لەسەر کەس واجب نییە، ئەمە یاسای ئەم گرووپەیە، جا ئەگەر ڕازیت ئەوا خۆشحاڵین بەهاتنت و هەموو باسی خۆت لێرە دەکەیت بۆ نەخۆشەکان ئەوەی خۆت دەتەوێت، کەس زۆری لەسەر نییە هەر پرسیارێکت لێ کرا لە گروپەکەدا بەدڵت نەبوو دەتوانیت ڕاستەوخۆ بڵێی وەڵامی ئەو پرسیارەت نادەمەوە. هەموو ئەو کەسانەی لێرەن تەجروبەی خۆیان باس دەکەن لەگەڵ ئەم نەخۆشییە، تا ئەوانی تر ئەگەر نایزانن سوودی لێ وەرگرن و هەموو بتوانن لەڕووی دەروونییەوە بەهێز بن تاوەکو شکست بەم نەخۆشییە بهێنن، چونکە باری دەروونی ڕۆڵێکی زۆر گرنگ دەبینێت لە چارەسەری نەخۆشی سەرەتان، تاوەکو نەخۆش باری دەروونی جێگیر بێت و بەهێز بێت زوتر و باشتر دەتوانێت زاڵ بێت بەسەر نەخۆشییەکەدا و چارەسەر ببێت.

ئایا ڕازی بە گروپەکەمان؟

ماکوان: بەڵێ بەدڵنیاییەوە خۆشحاڵ دەبم و لەچوارچێوەی یاسای گروپەکە دەرناچم، ئەگەر پێتان خۆشە سوێندی یاسایی دەخۆم، کەوام وت هەموو دەستیان کرد بە پێکەنین.

د. چالاک: فەرموو کاک ماکوان خۆت بناسێنە.

ماکوان: بەڵێ باشە من ناوم خەسرەو عبدالکریمە، خەڵکی پێنجوێنم لەوێ لەدایک بووم لەساڵی ١٩٧٧، قوتابی زانکۆم و ماستەرنامەم پێشکەش کردووە، چاوەڕوانی ئەنجامم، لەمانگی داهاتوو ئەنجامەکەی بەدەست دەگات ئەگەر نەمرم تا ئەوکات. هەرچەندە دڵنیام کە بەباشی وەرگیراوەو




قبوڵ کراوە، تووشی سەرەتانی مێشک بووم ئەوە هەمووی ماوەی چەند ڕۆژێکە زانیومە هەرچەندە مردن و ژیان لای خوای پەروەردگارە، من چاوەڕێی مەرگم و بڕیاری کۆتایم داوەکە بەهیچ شێوەیەک نەشتەرگەری نەکەم و ئەگەر چارەسەری نەبوو لەم ڕێگایەوە ئەوا وەکو وتم بڕیاری کۆتایم یاوە، لەبیرم چوو بیڵێم کەوا خاوەنی خێزانم و کچێکم هەیە بەناوی ئانا وَ چاوەڕێی لەدایک بوونی کچێکی ترم بەپێی ئەنجامی سۆنەر، لە ئێستادا لە وڵاتی نەرویج دەژیم بەڵام تا ئەم ساتە وەختە بڕیارم بۆ نەدراوە جێگای مردنی خۆم هەڵبژێرم، نازانم لێرە بمرم باشە یاخود لە نەرویج، تکا دەکەم ئیوەش ڕای خۆتان بڵێن و هاوکاریم بکەن.

د. چالاک: کاک ماکوان ببورە شتێکم بیرچوو بیڵێم، ئێمە لەدوای هەر کاتژمێرێك لە گفتوگۆ کردن نیوکاتژمێر پشوو وەردەگرین، جا با ئێستا ئەو بەڕێزانە پشوو وەربگرن دوای ئەوە بەردەوام دەبین.

ماکوان: کارێکی زۆر باش دەکەن، کاتی نوێژی عەسرە منیش دەچم نوێژی عەسر دەکەم، کێ پێی خۆش بوو با بەجەماعەت بیکەین، وامزانی زۆرینە نوێژ دەکەن کەچی تەنها منو کوڕێکی کە هەڵساین بۆ نوێژ کردن، ئەویش ناوی دلاوەر بوو.

کە سەلامم دایەوە لە نوێژەکە کاک دلاوەر لە تەنیشتمەوە بوو، خۆم بۆ نەگیرا وتم ئەو هەمووە سەرەمان گرتووە بۆناو گۆڕ باشە ئەوانە چی دەکەن، وازیان لەنوێژ هێناوە یاخود هەر نەیان کردووە؟

دلاوەر: نا کاک ماکوان ئەوەندی من بزانم ئەو کچە ناوی گەڵایە ئەویش نوێژ دەکات، بەڵام بۆ ئەوانی تر کەسیانم نەدیوە نوێژ بکەن، حاجی سەمیریش نوێژ دەکات، بەڵام ئەمڕۆ نەهاتووە، ئیتر بەڕاستی ئەنوەر زۆر باسی یۆگا و ئەو شتانە دەکات مێشکی سازان و خەجیجی تێکداوە، ئازار خان و کاک فایەق نوێژ ناکەن و بڕیاری زەواجیان داوە بەڵام خەڵکێکی باشن.



ماکوان: کاک دلاوەر ماشاءالله زانیاری باشت لایە، ئەمانەی تۆ باسی دەکەیت لەم گروپەن ونەخۆشن یان باسی گروپی ژنهێنان و هاوسەرگیرییە، من بەدوای ساتێک ئارامیدا دەگەڕێم بۆ ئەوەی بیری تیا بکەمەوە کەم حاڵەتەی ئێستامدا کەچی ئەو خەڵکە بۆ مردن دەڕوات و هاوسەرگیری دەکات، هەرچەندە شتێکی زۆر باش و پۆزەتیڤە بەمانای خراپ نایڵێم بەڵکو لەلام سەیرە.

دلاوەر: کاک ماکوان جەنابت ژنت هەیە بۆیە وادەڵێیت، بەڵام یەکێکی وەک من کە ژنم نییە پێم خۆشە پێش ئەوەی بمرم هاوسەرگیری بکەم، یاخود کچێك کە نەخۆشە ئارەزوومەندە پێش مردنی هاوسەرگیری بکات.

ماکوان: بەڕاستی قسەکەت حەقە، چونکە من لەو حاڵەتەی ئێوەدا نیم بۆیە ناتوانم هەست بەو حاڵەتە بکەم، بۆیە دانی پێدادەنێم کە من نەمزانی.

دلاوەر: نا ئاساییە کاک ماکوان، نەزانی جەنابت ناچێتە بواریی ئەوەی کە شارەزا نیت، من وا هەست دەکەم نەزانینەکە وەکو تەم داپۆشراو بوو کە خۆری زانستەکە هات تەمەکەی ڕەواندەوە، من بۆیە جەنابت و مامۆستام خۆش دەوێت زوو دان بە حەق دا دەنێن.

ماکوان: بۆ کاک دلاوەر پێشتر منت دەناسی؟

دلاوەر: گوێم لەهەموو وانەکانی ئەندەلوس و تەتار و مەغۆلت گرتووە، زیاتر لە ٢٠ وانەی تۆم بڵاوکردۆتەوە لەسەر سەڵاحەدینی ئەیوبی و جەنگی خاچپەرستان، کە هاتی بۆ ئێرە وامزانی دوکتۆر چالاک هێناویتی تا قسە بکەیت بۆ نەخۆشەکان، کە زانیم تۆش نەخۆشی، حەز دەکەم هەرچی دەردی تۆیە بێت بۆ من، برا بەخوا حەیفە تۆ لەئێستادا بمریت.

باوەشم پێدا کرد و وتم: تۆ برای عەزیزی منیت، برا یاخوا هەرچی دەردی تۆیە بۆ من بێت، برا تۆ ژنت نییە یاخوا تۆ هیچت لێ نەیەت و هەر بمێنیت، بەڵام دلاوەر گیان ئەمرۆ فێری شتێکی زۆر گەورە بووم




لەجەنابتەوە، بەڕاستی زۆر گەورە دەینرخێنم، فێرت کردم خۆشەویستی لەپێش مەرگەوەیە، بە خۆشەویستی دەتوانیت مەرگ بوەستێنیت.

دلاوەر: کاک ماکوان گیان لەوانەیە ئەم نەخۆشییە و گەیشتنمان بەیەک زۆر شت لەقەدەرمان بگۆڕێت، من حەزم بەگفتوگۆی جەنابت هەیە، بەڵام ئەگەر ئەرک نییە بۆم ڕوون بکەوە.

ماکوان: بەسەرچاو، بەڵام سەرچاوەی بیرۆکەکەم لەخۆت وەرگرتووە، ئەوە ماوەی هەفتەیەکە لەکوردستانم، لەیەکەم ڕۆژەوە تا ئەمڕۆ کە ٦ ڕۆژ دەکات نەمتوانیووە بۆیەک چرکەش بیرکردنەوەیەکی مەعریفی لەمێشکم دا ڕووبدات، هەر سەرقاڵ بووم بە مەرگەوە، لەگەڵ مەرگدا دوو حاڵەتی خۆشوویستی ڕوویداوە کە تۆ خستەوە بیرم، یەکێکیان دۆزینەوەی خوشکەکەمە و دووەمیش دۆزینەوەی کوڕەکەمە.

دلاوەر: بەزاتی خوا کاک ماکوان هیچت لێ تێناگەم.

ماکوان(بەپێکەنینەوە): ڕاستە تووشی نەخۆشی مێشک بووم، بەڵام جارێ شێت نەبووم، ئێستا کاتی باسکردنی هەموو ڕووداوەکان نییە بەڵام وا بڕوات من و تۆ زۆر قسە دەکەین بەیەکەوە، دوکتۆر چالاک بانگمان دەکات بابڕۆین لەگروپەکە دانەبڕێین.

دلاوەر: بەو خوایە کاک ماکوان یەک ئاسمان قسەم پێیە بۆ جەنابت.

ماکوان(بەپێکەنینەوە): دەزانم، هەرکە ئاوڕم دایەوە لەنوێژەکەم باسی گەڵات کرد، دیارە یان گەڵای سەوزە یاخود زەرد و هەڵوەریوە.

دلاوەر: کاک ماکوان تۆ چاومانی دوای قسەت بۆ دەکەم.

د. چالاک: بەڕێزان حەز دەکەم ئەمڕۆ کاک ماکوان باسێک بکاتەوە لەسەر ئەم دانیشتنە، بەو پێیەی یەکەم جارە لەگەڵماندایە بابزانین کارەکە چۆن هەڵدەسەنگێنێت، ئایا چی بکەین باشە کە دەردە دڵی خۆمان بکەین تا بتوانین چارەسەری کێشەکانمان بکەین؟



ماکوان:جەنابی دوکتۆر بۆ من، ئەم هەموو کوڕ و کچە باشو مەعقولانە لێرەن من پێم خۆشە گوێم لەوان بێت، ئەوان تەجروبەیان زیاتر هەیە لەمن لەگەڵ ئەم نەخۆشییە.

د. چالاک: پێم خۆشە گوێم لە جەنابت بێت، دڵنیام ئەمانیش هەموویان پێیان خۆشە، با من پرسیارێک بکەم بۆچی بڕیارت داوە کە نەشتەرگەری نەکەیت؟

ماکوان: لەخزمەتاندام جەنابی دوکتۆر، بۆچی نەشتەرگەری ناکەم، ئەو ڕۆژەی کە لەگەڵ جەنابت قسەم کرد جەنابتان وتان نیسبەتی چاک بوونەوە زۆر کەمە، خۆ ئەگەر نەشتەرگەرییەکەش سەرکەوتوو بێت چەندین کاریگەری لاوەکی تری دەبێت کە باسی کاریگەرییەکانت بۆ کردم، بۆیە مردن زۆر باشترە لەوەی کە تووشی شەلەل بم، یاخود کوێر بم یانیش توانای قسەکردنم نەمێنێت، جا لەبەر ئەوەیە بڕیارم داوە نەشتەرگەری نەکەم، ئەوەشی کە دەزانێت کەوا من تووشی ئەو نەخۆشییە بووم تەنها ئێوەن و ئەو کوڕەی کە هێنامی بۆ ئێرە، بەڵام لە ئاوڕدانەوەم لە نوێژەکەمدا و سەلام کردنم لەکاک دلاوەری بەڕێز وەکو بڵێیت خوای گەورە دنیایەک ئیلهامی بۆ ناردم کە پێشتر بیرم لێ نەکردبوەوە، جا نازانم هۆکاری بەرەکەت و پاکێتی کاک دلاوەرە یان باخەکەی جەنابتان موبارەکەو یارمەتی دەری خەڵکییە، بەڵام تەفسیری من ئەوەیە کە ئەو خەڵکە بەڕێزەی لێرەن هەموو باشن و جەنابیشت ئەم کارە گەورە و پیرۆزەت گرتۆتە ئەستۆی خۆت، بەهەرحاڵ چوار پرسیار لە مێشکمدا دروست بووە، لەهەمان کاتدا وەڵامەکەیم دەست کەوت.

یەکەم: چی گرانبەهاترین شتە لەم بوونەدا؟

دووەم: ڕۆح چییە؟

سێیەم: هاوکاری بەردەوامی مرۆڤایەتی چییە؟

چوارەم: ئەو شتە چییە کە ئێمە لەپێناویدا بژین؟




پێش ئەوەی وەڵامەکەی لە من وەربگرن ئێوە چی دەڵێن؟

چۆن وەڵامی ئەم چوار پرسیارە دەدەنەوە، بۆ زانیاریتان وەڵامی هەر چوار پرسیارەکە یەک وشەیە، بفەرموون...

دکتۆر چالاک: هیوایە

ئازار خان: منیش دەڵێم هیوایە

گەلا خان: نازانم، بێ وەڵام

سازان خان: هیوایە

خەجیج خان: هیوایە

فایەق: ئومێد و هیوایە

دلاوەر: لەش ساغییە

ماکوان: دەمی هەموو لایەک خۆش بێت، بەڵام هیچییان نییە، وەڵامە ڕاستەکە (خۆشەویستییە).

ئەو چوار پرسیارە زۆر گرنگە لەژیانی زانا و بیرمەند و فەیلەسوفەکاندا، وەڵامەکەشی گرنگە کە وتمان خۆشەویستییە، خۆشەویستی زیاتر لە (١٠٠١) پارچەیە، هەر پارچەیەک تایبەتە بەناوی خۆیەوە تا خۆشەویستی بۆی پێناسە بکات، کەواتە وەڵامەکە خۆشەویستییە بەڵام بە پرنسیپ.

د. چالاک: زیاتر ڕوونی بکەوە بۆمان، ئەم وتانەت زۆر قوڵن هەست دەکەم پێداویستی کارەکەی منیشە.

ماکوان: بەدڵنیاییەوە پێداویستی جەنابت و هەموو کەسێکە، کە دەڵێم خۆشەویستی (١٠٠١) پارچەیە لاتان قورسە، لەوە ناچێت زوو لێی تێبگەن وەکو ئەرستۆ دەڵێت: کە دەگەیت بەوەڵامی ڕاست وەڵامەکە زۆر سادە دەبێتەوە، بۆیە ئەوە بزانن کە مرۆڤ بەدوای پرسیارێکدا وێڵ دەبێت کە وەڵامەکەی دەست کەوت پرسیارەکە گرنگی نامێنێت، چونکە وەڵامەکەی



زانیوە ئیتر وا دەزانێت پرسیارەکە سادەیە. پێشتر کە نەیدەزانی زۆر هەڵپەی دەکرد بۆ زانینی، بەڵام کەزانی زۆر ئاسایی و سادە بوو لای، بۆ زانیاریتان هەموو وەڵامێکی ڕاست بۆ خاوەنەکەی سادەیە.

ئەزانم و هێشتا لەوانەیە باش لێم تێنەگەن، زیاتر ڕوونی دەکەمەوە وتمان خۆشەویستی (١٠٠١) پارچەیە، نموونەی ئەو پارچانە خۆشەویستی دایک، باوک، برا خوشک، هاوڕێ، منداڵ، ئاژەڵ. خاک، دار..هتد. لەسەرو ئەمەوە کە خۆشەویستی ناو ناخی مرۆڤ خۆشەویستی غەریزەیی ڕوو ئەدات کەناوی عیشقە، یان کورد دەڵێن (ئەویندارى) یاخود (ئەڤین) پرنسیپی ئەم خۆشەویستی و عیشقە دروست نابێت، ئەگەر لەسەرو مرۆڤەوە کەسێک بەیاسا و ڕێسا بۆمان ڕێکنەخات، ئەویش خۆشەویستی بنەڕەتییە کەخوای پەروەردگارە سەرچاوەی هەموو خۆشەویستییەکانە و ئەویش فەرمانی پێکردووین کە خۆشەویستی خۆیەوە و پاشان ئێمەشەوە محمد ﷺ نازانم قسەکانم ڕوونە؟ هەست دەکەم هەموو بێدەنگن چییە؟ هەڵەم کردووە؟.

د. چالاک: نا بەپێچەوانەوە بۆ من وتەکانت زۆر نوێیە و زۆر خۆش و سەرنج ڕاکێشە، ئەوە ڕای منە جا ڕای ئەو بەڕێزانە لای خۆیانە.

ماکوان: هیوام وایە کە جێگای بایەخ بێت، بۆ نموونە ئەگەر گەڵا وێنەیەکی دلاوەر بگرێت، پێی بڵێت لەکاتی وێنەگرتنەکەدا پێبکەنە با جوان دەربچێت بە شێوەیەکی تر ئەگەر قسە نەکات گەڵا خانم ڕاستەوخۆ بەکاک دلاوەری برام بڵێت، دلاوەر خۆشم دەوێیت لەوکاتەدا دلاوەر دەموچاوی چی لێ دێت، ئەوە ئێوە هەموو پێدەکەنن، دلاوەریش لەخۆشی وشەکە نازانێت چۆن بوەستێت، جا وشەی خۆشەویستییە کە پرەنسیپی بەهاو ڕەوشتەکە دیاری دەکات، ئایا وشەکە لەنێوانی گەڵا و دلاوەر-ەوە دێن و پێچەوانە دەبێتەوە و کام پرەنسیپ دەیگرێتەوە خۆی عیشق، خوشک و برایەتی، هاوڕێیەتی، بەزەیی، مەرگ و نەخۆشی..هتد.





ئەنوەر: ئەم وتەیەی بەڕێزتان زۆر نایابە، بەڵام کوا خۆشەویستی لەخانەی دیندا جێگای دەبێتەوە کاک ماکوان؟ هەڵبەت پرسیارە نەک موناقەشە، چونکە زۆر حەز دەکەم ڕاستگۆ بم، من بەڕێزتان دەناسم و نووسین و وتارەکانتم گوێ لێبووە، بەڵام چەندە بڕواو قەناعەتم پێیەتی ئەوە شتێکی ترەو پەیوەندی بە خۆمەوە هەیە، بۆیە دەزانم لەتۆدا یەک مەبدەء دەبینم ئەویش لەخۆتەوە قسە ناکەیت.

ماکوان: سوپاسی متمانەکەت دەکەم، خۆشحاڵم بەوەی کە باکگراوندێکی دوور و نزیکت لەناسینی من هەیە، پێش ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەت بدەمەوە حەزدەکەم دوو دەستەواژە جیابکەمەوە بۆ ئەوەی هەموومان بەئارەزووی دڵی خۆمان وتووێژ بکەین، کورد زۆر باسی ئازادی دەکات، ئازادی لەدەسەڵات، کارکردن، ئازادی ژنان، ئازادی پیاوان و منداڵان، زۆر ئازادی تریش لەگەڵ چەمکی ئازادی پێویستە کار بۆ چەمکێکی تر بکرێت کە پێی دەوترێت سەربەستی، ئەگەر نموونەی ئافرەتێک وەربگرین لە کوردستان بڵێین ئازادە لەهەڵبژاردنی هاوسەرەکەی، بەدڵنیاییەوە دەتوانێت ئازاد بێت لەهەڵبژاردنی هاوسەری، بەڵام ئەگەر سەربەست نەبێت ئازادی نادرێتێ، بۆ ئەوەی جوانتر ڕوونی بکەمەوە تێمەی کورد ئازادین لە ڕووی بەڕێوەبردن و دەسەڵات، بەڵام سەربەست نین، ئەم وتەیەم لەدوایدا ئیشمان پێی دەبێت و بیرت دەخەمەوە ئەم پێشەکییەم بۆ چییە، بەهەر جۆرێکە دێمەوە ناو باسەکەمان، لەئیسلامدا دوو قوتابخانەی سەرەکی هەیە، قوتابخانەی زانستی محمد ﷺ وەکو ئەحکام و عەقیدە و هەڵێنجاندن لەیاساو ڕێساکان کەناوی فیقهی ئیسلامییە، ئەم قوتابخانە بۆ هەموو سێکتەرەکانی ژیان هەموو دەقی ڕاشکاو و ڕوونە، ئەم قوتابخانەیە ناسراوە بە قوتابخانەی سەلەفی یان زانستی شەرعی، قوتابخانەی دووەم عیرفان و تەصەوفە، کە بنەڕەتی دەگەڕێتەوە بۆ جوانی، خۆشەویستی، دەنگ، ئاواز، دیمەن، هونەر، تەلارسازی، عیشق، فەلسەفە...هتد. هەروەها هەردوو قوتابخانەکە سەرچاوەیان قورئان و سوننەتە، یان بڵێین سەرچاوەکەیان





ئایینی پیرۆزی ئیسلامە ئەم دوو قوتابخانەیە لەیەک کاتدا وجودی نەبووە، تەنها لە چەند جێگایەکدا نەبێت، کە هەردووکی بەیەکەوە ڕێگایان بڕیوە شارستانییەت و زانیاری دروست کردووە، بۆ نموونە لە ئەندەلوس، عوسمانی، سەفەوی، غورییەکان لە هیندستان.

لە ئێستادا لە جیهاندا قوتابخانەی یەکەم بە ڕووکەش زیاتر دەردەکەوێت و خەڵکی وەریدەگرێت، بەهۆکاری ئاوابوونی دەسەڵاتی ئیسلامی بۆ گەڕاندنەوەی، جا قوتابخانەی مجرد، سەلەفی یان زانستی شەرعی هیچ جۆرە خۆشەوسیتی و بەهایەکی تەصەوفی عارفانەی تێدانییە، نەک لەبەر ئەوەی نایەوێت، کاری قوتابخانەکە و ئەو بەشەی پێویست نییەو لێی ناکۆڵێتەوە.

بەڵام ئێستا لەم مەجلیسەدا ئێمە بۆ چارەسەری خۆمان پێویستمان بە خۆشەویستییە، بەڵام بەئاکار و بەها و ڕەوشتی جوان، وتمان دەبێت بە پڕەنسیپ جا جەنابت فەرموت مەبدەء، مەبدەء و پڕەنسیپ هەردووکی هەریەکە، ئەم وتەیە بۆ جەنابی دوکتۆر و ئێوەشە بەگشتی، بەڵام بە تایبەت بۆ دوکتۆر چالاک کە دەیەوێت لە شێوەی ئەم جۆرە ڕاهێنانانە کە ئێستا لە خزمەتیداین لێکۆڵینەوە بکات، تا لێکۆڵینەوەکەی سەرکەوتوو بێت پێویستی بە چەند فاکتەرێک و ئەجندایەکە بۆ ئەوەی ئەو دەردە لە ئێمەدا دەربکات بێ نەشتەرگەری لای من پێویستی بە تەوەکول و خواناسی هەیە، پێش هەموو شتێک. دوای خۆشەویستی ئەوەیە کە ناومان لێناوە بە پڕەنسیپی خۆشەویستی یان پڕەنسیپی عیشق، ئەمەش ڕێگایەکی سەختە چەندە ئەم دنیایە فراوانە کەناخی مرۆڤدا فراوانتر هەیە.

بەهەرحاڵ من زۆر قسەم کرد با نۆبەی ئێوەش بدەم، بفەرموون.

سازان: تکایە بەردەوام بە زۆر هەست بە ئارامی دەکەم.

گەڵا: هەروەها منیش.







دلاوەر: بەدڵنیاییەوە وتەکانت جێگای خۆشحاڵی منە، تکایە بەردەوام بە.

د. چالاک بە پێکەنینەوە: تەواو کاکە من دەڕۆمەوە بۆ عەیادەکەم، تۆ باشترین چارەسەرت لایە.

ئەنوەر: کاک ماکوان ڕات چۆنە لەسەر کاری یۆگا و چوونە ناو ژیانی ڕۆحەکان؟

ماکوان: وەڵامی پرسیارەکەم لێت دەوێت کاک ئەنوەر گیان، دەکرێت ئازاد و سەربەست بین یان یەکێکیان هەڵبژێرم؟

ئەنوەر: ببورە کاک ماکوان ئازادی و سەربەستی بۆ جەنابت و هەموو ئازیزان.

ماکوان: سوپاس کاک ئەنوەر گیان ئەگەر گوڵێک لەباخەکەی دوکتۆر لێبکەمەوە پاشان گوڵێکی پلاستیکی بهێنم حەزدەکەیت کامیانت پێشکەش بکەم لەبەرچاوی ئەم دۆستانەماندا؟ بە دیوێکی تردا ئەگەر گوڵە ڕاستییەکە بدەم بە دلاوەر و گوڵە پلاستیکیەکە بدەم بە جەنابت، هەست بە کەمی دەکەیت و پێت ناخۆش نابێت؟

ئەنوەر: بە دڵنیاییەوە گوڵی پلاستیک بۆ جوانییە و کوا پێشکەش دەکرێت.

ماکوان: دەم خۆش جوانترین وەڵام بوو، من گوڵی ڕاستیم لایە پێشکەشی خەڵکی دەکەم، ئیتر چۆن بەگوڵی پلاستیکی ڕازی دەبم. با زیاتر ڕوونی بکەمەوە، یۆگاو ژیانی ڕۆحەکان کە جەنابتان باسی دەکەن لای من تەنها قسەیە و هیچ مانایەکی نییە، چونکە مرۆڤ ناگاتە هیچ ئەنجامێکی ڕۆحی یان دەروونی یاخود جەستەیش، باشترین بەڵگە بۆ وتەکەم وڵاتی چین، یابان و ڕۆژهەڵاتە کە هەموو خاوەنی ئەم بیروباوەڕەن کەچی سیستەمی ماددیەکی ڕوتە و کۆمۆنیست و شوعین.



ئەنوەر: ناکرێت بڵێین کە جۆرێکە لەگوڵەکان.

ماکوان: بۆ نا؛ بەڵام لە گوڵە دەستکردو پلاستیکەکان نەک گوڵی ڕاستی، ( هەموو دەستیان کرد بە پێکەنین). بانگی مەغریبی داو وتم ببورن نوێژی مەغریب دەکەم، ئێوەش پشووی خۆتان وەربگرن.

من و دلاوەر هەڵساین بۆ نویژ، زۆرم لا سەیر بوو کەسی تر نوێژی نەکرد، دوای نوێژ دوکتۆر چالاک هەڵبژاردەی داینێ کە بمێنینەوە یاخود بگەڕێینەوە بۆ سلێمانی؟

دیاربوو هەمو وخۆشحاڵ بوون منیش ڕووم نەبوو هیچ بڵێم، چونکە سەیارەم پێنەبوو چاوەڕێی دوکتۆر چالاک بووم بمباتەوە بۆ ناو شار، هەرچەندە تەلەفۆنم کرد بۆ دایکم وتم لە سەیرانم لە قەرەداغ.

ماکوان" دوکتۆر لەو ڕۆژەوەی هەواڵی نەخۆشیەکەت داوە بەمن هیچ کات سەرم نەئێشاوە، پێشتر بێجگە ئەو دوو ڕۆژە سەرئێشەو ئازاری وا قورسم نەگرتووە، دەشێت من ئازارم زیاد بکات؟

د. چالاک: بەداخەوە سەرئێشە لەم جۆری نەخۆشییەی تۆدا پلە بە پلەیە و دەشێت دڵتێکەڵاتن و هێڵنجدانیشی لەگەڵ بێت، هەروەها بەرچاو ڕەش بوون و سەرگێژخواردن ئەمانە نیشانە سەرەتاییەکانن، بەڵام وردە وردە نیشانەکانی تری دەردەکەون، ببورە دەمەوێت واقعی بم لەگەڵت دا.

ماکوان: دەست خۆش بەڕاستی ئەگەر وابیت زۆر مەمنونم.

ئافرەتەکان هەڵسان ڕۆشتنە ناوماڵەکە و پیاوەکانیش لەسەر سەکۆی حەوشەکە ماینەوە، ئازار خان یاپراخی هێنابوو، منیش پرسیم باشە من ئەمڕۆ زۆر باسی پڕەنسیپ و مەبدەءم کرد باشە پڕەنسیپ و یاسای ئێرە چۆنە، دەبێت پارە بدەین؟




د.چالاک: نا؛ وەکو عەرزم کردیت هەمووی خۆبەخشە، تۆش کەی پێت خۆش بوو هێلکەو ڕۆنمان بۆ بکە، ئەزانم ئێمەی پیاو هەر ئەوەنە دەزانین.

لەم قسانەدا بووین، قیژەو هاوار لەلای ئافرەتەکان هەستا و هەموو ڕامانکرد، بینیم گەڵا کەوتووە، دوکتۆر خێرا دەرمانی دایە.

بەدلاوەرم وت گەڵا چییەتی؟

دلاوەر: سەرەتانی خوێن.

ماکوان: لاحِول ولا قوة إلاباالله العظیم.

دلاوەر: کاک ماکوان دوعای خێری بۆ بکە.

ماکوان: ئەی بۆ تۆی نەکەم، بەڕاست تۆ چییتە؟

دلاوەر: منیشِ وەکو ئەو سەرەتانی خوێنم هەیە.

لەدڵی خۆمدا وتم ئەم عیشقە چەند سەیرە، خۆشحاڵ دیارە کە وەک ئەو نەخۆشە.

ماکوان: خوای گەورە شیفاتان بدات، آمین.

هەرچەندە من یەکەم جاربوو ئەم حاڵەتە ببینم، بەڵام دیاربوو بۆ ئەوان تازە نەبوو، پاش ماوەیەک نان دانراو گەڵا هەستایەوە و هەموو نانمان خوارد، من لەتەنیشت دوکتۆر چالاک دانیشتبووم، وتم ئەم حاڵەتە زۆر ڕووئەدات دوکتۆر؟ پێویست ناکات ببرێت بۆ خەستەخانە؟

د. چالاک: هەمووی پێویست ناکات، گەڵا لە ئێستادا چارەسەری کیمایی وەردەگرێت، هۆکاری بورانەوەکەی دابەزینی زەخت و کاریگەری دەرمانەکەیە.

ماکوان: خوای گەورە بیخاتە میزانی حەسەناتت، بزانە هۆکاری تێکچوونی باری گەڵا خۆشەویستی و پڕەنسیپەکەی نییە؟



هەڵبەت من بۆ خۆشی ئەو قسەیەم کرد لەسەر بنەمای قسەکانی دلاوەر، بەڵام هەستم کرد کە دوکتۆر چالاک زۆر بە جدی وەریگرت.

کات درەنگ بوو ئەوان هەموو ڕۆشتن من و دوکتۆر چالاک و دلاوەر و گەڵا ماینەوە، بە سەیارەکەی دوکتۆر گەڕاینەوە، گەڵا چووە پێشەوە دانیشت و منو دلاوەریش لە دواوە دانیشتین، لەدوای گەیاندنی ئەوان بۆ ماڵی خۆیان، منی کۆتا کەس گەیاندەوە ماڵەوە، لەڕێگادا باسی گەڵا و دلاوەری بۆ کردم، کە بنەماڵەی گەڵا خەڵکی بەڕێزن و زۆر ئاسایی و سادەن و ڕەوشی ماددیان خراپ نییە، بەڵام زۆر ئەو باشەش نییە، باوکی گەڵا فەرمانبەرە لە فەرمانگەی هاتوچۆ، بەڵام بنەماڵەی دلاوەر زۆر داماون، دلاوەر لای ماڵی برایەکی دەژی و براکەشی کەسێکی زۆر باشە، بەڵام تەنها فریای خۆی و منداڵەکانی دەکەوێت، مامۆستایەو لەسەر مۆلیدەش کار دەکات بە ئێواران. زۆرجار ئازار خان دەیانهێنێت بۆ باخەکە یان خۆم هاتوچۆیان پێ دەکەم.

ماکوان: ئەی کەسوکاریان دەزانن کە ئەم دوانە دڵیان بەیەکەوەیە؟

د. چالاک: بەڵێ، بەڵام دلاوەر لەسەر مۆلیدەکەیە بەڕۆژدا و هاوکاری براکەی دەکات، بەو پارەیەش توانای ماڵ دانان و ژنهێنانی نییە دەنا هەموو لایەک حەز دەکەن. بەنسبەت دلاوەر تا بڵێی کوڕێکی بەهێزە و یەکجار چارەسەری کیمایی لێ دراوەکە سوودی باشی هەبوو، بەڵام وا دیسان لەم ماوەیەدا نەخۆشییەکەی دیسان چالاک بۆتەوە، بۆیە دەبێت دووبارە چارەسەری کیمیایی وەربگرێت.

ماکوان: خوای گەورە کاریان ئاسان بکات و دوعای خێریان بۆ دەکەم، ئەوەش ماڵی ئێمەیە، لە هەرکوێدا مەجالی وەستان هەبوو من دادەبەزم دوکتۆر گیان، حەزدەکەم دابەزین بەیەکەوە چایەک بخۆین.






د. چالاک: سوپاس ماندووم بەڵام دانیشتنی ڕۆژی سێ شەمەت بیر نەچێت، حەز دەکەم بەشدار بیت، هەفتەی دووجارە، ئەمڕۆ سوودمان زۆر وەرگرت.

ماکوان: بەسەرچاو بە پشتیوانی خوا ئامادە دەبم.

هەر دابەزیم و چوومە ژورەوە هەموو هاتن بەرەو ڕووم، وتم بەخوا زانیویانە و نەبەز پێی وتون، دایکم وتی: ئەوە تۆ لەکوێیت؟

ماکوان: لە سەیران بووم لە زڕگوێز.

پێشڕەو: ئەی مۆبایلت بۆ داخرابوو، هەر تەلەفۆنمان دەکرد هەڵت نەدەگرت، دڵتەنگ بووین.

ماکوان: وەڵاهی ڕاست دەکەن، دانیشتنەکەمان ئەوەندە خۆش بوو هەموو مۆبایلمان کوژاندبووەوە، ببورن.

دایکم تۆزێک تورە بوو، باش بوو زوو هێمن بویەوە، وتی خۆی لە خۆشیایەو خەم و خەفەت بۆ من دروست دەکات، گوێم پێ نەدا، کەمێك گاڵتەم لەگەڵا کرد گۆرانی ئامینە و ئامینەی حەسەن زیرەکم بۆ وت، ئارام بویەوە وتی: چایی دەخۆیت؟

ماکوان: تۆ عەزێت مەکێشە، پێشڕەو لێی ئەنێت.

پێشڕەو: ئێ کاکە لە بەیانییەوە دانەنیشتووم هەر لەبەر ئەوەی برای بچووکم، با دایکم لێی بنێت.

ماکوان: عەیبە دایکم چای بۆ من و تۆ دروست بکات.

پێشڕەو: دە هەڵسە تۆ دروستی بکە.

ماکوان: کورە عەیبە من برای گەورەتم.

پێشڕەو: ئەها دیسان قەوانە کۆنەکەیە.

دایکم: ئێستا کێ داوای لە ئێوە کردوە، دانیشن من چا لێ ئەنێم.



ماکوان: خوا تۆمان لێ نەسێنێت.

دایکم چووە ژورەوە و بە پێشڕەوم وت، باشە ئەو زەویەی من ئەمڕۆ بایی چەندە ئەگەر بیفرۆشم؟

پێشڕەو: جا بۆ ئەیفرۆشیت؟

ماکوان: پێویستم بە پارەیە.

پێشڕەو: من پارەت ئەدەمێ، لەم وڵاتە بەس ئەوەت هەیە بۆ دەیفرۆشیت، بۆ ڕۆژێک کە هاتیتەوە با ئەوەت هەبێت.

ماکوان: کاکە زەروورم پرۆژەیەکم هەیە دەمەوێت ئەو پرۆژەیەی پێ سەربخەم.

پێشڕەو: من پارەی دانراوم هەیە، بەکاری بهێنە کەی بوت بەرەوە.

ماکوان: تۆ حەز لە زەویەکە دەکەیت؟

پێشڕەو: من حەزی لێ ناکەم، من دەزانم ئەو زەوییە داهاتووی باشی دەبێت شوێنکەی جێگای بازرگانییە زۆر نایابە، من حەز دەکەم بۆ خۆت بێت، من دوو زەوی ترم هەیە.

ماکوان: لەبازاڕدا بەچەندە ئەمڕۆ وەکو بزانیت؟

پێشڕەو: نازانم بەڵام ئەو زەویەی تۆ ئەمڕۆ نزیکی ٢٠ دەفتەر دەکات.

ماکوان: تۆ بەو پارەیە دەتەوێت؟

پێشڕەو: باشە کێشە نییە، بەڵام من هەموو پارەکەم حازر نییە، نزیکی ١٥ دەفتەر حازرە.

ماکوان: بە ١٥ پێشکەشت بێت، بەناوی کێوەیە؟

پێشڕەو: هەر ئەو کاتەی بۆم کڕیت کردم بەناوی خۆتەوە.

ماکوان: پیرۆزت بێت و ١٥ دەفتەرەکم بدەرێ.

پێشڕەو: ئێستا؟

ماکوان: نا، تەواو ئەو زەوییە ماڵی تۆیەو ئەو ١٥ دەفتەرەش ماڵی منە، دەستی لێ نەدەیت ئیشم پێیەتی.

پێشرەو: زەویم ناوێت و پارەکەش بەرە بەکاری بهێنە.

دایکم چای هێناو و تی: ڕۆڵە بۆ دەیفرۆشی، خۆ ژنی پێ ناهێنیت؟

ماکوان: نا، پرۆژەیەکم هەیە، پرۆژەی کۆمپانیای مێدیایی پێ دروست دەکەم.

دایکم: بەخوا کەس لەتۆ تێناگات، ئەو موڵکە جوانە بۆ دەفرۆشی؟

ماکوان: دەیفرۆشم بە پێشڕەو ناڕواتە لای کەسی تر.

دایکم: مەبەستم ئەوەیە بۆ خۆت و منداڵەکانت با بمێنێت، ڕۆژێ گەڕایتەوە بیکەرەوە بۆ خۆت.

ماکوان: دڵنیام خوای گەورە لەوە باشتر ئەدات، ئەری دایە لەناوچەی پشدەر خزممان هەیە؟

دایکم: نەوەڵڵا ڕۆڵە من خزمم لەوێ نییە و کەسی لێ ناناسم.

ماکوان: کەسوکاری باوکم چی؟

دایکم: ڕۆڵە من و باوکت ئامۆزازایی یەکین، ئەگەر خزمی باوکت لەوێ بێت ئەوا خزمی منیشی لێیە، بۆ ئەم پرسیارە دەکەیت؟

ماکوان: هەروا وتم ئەمڕۆ لەو سەیرانە کوڕێکمان لەگەڵ بوو، وتی من باوکت دەناسم و خزمین، خەڵکی ئەو ناوچەیە بوو، بۆیە پرسیارمم کرد.

دایکم: بەخوا ڕۆڵە باوکت زۆر دەچوو بۆ ئەو ناوچانە و ڕەفیق و برادەری زۆری هەبوو، بەتایبەت بۆ قەندیل خۆی باسی ئەکرد بۆم، هەڵبەت یەکێک بووە لەو ناسراو نزیکانەی باوکت، ماشاءالله پەیوەندی

کۆمەلایەتی باوکت زۆر بەهێز بوو، حەتمەن بەهۆکاری خۆشەویستی باوکت وای وتووە.

ماکوان: دەبێت هەروابێت، قسەکەی تۆیە.

لەدڵی خۆمدا وتم بەخوا باوکم کارەکەی کردووە، نەک هەرپەیوەندی کۆمەڵایەتی بەهێز بووە، پەیوەندی سۆزداریشی بەهێز بووە.

دایکم: بیرم چوو پێت بڵێم، سبەینێ باوکم دێتەوە لە ئێران لەگەڵ خانمی سێیەمی! پێشڕەو دەچێت بە شوێنیا بۆ باشماخ.

ماکوان: وەڵڵا ئەم هەواڵە خۆش بوو، بەڕاستی بیری دەکەم، لەوەتەی بووە بە زاوای ئێرانیان ئێمەی لەبیر کردوە خوای گەورە تەمەنی درێژ بکات و بۆمانی بهێلێت، لەم قسانەدا بووم دوکتۆر چالاک تەلەفۆنی کرد، تەلەفۆنەکەم هەڵگرت وتی کاک ماکوان، باسی چوار پرسیارت کرد ئەمڕۆ دەمەوێت بینووسم کە فەرموتان تەنها وەڵامەکەی خۆشەویستییە، ئەو چوار پرسیارە چییە لە وجوددا؟

ماکوان: بەسەرچاو، ناشێت حەزبکەیت ببیت بە نووسەر؟

لەبەر دایکم و پێشڕەو پێم نەدەوت دوکتۆر، هەر ئەوان لەلامدا بوون بە کاک چالاک بانگم دەکرد.

د. چالاک: بەڕاستی پرسیاری دووەممە، کە چۆن بتوانم ببم بە نووسەر

بە پێکەنینەوە، ماکوان: چۆن من بتوانم ببم بە دوکتۆر؟ دەی وەڵامم بدەرەوە.

د. چالاک: وەڵا دەبێت بخوێنیت، ناشێ منیش ئەبێت بۆ ئەو پیشەیە بخوێنم؟

ماکوان: نووسەری پیشە نییە، نووسەری شعور، سۆز، گریان، خەم و خەفەت، خۆشەویستی، هەست و نەست، جوانی و عیشقە، هەموو ئەمانە کە لە مرۆڤدا کۆبوویەوە دەیکات بە نووسەر، با کاتت زۆر لێ نەگرم و




وەڵامی پرسیارەکەت بدەمەوە، چوار پرسیارەکە لە وجوود دا کە وەڵامەکەی خۆشەویستی بوو ئەمانە بوون.

١. چ شتێک گرانبەها ترینە لەم بوونەدا؟

٢. ڕۆح چییە؟

٣. هاوکاریکردنی بەردەوامی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتر واتای چییە؟

٤. ئەو شتە چییە کە لە پێناویدا دەژین؟

هیوادارم نووسیبێتت، بەڵام ئەم چوار پرسیارە شیکاری دەوێت، ئەگەر کەسێک خۆی توانای قوڵ بوونەوەی نەبێت.

د. چالاک: دوای ئەوەی تۆم دابەزاند، ئازار و کاک فایەق داوای ژمارەی تۆیان کرد، نەمدانێ وتم با سەرەتا بە خۆت بڵێم.

ماکوان: زۆر ئاساییە، بەڵام باسی نەخۆشییەکە نەکەن لەگەڵمدا و هیچی تر، با کەسوکارم نەزانن.

ئەوکاتەی ئەم قسانەم لەگەڵ دوکتۆر چالاک دەکرد دایکم و پێشڕەوم بەجێ هێشت وتم با ئێوە ئیزعاج نەبن دەچمە دەرەوە.

د. چالاک: بێخەمبە پێیان دەڵێم.

ماکوان: دوکتۆر زۆر مەبەستمە کاتی نزیک بوونەوەی مەرگم بزانم، بۆ ئەوەی پلانێکم هەیە ئەنجامی بدەم، تکایە چەندی تر پێویستە بۆ پشکنینی نوێ بۆ ئەوەی بزانرێت، ئەنجامی نەخۆشییەکەم گەیشتۆتە کوێ؟

د. چالاک: من لە خۆمەوە هەستم وایە کە تۆ نامریت، بەڵکو دەبیتە هاوکاری من، بەهەرحاڵ دوای مانگێک بۆ دوو مانگ دەتوانیت لەهەمان جێگا پشکنین بکەین و خۆشم دێم لەگەڵت.



ماکوان: زۆرباشە دوکتۆر گیان شەوشاد و لەخزمەتام و ماڵئاواییمان لەیەکتری کرد، لەگەڵ ئەو دامخستەوە گەنم تەلەفۆنی کرد، دیار بوو کە لەباخەکە بووم چەند جار تەلەفۆنی کردبوو، تەلەفۆنەکەم داخرا بوو، وا ئێستاش کردی.

گەنم:کاکە خەسرەو چۆنی، ئەمڕۆ تەلەفۆنەکەت داخرابوو، زۆر هەوڵمدا پەیوەندیت لەگەڵ بکرم.

ماکوان: گەنم گیان ببورە لە سەیران بووم لەگەڵ هاوڕێکانمدا، زۆر ببورە.

گەنم: حەز دەکەم بێم بۆلات یان لە جێگایەک بایەکتر ببینین.

ماکوان: بەیانی دوای کاتژمێر ٩ لە نووسینگە دەبم ئەوکات کەس نایەت بۆلام وەرە لە نووسینگە بەیەکەوە دادەنیشین، باشە؟

گەنم: باشە کاکە گیان شەوشاد.

ماکوان: خوات لەگەڵ.

زۆر بە ئیشتیاقەوە قسەی لەگەڵ دەکردم، هەستم دەکرد زۆر خۆشم دەویست و ئێسک سوک و مەحبوب بوو، بەڕاستی خوشکێکی نازەنین و بەڕێز و ناسک بوو، زۆر زوو دەچووە دڵەوە.

دایکم چوو خەوت من و پێشڕەو لەحەوشە دانیشتبووین، لە پڕ نەبەز تەلەفۆنی کرد، کاکە شەوباش، خۆ شوکر سەلامەتی، کەوای وت پێشڕەو تەماشای کردم، وەکو بڵێی چیبووە؟

منیش وتم نەبەز گیان ئەرێ وەڵڵا زۆر سەلامەتم ئەمڕۆ لەسەیران بووم، تەلەفۆنەکەم داخستبوو دایکم و پێشڕەویش زۆر خەمیان بوو.

ئێستا لە ماڵەوەم و لەگەڵ پێشڕەوی برام دانیشتووم و تەلەفۆنەکەم کردۆتەوەو ئەویش گوێی لێتە و سڵاوی هەیە (لەترسا وام وت وتم نەوەک




قسە بدرکێنێت)، ئیتر باش بوو تێگەیشت، سڵاوی لە پێشڕەو کرد و وتی بەیانی حەزدەکەم بتبینم.

ماکوان: وەرە بۆ نووسینگە لەوێ دەبم، ماڵئاوایشم لەوکرد و تەلەفۆنەکەم داخست لەگەڵ پێشڕەو تا درەنگ دانیشتین و دوای ئەوە لێی خەوتین.

# گەنمی خوشکم و گەڵای دلاوەر

بەیانی لەو کاتەی دامنابوو نیوکاتژمێر درەنگ کەوتم لەچوونم بۆ نووسینگە، گەنم چاوەڕێی دەکردم، زۆر بەزەییم پیا دەهاتەوە وەکو چۆن لەگەڵ خوشکەکانی ترم قسە دەکەم ئاواش بەوم وت باوە گیان ببورە درەنگ کەوتم، جارێ وەرە ماچێکم بەرێ سەریم ماچ کرد کەهەست بە کەمی نەکات، وتم: نانت خواردوە؟

گەنم: نەوەڵڵا ئەم شەو لەخۆشیا نەخەوتووم کە وتت بەیانی وەرە بۆ نووسینگە.

ماکوان: گەنم گیان کاکت زۆر لادێیە، من بەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارە حەزم لە کەبابە، تۆزێک دادەنیشین و دوایی بەیەکەوە دەچین بۆ کەبابخانە، ناوی چەند کەبابخانەیەکم پێ وت و وتم بزانە من چەند لە خواردنی کەبابدا دیموکراسیم، فەرموو هەڵبژێرە بۆ کامیان بڕۆین.

گەنم: کاکە من بینینی خۆت و ناسینی تۆ بۆ من بایی هەموو دنیایە، پێم بڵێ من چی بکەم و چۆن ئێوە بناسم و لەگەڵتاندا بم؟

ماکوان: تەوقیتەکە لە بەرژەوەندی تۆ نییە، زۆر بەداخەوە بیرم بۆ ناکرێتەوە، نازانم چیت پێ بڵێم، باوە گیان من لە حاڵەتێکی زۆر دژوار و ترسناکدام، نامەوێت کۆڵت قورس بکەم، جارێ من و تۆ یەکتر بناسین دوای ئەوە شتەکانی تر ئاسان دەبێت.

گەنم: کاکە تۆ بۆ ئاوا خەمباری و زروفت بۆ دژوارە، بەخوا پارەم زۆرە و باوکم پارەی باشی بۆ بەجێ هێشتووین، چەندت دەوێت پارەت بۆ دێنم.

ماکوان: گەنم گیان من پێویستم بە پارە نییە، خۆزگە کێشەکەی من بەپارە چارەسەر بوایە، سوپاس بۆ خوا ئەوەندە پارە زۆرە سەروزیادە.




گەنم: سوپاس بۆ خوا کە پارەتان زۆرە، هەرچەندە بۆ من گرنگ نییە، دوێنێ باسێکی بچووکم لەگەڵ دایکم کرد بەڵام ناوی تۆم نەبرد، وتی بزانە کێیە دەیەوێت هەڵتبخڵەتێنێت، پارەکانی باوکت بەرێت.

کەوای وت زۆر تورە بووم، وتم: بەشیرینی دایکت بڵێ هێندەی توکی سەری جەمالی مێردی پارەمان هەیە، ئێمە بەحەڵاڵی پەیدامان کردووە، جەمالی مێردی دایکت بە نەوتی دزی ئەم وڵاتە لەگەڵ مەسولەکاندا پەیدای کردووە، ئاگام لێ بوو کە من تورە بووم گەنم ترسا، بۆیە هێواشم کردەوە وتم: گەنم گیان سەربەرزییە کە براکانت هەموو دەوڵەمەندن لە تۆش دەوڵەمەند ترن، جا هەرگیز سەردانەنەوێنیت و سەربەرز بە باشە؟

گەنم: سوپاس بۆ خوا، خوای گەورە ڕزقی زیاترتان بدات، کاکە خەسرەو ئەکرێت بزانم کێشەکەت چییە تا هاوکاریت بکەم؟

ماکوان: بەخوا زۆر قورسە کێشەکەم با باسی نەکەم، دوایی لە خەفەت خواردن زیاتر هیچت بۆ ناکرێت، با بەیەکەوە کەبابەکە بخۆین، نەوەک خەفەت نەهێڵێت نانت بۆ بخورێت، هەرچەندە من گوێ نایەمێ کەبابم دی هەموو خەفەتێک لەبیر دەکەم.

گەنم: کاکە با سوێندت نەدەم، پێم بڵێ وا خەریکە دڵم ئەتەقێت، ئەی مەگەر من خوشکت نیم؟

ماکوان: بەرێوەڵڵا خوشکمی و شانازیت پێوە دەکەم.

کەوام وت هەمو گیانی لەخۆشیدا پێدەکەنی.

گەنم: دەتوخوا پێم بڵێ.

ماکوان: باشە، تۆ دەزانی من لە ئەوروپا دەژیم، هاتومەتەوە و پرۆژەیەکم بەدەستەوەیە و دەمەوێت ئەنجامی دەم، لەپڕ پرۆژەکەم لێ تێکچووە بە پرۆژەیەکی تر، هەردووکیان پرۆژەن بەڵام ئەمیان بۆ دنیاو



ئەویتریشیان بۆ قیامەت، تۆ کە خوشکی دڵسۆزی منیت بۆکامیان کار بکەم باشە؟

گەنم: وەی بەخوا لەو قسەیەت تێناگەم، پڕۆژەی چی و قیامەتی چی، کاکە من دەزانم تۆ ئیسلامیت، بابە جەمال باسی کردی وتی کوڕێکی ئیسلامی زیرەکە، بەڵام ئەگەر لەبەر ئەوەیە من حیجاب نیم بەخوا ئەوەش دەکەم لەبەرخاتری ئێوە، بەڵام وردە وردە.

ماکوان: بەدڵنیاییەوە هەموو خوشکەکانی ترت داپۆشراون واتا هەموو سەرپۆش ئەدەن بەسەریاندا وەکو تۆ ئەم جۆرە جلانە لەبەر ناکەن، هەڵبەت من بەزۆر پێت ناکەم دەمەوێت خۆت بە ئیمان و یەقین ئەنجامی بدەیت، ئەگەر بۆ منی ئەکەیت خۆ من خوا نیم، پەنا بەخوا، خوا داوات لێدەکات.

گەنم: ئەگەر ئەوە کێشەکەیە و دژوارە ئەوا من هەر ئێستا دەچم جلی موحەجەبە دەکڕم و دەیپۆشم.

دیسان هەڵسام سەریم ماچ کرد، ئەویش دەستی منی ماچ کرد.

ماکوان: خوشکە بچکۆلەکەم، بەتەمام لەمانگی داهاتوو یان دوو مانگی تر یان زیاتر لە دوو مانگ سەفەرێک دەکەم و بەجێت دەهێڵم.

گەنم: ئێ خۆ هەر دێیتەوە، بۆ هەمیشەیی لە ئەوروپا نابیت.

ماکوان: گەنم گیان من بەتەمام بمرم، نەخۆشی سەرەتانیی مێشکم هەیە، لە کەسوکارم ئێستا تەنها بە تۆم وتووە کەسی تر نایزانێت.

چاوی زەق بوو بەدیارمەوە...

گەنم: گاڵتە دەکەیت؟

ماکوان: وەڵڵا گەنم گیان حەقیقەتێکی زۆر تاڵ و تفتە، لەبەر ئەوە لە ئێستادا چارەسەرم لانییە یان با بڵێم نازانم چۆن دەست پێ بکەم، منیش




هەمووی هەفتەیەکە زانیومە، ئەو ڕۆژەی کە یەکترمان دی لەسەر گۆڕی باوکم هاتبووم دەردە دڵی لا بکەم، ئیتر سوپاس بۆ خوا یەکترمان دۆزییەوە.

گەنم: ئەی باشە چی بکەین، من چیم بۆ دەکرێت، ئەی دوکتۆرەکان ناڵێن چارەسەری هەیە؟

باسەکەم بە وردی بۆ گێڕایەوە ئیتر کە وتم هەروا دەمێنمەوە، گەنم فرمێسک بە چاویەوە نەدەوەستا، وەکو منداڵی بچووک دەگریا.

ماکوان: لەبەر ئەو هۆکارە کاتێکم بدەرێ تا بزانم چۆن دەست پێ بکەم بۆ ناسینی تۆ و خوشک و براکانی ترت.

جا ئێستا هەڵسە بابڕۆین کەبابەکەمان بخۆین.

گەنم: بەخوا من هیچم پێ ناخورێت و ناتوانم.

ماکوان: بەخوا دادە گیان من هەموو چەند مانگێکم ماوە، درێغی لە کەباب خواردن ناکەم، تۆ مەیخۆ من بەشەکەی تۆش دەخۆم.

گەنم: خۆزگە هەر نەمناسیتایە، ئەوەندی تر خەفەت چوو بەدڵما.

ماکوان: گوێی مەیەرێ ژیان گریان و پێکەنینە، خۆشی و ناخۆشییە، لەنێوانیاندا یاری دەکات، ئیتر ناونراوە بە دنیا وشەی دنیاش واتا زۆر زۆر نزم.

ئەوەندەم نەزانی نەبەز بە جلی سەربازییەوە خۆی کرد بە ژورا، منیش کردم بە گاڵتەو وتم نەموت بابڕۆین بۆ کەباب خواردن، ئەوە تیمساحێکی تریش پەیدا بوو.

نەبەز لەمن زیاتر حەزی لە کەباب و گۆشت خواردن بوو، نەبەزم ناساند و وتم ئەمە گەنمی خوشکمە.

نەبەز: وەڵڵا خۆشحاڵ بووم بە ناسینی گەنمی خوشکمان، مامە خەسرەو هەمووی بۆ باسکردووم.



دەستی برد تەوقە لەگەڵ نەبەز بکات، نەبەزیش سەیرێکی منی کرد و وتی مامە خەسرەو دەڵێت تەوقە حەرامە، هەرچەندە من برای تۆم، بەخوا لەگەڵ سەیرانی خوشکی من تەوقە ناکات کە لە خوشکەکانی خۆی زیاتری خۆش دەوێت، جا با خەسرەو بۆڵە بۆڵ نەکات و کەبابەکەی پێ بکڕین، ئەی بۆچی دەگریت؟

گەنم: کاک نەبەز بۆ کاکم دەگریم، نەخۆشە.

نەیوێرا ناوی نەخۆشییەکە بڵێت، دایەوە گریانێکی بەکوڵ.

نەبەز: خوای گەورە شیفادەری بێت، ئیتر قەزاو قەدەری خوای گەورەیە، ئێمە چیمان پێ دەکرێت لەخزمەتیدا دەبین و درێغی ناکەین.

ماکوان: ئەوەی وتم بە قسەم دەکەن؟

نەبەز و گەنم: بەیەکەوە وتیان بەدڵنیاییەوە.

ماکوان: دەی با بڕۆین بۆ کەباب خواردن.

نەبەز: دەڕۆم بۆ دەوام دوای کاتژمێر ٣ی دوانیوەڕۆ دێمەوە لات، خواحافیزیم لەو کرد و لەبازاڕ گەڕاینەوە بۆ نووسینگەو کەچووم دوو کوڕی ڕۆژنامەنووسی هاوکار لەوێ بوون، بەگەنمم وت هیچ باس مەکە، باشە؟

گەنم: باشە.

لەوێ سەرقاڵی گفتوگۆ بووین لەگەڵ هاوڕێیانی ڕۆژنامەنوس و ستافی گۆڤاری نوێی بزاڤ، لەگەرمەی گفتوگۆدا بووین دلاوەر و گەلاّم بینی لەبازاڕەکەدا، زۆر ترسام بێنە لام و ئاشکرای بکەن کە نەخۆشم و بڵاوبێتەوە، هەرچەندە من خەموخەفەتی کەسوکاری خۆم بوو، دەمویست تا کاتی مەرگم هیچ نەزانن بە پەلە چوومە دەرەوە بۆ لایان و ئەوان نەیانزانی کامە نووسینگەی منە لە بازاڕی ڕەشەمۆڵ نهۆمی دووەم








نووسینگەی بزاڤ لەسەر ڕوکن بوو دواوە پێشەوەمان لێ دیار بوو کەناو بازاڕەکەدا، چوومە لایان وتم: ئەوە چی ئەکەن لێرە؟

دلاوەر: وەڵڵا کاک ماکوان هاتووین بۆ لای تۆ، دوێنێ فەرموتان نووسینگەکەتان لێرەیە، لەگەڵ گەڵا حەزمان کرد سەردانت بکەین.

ماکوان: یاخوا بەخێر بێن، بەڵام با کەس نەزانێت کە نەخۆشم لەئێوە زیاتر کەس نازانێت.

دلاوەر و گەڵا وتیان خەمت نەبێت کاک ماکوان جا چۆن قسە دەکەین.

ڕۆژنامەنووسەکانی هاوڕێم زانیان میوانی تایبەتم هەیە، هەموو هەڵسان ڕۆشتن، ئەوەی کە مایەوە گەنم و گەڵا و دلاوەر بوون، هەستم کرد دلاوەر قسەی تایبەتی هەیە بۆ من بۆیە ناچار بووم بەهەردوکیانم وت ئێستا ئاساییە دەتوانین بەئارەزووی خۆمان قسە بکەین، ئەمە گەنمە خوشکمە، ئەم خوشکەم هەموو شتێکی من دەزانێت.

دلاوەر زۆری لا سەیر بوو چۆن دەبێت خوشکی من بێت و بەو شێوەیە جلوبەرگی پۆشیبێت! هەڵبەت هیچی نەوت بەڵام لە دەموچاویدا ئەوەم خوێندەوە، هەرچەندە من بۆم نییە بەزۆر حیجاب بەکەس بکەم ئەگەر خوشکەکانی خۆشم بن لە دایک و باوکم، بەڵام دەتوانم ئامۆژگارییان بکەم و هاوکاریان بم تا بڕوا دەکەن بە ئەنجامدانی ئەو کارە، دەنا ئەوەی کە ئافرەتە مادام حوکمی ئیسلام لە سیستەمەکەدا نییە، تەنها ئامۆژگاری و قسەی خێرمان لەسەرە بۆ خەڵکی بەگشتی.

دلاوەر: کاک ماکوان؛ من و گەڵا بۆ پرسوڕایەک هاتووین بۆلای جەنابتان، ماوەی ٦ مانگ زیاترە لەگەڵ گەڵا بڕیاری زەواجمان داوە، بەڵام لەتەرەفی هەردوولا ڕێگر هەیە بەتایبەت لای منەوە.

ماکوان: ڕێگرییەکان چین؟





دلاوەر: من مانگانە ٤٠٠ هەزار دینارم هەیە لەسەر مۆلیدە کار دەکەم، گەڵاش ٣٥٠ هەزار دیناری هەیە لەفەرمانگەی ئاووئاوەڕۆ دامەزراوە، دەشێت موچەکەی زیاد بکات، چونکە لەوێ تازە دامەزراوە بۆیە ئەوەندە موچەی هەیە.

ماکوان: ئەم موچەیە خراپ نییە، ماڵی پێ بەڕێوە دەچێت، کێشەکە لەکوێدایە؟

گەڵا: کێشەکە لە نەخۆشییەکەی تێمەدایە، ماڵی هەردولا دەڵێن باچاک ببنەوە.

دلاوەر: کاک ماکوان ژیان و مردن بەدەست خوایە، خۆ ئەگەر بمرین لانی کەم ئاواتێکمان هاتۆتەدی.

کەوایوت زۆر کاریگەری لێکردم.

ماکوان: خوای گەورە تەمەنتان درێژ بکات و ژیانێکی پڕ کامەرانی بەسەر بەرن، قەدەری خوای گەورەیە کەس لێتان تێنەگات من باش لێتان تێدەگەم، جا داواکاری لە من چییە؟

دلاوەر: من و گەڵا دوێنێ شەو زۆر قسەمان کرد بەیەکەوە، بڕیارماندا کە تۆ ڕێگامان بۆ دابنێیت و خۆمان بڕیارمانداوە دەمانەوێت پرسیش بە تۆ بکەین.

ماکوان: خۆشحاڵ دەبم بزانم و دڵنیابن لەوەی ئەوەی بەمن بکرێت درێغی ناکەم.

دلاوەر: کاک ماکوان داوا دەکەم لەیەکترمان ماره بکەیت تا ببینە حەڵاڵی یەکتر و ئیتر گوێ بەکەسوکار نادەین.

ماکوان: جا ئەمە چۆن دەبێت، نەشەرع و نەعورف پێی ڕازی نین و نابێت، من کاری وا چۆن دەکەم، پاشان کێ ئەو مافەی دا بە من هەڵسم بەو کارە.






دلاوەر: ئەی کە من و گەڵا ڕازی بین و هەردووکمان بەدوای ژیان و خانەوادە و خێزان دروستکردندا بگەڕێین ئێ خۆ بەدوای کاری خراپەوە نین بۆیە ئێمە هەردووکمان تەمەنمان لەسەرو ١٨ ساڵەوەیە لەڕووی یاساییەوە هیچ کێشەیەک ڕوو نادات، ئێمە بەفەرمی دەچینە دادگاو دەتوانین شاهیدیش پەیدا بکەین، بەڵام دەمەوێت لەڕووی شەرعەوە کارو پرۆسەکە ئەنجام بدەین.

ماکوان: ئەی بۆ نەچوونە لای مەلایەک یان مامۆستایەکی ئایینی ئەو کارەتان بۆ ئەنجام بدات؟

دلاوەر: چووین داوای وەلی ئەمر دەکەن، ئێ من کاکم ڕازی نییە و گەڵاش دایکی ڕازی نییە، بەڵام باوکی ٥٠٪ ڕازییە لە ٥٠٪کەی تریشی ئەڵێ لە ئێستادا توانای دروست کردنی ماڵو خێزانتان نییە.

ماکوان: ئێ کوڕی باش تۆ ئەتەوێت من لەم بەینەدا پیاو خراپ بکەیت، ئەو مەلا بەڕێزانەی کە داوای وەلی ئەمریان کردووە کارەکەیان ١٠٠٪ شەرعییە و دروستە، ئەی باشە خوا نەخواستە تۆ و گەڵا لەیەک جیابوونەوە ئەگەر باوک و دایکی گەڵا ڕازی نەبوون ئەی دوایی گەڵا چی بکات، بڕواتە لای کێ؟ ڕازی دەبێت لە شەڵتەر و سەرجادە بێت.

دلاوەر: ئاخر کاکە ماکوان هەرگیز ئەو کارە ڕوونادات، چۆن گەڵا ومن لەیەک جیادەبینەوە؟

ماکوان: نازانین کەسمان زانستی پەنهانمان نییە (عیلمی غەیب) باسی ئەگەر دەکەین، ڕوکنی زەواج بەتایبەت لەمەزهەبی شافیعی و یاسای عێراقی باری کەسیایەتی دەبێتە وەلی ئەمر و شاهید و ئامادە بن ، ئەم مەراسیمە دەبێت ئاشکرا بێت بەنهێنی ناکرێت، خۆ ئێمە لەوڵاتی میر نین تا زەواجی عورفی بکەین، دەبێت عورفی بێت و شەرعیش بێت ڕوونە؟

دلاوەر: بەڵی ڕوونە، بەڵام ڕێگا چارە چییە؟ توخوا هاوکاریمان بکە.



ماکوان: ڕێگا چارەی تر زۆرە، دەتوانین لەڕێگای ترەوە هەوڵبدەین، ڕاستە ئێمە بەتەمای مردنین و سەرەمان بۆ مردن گرتوە بۆ ناو گۆڕ، بەڵام هیواو ئومێد و خۆشەویستی لەسەرووی هەموویەوە تەوەکولمان لەدەست داوە، چەندە دەرگاو پەنجەرەی ماڵەکانمان واڵا بکەین بە شەوو بەڕۆژ ئەوەندە تیشکی خۆر ماڵەکانمان ڕووناک دەکاتەوە، تۆ و گەڵا تەنها یەک پەنجەرەتان واڵا کردووە، تیشکی خۆر یان شەوقی مانگ حەتمەن بە کزی دێتە لاتان، با دەرگاو پەنجەرەکان هەمووی بخرێنە سەرپشت خوای گەورە بۆ خۆشەویستی نێوان دوو کەس بەڕاستگۆیی و پرنسیپی عیشق بۆ هاوسەرگیری زۆر کار ئاسانی دەکات.

ئاگام لە گەڵا بوو زۆر خۆشحاڵ بوو، پێشتر هەر سەری داختسبوو کە من ئەو قسانەم بۆ کردن زەردەخەنە گرتنی و پێکەنی.

دلاوەر: هیچ بیرۆکەیەکت هەیە؟

ماکوان: لەئێستادا نا، بەڵام دڵنیام خوای گەورە دەستمان لێ بەرنادات، ئەگەر تەرەفی خوا بین و خۆشەویستییەکەتان لەچوارچێوەی پرنسیپی شەرع دا بێت.

گەڵا: سوێند بەخوا کاک ماکوان دلاوەر دەستی بەردەستم نەکەوتووە.

ماکوان: بەدڵنیاییەوە هەروا دەبێت، ئێوە خەڵکی ئیماندارن گومانم نییە.

دلاوەر: باشە کاک ماکوان بۆیە تۆ گەڵا مارە ناکەیت لەمن دەترسی من لێی جیابمەوە؟

ماکوان: من ناترسم، پاشان کاری من نییە، دوای ئەوە من تەنها ئەوەم بەنموونە هێنایەوە، هۆکاری تر زۆرە کە دەبێت هەردوو خانەوادە ڕازی بن، نموونەیەکی تر ئەگەر خوانەخواستە تۆ مردی گەڵا چیبکات، دوایی دایکی و باوکی دەڵێن بەقسەی ئێمەت نەکرد حەقمان بەسەرتەوە نییە، پاشان یان زیندانی کرایت ئەی بیرتان لەوە نەکردۆتەوە کە سبەینێ




منداڵتان بوو براکەی تۆ مامیانە و باوکی گەڵا باپیریان...هتد، دلاوەر گیان هەروا ئاسان نییە بیری لێ بکەیتەوە دەیان هۆکاری تریش پێم خۆش نییە هەرزەکارانە بیربکەیتەوە.

گەڵا: من لەگەڵ قسەکانی کاک ماکواندام، با جارێ پەلە نەکەین و زیاتر بیری لێ بکەینەوە.

دلاوەر: بەڕوویەکی گرژەوە، دەیباشە چۆنتان پێ باشە وادەکەین.

ماکوان: دلاوەر گیان دەزانم لەچ حاڵەتێکی دژواردایت، هەست بەتۆو گەڵا و خۆشم دەکەم، براکەم دڵنیابە خوای گەورە چاکتری بۆ داناوین، بەومەرجەی لەڕێگا لانەدەین و بەرەو ناونیشانی خوا بڕۆین، هیچ شتێکمان لێ ون نابێت، ئەی تۆ دەڵێی چی گەنم؟

گەنم: وەڵا کاکە تۆ هەرچی بڵێیت قسەکانی تۆ تەواوە.

ماکوان: ئاخر لەبەر ئەوەی من براتم بۆیە وا دەڵێیت (هەموو دەستمان کرد بە پێکەنین).

دلاوەر: کاک ماکوان گەنم خان خوشکی خۆتە؟

ماکوان: بەڵی قابیلە خوشکی دراوسێکەمان بێت، ١٠٠٪ خوشکی خۆمە و بەقەدەر هەردوو چاوم خۆشم دەوێت، گەڵا و و دلاوەر ماڵئاواییان کرد و نوێژی نیوەڕۆ بوو بە گەنمم وت من دەڕۆم بۆ مزگەوت نوێژ دەکەم و دێمەوە، هەرکەس هەواڵی پرسیم بڵێ دوای ١٥ خولەکی تر دێتەوە.

گەنم: باشە.

لەوکاتەدا من ڕۆشتبووم بۆ نوێژ پێشڕەوی برام خۆی کردبوو بە نووسینگەدا و بە گەنمی وتبوو خەسرەو لەکوێیە، ئەویش زانیبووی شێوەمان زۆر لەیەک دەچێت خۆی پێ نەگیرابوو دەستی کردبوو بە گریان، زانیبووی ئەویش برایەتی، بەڵام هیچی نەوتبوو، کە هاتمەوە پێشڕەو لەسەر پلیکانەکانی نهۆمی دووەم وەستابوو، وتی ئەوە کێیە هەر چوومە





ژورەوە هەواڵی تۆم پرسی دەستی کرد بە گریان، پێم وت خێرە بۆ دەگری کەچی دەڵێت تۆ زۆر لەکاک خەسرەو دەچیت، منیش وتم خەسرەو برامە، لەترسا هاتمە دەرەوە، وتم نەوەک شتێک ڕووبدات، بەڕاست ئەوە کێیە؟

ماکوان: کچێکی ڕۆژنامەنووسە زۆر عاطفیە و شاعیریشە منی وەکو برای خۆی خۆش دەوێت، سۆزدارییەکەی گرینۆکی کردووە، وەرە با بڕۆینەوە بۆ نووسینگە.

پێشڕەو: نایەم ئیشم هەیە، هەر بۆ ئەوە هاتم پێت بڵێم زەویەکەت پارەی باش دەکات هەواڵم بۆ زانیت ئەم بەیانییە.

ماکوان: باشە دەستت خۆش بێت.

ئەو ڕۆشت و چوومەوە بۆلای گەنم، وتم بۆ گریاویت؟ پێشڕەوت ترساندوە.

گەنم: بەخوا زانیم بەڵام خۆ هیچم نەوت و نەیزانی بۆچی دەگریم، خێرا چووە درەوە زۆر ترسا خۆشم زانیم، بەڵام چیبکەم من خۆم بۆ نەگیرا.

ماکوان: تاکەسی تر نەهاتووە باسی خۆتم بۆ بکە، باسی خۆت و ئاژداو ئابادتم بۆ بکە.

گەنم: یەکەم شوکردنی دایکم لەگەڵ باوکمان بووە، پاشان کە من دوو ساڵان بووم باوکمان کۆچی دوایی کردووە.

ماکوان: کۆچی دوایی نەکردووە، باوکمان کوژراوە، بەڵام تۆڵەی سەندراوەتەوە.

گەنم: من نازانم چی بووە بەڕاستی دوێنێ شەو لەگەڵ دایکم و بابە جەمال بوو بەشەڕم داوای وێنەی باوکمم کرد نەیاندامێ، دایکم بێجگە بابە جەمال پێشتر شویەکی تری کردوە.

ماکوان: ماشاءالله واتا بە جەمالەوە سێ دانە، وایە؟



گەنم: بەڵێ؛ بەڵام هاوسەری دووەمی بە ڕووداوی هاتوچۆ مردووە، کاتێک کە من چوومە زانکۆ لەوێ وانەیەکمان هەبوو لەباسی کۆمەڵناسیدا، باسی پاراستنی خێزانی کۆن دەکات کە هەمیشە تەڕەفی باوک خێزان دەپارێزێت، زۆر کاریگەری هەبوو لەسەرم ئەو باسەی کە خوێندمەوە کەسێکە لە ساڵی ١٩٩٩دا مردووە ناوی (ئاشلێ مێنتاجۆیە).

ئیتر لە ساڵی یەکەمەوە بووە خولیای مێشکم دەبێت بزانم باوکم کێیە و چی بووە، هیچ لەبارەیەوە نازانم، تەنانەت دایکم دەڵێت زۆر دەوڵەمەند بووە دوو ساڵ بەدزییەوە ئەوی هێناوە، کەم لای دایکم ماوەتەوە زیاتر لای ئێوە بووە دەکرێت من بڵێم تۆزێ باسی باوکم بۆ بکە؟

ماکوان: پێش ئەوەی باسی باوکم بکەم (ئاشلێ) ئەو قسەیەی نەکردووە، ئەوە قسەی زانایەکی ئیسلامییە بەناوی ئیبن خەلدون خەڵکی قەیرەوانە و لەتونسی ئێستا بووە، (ئاشلێ) جولەکەیە و لەخاکی فەڵەستین لەدایک بووە لە ١٩٠٥ و لە ١٩٩٠ خۆمان خۆش مردووە.

هەر ویستم پێی موعجیب نەبیت، دەی وتەکەی ئیبن خەلدون دەڵێت: (لایمکن أن نتخیل الإنسان مهما کان تاریخه بدون وجود عاقلة تحمیه)

گەنم: تا ئێستاش لەو (عاقلة) تێنەگەیشتووم کە لە زانکۆ مامۆستا بۆی باس دەکردین.

ماکوان: عاقلة واتا پەیوەندی خێزان لەڕێگای باوکەوە، یان پاراستنی خێزان لەڕێگای نەوەکانی باوکەوە، بۆ پیاو حەز لەبوونی کوڕ دەکات، چونکە پارێزەری ناو خێزانەکەی دەبێت، هەر پیاوێک کوڕی نەبوو خێزانی تیا دەچێت، واتا هەڵگری ناوی خێزانی نامێنێت، بەواتایەکی تری کۆنی عەرەب ئەویش مانای دەمارگیری خێزانی و عەشیرەتگەراییە، ڕوونە؟

گەنم: تێگەیشتم، بەس واز لەوە بهێنە باسی باوکم بۆ بکە.

ماکوان: باوکمان پیاوێکی ناوداری شاری پێنجوێن و ناوچەکانی سلێمانی و بەگشتی پیاوێکی سیاسی و نووسەرێکی بەتوانا و وەرگێڕێکی

باشی زمانی فارسی و عەرەبی بووە، پێشمەرگەی یەکێتی بووە، داستانی زۆری تۆمار کردووە ناوی لەلاپەڕەکانی مێژووی شۆڕشی نوێدا زۆرە، پیاوێکی کۆمەڵایەتی و ڕۆح سوک بووە، زۆر وریا بووە لەکاری بازرگانی و خۆشەویستی پێشمەرگە و ناو خەڵک بووە.

لەم قسانەدا بوون مۆبایلەکەی زەنگی لێدا و وەڵامی دایەوە دایکی بوو زۆر قسەی ناشرینی پێوت، کە گوایە لەبەیانی زووەوە چووەتە دەرەوە بۆ نەگەڕاوەتەوە.

گەنم: دایکە لای کاکم دانیشتووم، ئەوەی کە بۆم باس کردنی ناوی کاکە خەسرەوە، نەچووم بۆ هیچ شوێنێك لای ئەو دانیشتووم ئەگەر پێت خۆشە قسەی لەگەڵ بکە.

تەلەفۆنەکەی دایە دەستم و منیش بە ڕێزەوە وتم شیرین خان السلام علیکم، گەنم لای منە لە بەیانی کاتژمێر ۹، جەنابیشت دەزانیت من برای گەورەی گەنمم و مافی خۆمانە زیاتر بەیەکەوە بین دابنیشین و قسەو گفتوگۆی خێزانی خۆمان بکەین، هەمووی چەند ڕۆژێکە یەکترمان دۆزیوەتەوە و ناسیوە، جا تکایە بەئاسایی وەریبگرە و لای منەوە ئەگەر زۆر دڵت نائارامە ئێستا دەینێرمەوە خزمەتت.

شیرین خان زمانی گۆڕاو دایە دەست جەمالی مێردی وتی هاوسەرەکەم قسەت لەگەڵ دەکات، جەمال کاک خەسرەو دەتوانم جەنابت ببینم، من ناوم جەمال فەرەج-ە و لەکوێ دەڵێیت دێمە خزمەتان یان تۆ وەرە بۆ ماڵمان بۆ لای گەنم.

ماکوان: بەخۆشحاڵییەوە کاک جەمال گیان، لەخزمەتاندا دەبم ئەگەر تەشریف بێنن بۆ نووسینگەکەم باشترە، تا دوایی تەعاروف لەگەڵ شیرین خانیش دا دەکەم.

جەمال: بەخۆشحاڵییەوە لەکوێیە نووسینگەکەتان؟

ماکوان: بازاڕی ڕەشەمۆڵ نهۆمی دووەم....






جەمال: زۆر باشە بەیانی باشە بێم بۆلاتان، کەی لەوێ دەبن؟

ماکوان: تۆ هەرکات بێیت من لەخزمەتا دەبم، بەڵام ئەمڕۆ زیاتر ئیجازەمان بدەن لەگەڵ گەنمی خوشکم بەیەکەوە بین، بەشیرین خان بڵێ بێخەم بێت، تا دەرگایماڵەوە خۆم دەیگەیەنم.

جەمال: زۆر باشە کاک خەسرەو گیان، بەڵام بزانە سەیارەی هێناوە لەگەڵ خۆی گەنم؟

گەنم: سەیارەم پێیە.

ماکوان: بەڵێ وا دەڵێت هێناومە.

کە جەمال دایخستەوە بە گەنمم وت بۆ چەند سەیارەتان هەیە وا دەڵێت سەیارەی هێناوە؟

گەنم: ماڵمان لەچوارڕیانی سەرچنارو هەڵەبجەو ئەو ناوچانەدایە، ماڵەکەمان لە بینایەکی بەرزدایە ژێرەکەی پێشانگای سەیارەیە، جا من ئازادم کە کامە سەیارە لێدەخورم.

ماکوان: خۆشحاڵم کە ئاوا لە خۆشیدایت، دایکت زۆر توڕە دیارە، کە وتت لەگەڵ خەسرەوی برامم دەنگی گۆڕا وەک ئەوەی بترسێت، وابوو؟ جەمالیش زۆر بەئەدەبەوە قسەی کرد، چی لێ دەخوێنیتەوە؟

گەنم: کاکە من بۆ ماوەی چەند ساڵێکە تەنگم پێ هەڵچنیوون، هەر دەموت کوا باوکم؟ کوا کەسوکارم تا لەکۆتاییدا بابە جەمال وتی وەرە با بتبەمە سەر گۆرەکەی، ئیتر ماوەی دوو بۆ سێ ساڵ دەبێت هاتووچۆی گۆڕی باوکم دەکەم کەسم نەدەبینی تاکو خوای گەورە کردی تۆ هاتی و مۆبایلەکەت لەوێ لەبیرچوو.

بەڕاستی ماوەیەکی زۆر تووشی نەخۆشی نەفسی بووم، بەڵام ئەمڕۆ هێندەی دنیا خۆشحاڵم کە لەگەڵ تۆ بووم، کەچی هێزی ئەژنۆم نییە کە





تووشی ئەو نەخۆشییە بوویت، نازانم چی بکەم خەریکە دڵم ئەتەقێت، ئاخر چیت پێویستە لەپارە لەهەرچی دڵی خۆشمت ئەدەمێ.

ماکوان: قوربانی دڵت بم خوشکە ئازیزە بچکۆلەکەم، وەڵا کەناری خوشکم بزانێت لە بچووکی دەردەچێت ئیتر لێمان تورە دەبێت.

گەنم: خوای گەورە لێمان نەسێنیت.

زۆر قسەمان کرد لەگەڵ یەکتردا زۆر زانیاریم دەربارەی خێزانی خۆمان دایە گەنم و باسی ژیانی کورتی خۆم بۆ کرد و کە خێزاندارم و منداڵێکمان هەیە، لەم قسانەدا بووین نەبەز خۆی کرد بە ژوورا، بەچەپکێ گوڵەوە، دوای سڵاوکردن وتی گەنم ئەوە هەر لێرەی؟

ماکوان: لای برای خۆیەتی بۆ کوێ بڕوات، ئەی ئەم گوڵە چییە بەتۆ؟

نەبەز: دایکم بۆی ناردوویت، تۆ دەزانی دالیا کچی پوری منە و دایکم پوری دالیایە لەبیرت چۆتەوە؟

ماکوان: نا دەمزانی.

بەڵام بۆم گرنگ نەبوو، چونکە لەئەوەوە سەرەتایی ناسۆرو خەمەکانم بوو ئیتر لەوکاتەوە بەردەوامە، هەر خەمێک و ئازارێکم توش دەبێت خێرا دالیا دێتەوە پێش چاوم.

نەبەز: دایکم وتی ئەمڕۆ ڕۆژی لەدایک بوونی دالیایە، نەوەک خەسرەو لەبیری چوبێتەوە ئەو گوڵانەی بۆ بەرە، گوڵەکەی دایە دەستم و منیش دەستم کرد بە پێکەنین و دوو دڵۆپ فرمێسک لەچاوم داباری، نەبەز زانی پێکەنینەکەم گریانە.

گەنم: کاکە خێرە بۆ دەگری؟

ماکوان: ئەبێت ئەمڕۆ بڕۆم بۆ جەژنی لەدایک بوونی دالیا، لەبیرم کردووە.






ئەو فرمێسکانەی لە چاوم وەرین هەمووی یادگارین، جا نازانم دێن لەگەڵما یان نا؟ چونکە ئۆقرەم لێ براوە.

نەبەز: کاکە کاتژمێر چواری ئێوارەیە، لەبەر ئیزدیحام تاشەش دەرناچین، ئێ خۆ بەپێش نارۆین بیخەرە بەیانی.

ماکوان: نا من هەر ئێستا دەڕۆم، دێن یان نا؟ با گەنم بڕواتەوە بۆ ماڵەوە.

گەنم: وەڵا منیش دێم بۆ ئەو جەژنی لەدایک بوونە.

ماکوان: ئێمە هەردووکمان دەڕۆین بۆ لای کچی پورەکەت کەچی تۆ نایەیت؟

نەبەز: بابڕۆین سەیارەکەی گەنم نزیکتر بوو لە ئەسحابە سپی پارکی کردبوو، بەسەیارەکەی ئەو ڕۆشتین، کە لێی خوڕی وتی بۆ کوێ بڕۆم، جەژنی لەدایک بوونەکە لەکوێیە؟

نەبەز: گەنم گیان لەسەرقەبرانە، بڕۆ بۆ گردی سەیوان.

گەنم: تەماشای من دەکات کاکە گاڵتە دەکات یان چی، بۆ کوێوە بڕۆم؟

ماکوان: گەنم گیان ڕاست دەکات جەژنی لەدایک بوونەکە لەسەر گۆڕی دالیایە، دابەزە سەیارەکە بدە دەست نەبەز با ئەو لێی بخوڕێت، ئەو دەزانێت چۆن دەڕوات.

گەنم: بەسەراچاو.

نەبەز بەرەو لای دالیا بردینی، دەمەو ئێوارەیەکی درەنگ بوو، سەیارەیەکی ئاسایش لەو ناوە دەگەڕا وەکو پاسەوان، دیاربوو بۆ پشکنین ڕووەو لای من وگەنم و نەبەز هاتن، دیار بوو خراپ حاڵی بونێک هەبوو لەوەی کە کاتەکەی ناوەختە و ئەم کچەمان لەگەڵدایە و ئێمەش دوو پیاو، ئیتر نەبەز ناسینی پرسیان خێرە کاک نەبەز؟ چەندە دڵم پڕ بوو بەڵام بە





قسەکەی نەبەز پێکەنیم کە پێی وتن هاتووین بۆ جەژنی لەدایک بوونی کچێکی پورم کە ساڵی ١٩٩٣ کۆچی دوایی کردووە.

من لەگەڵ گەنم ڕۆشتم و نەبەزم لای ئەوان بەجێ هێشت، دیار بوو نەبەز ڕووداو و چیرۆکەکەی بۆ باسکردبوون.

من گەیشتمە سەر گۆڕی دالیا و گوڵەکەم بۆ داناو دەستم کرد بە قسەکردن لەگەڵ کێلەکەیدا و وتم: چەندە خەمبارم بۆت ئەوەندەش لەخوای گەورە داواکارم کە لێت خۆش بێت بەو خۆکوژیەی کردت، کاتی من و تۆ کاتی نەزانی بووە، دوعای خێرم زۆر بۆ کرد و قورئانم بۆ خوێند، نەبەز وتی: کاکە بابڕۆین کات زۆر درەنگە لەبەر ئەو کچە، هەردووکیان دەترسان، شەو بەسەرماندا هات لەسەر گۆڕستان، واتا دنیا بەتەواوەتی تاریک بوو.

گەنم ئێمەی بردەوە بۆلای سەیارەکەی نەبەز و وتم گەیشتیتە ماڵەوە تەلەفۆنم بۆ بکە، ئەو ڕۆشتەوە و من و نەبەزیش بۆ نانخواردن چووین بۆ کەبابخانەیەك لەتووی مەلیک، نزیک ماڵی هەردوولامان.

نەبەز: ماکوان تۆ بڕوات بە گەنم هەیە؟

ماکوان: ئەی بۆ بڕوام پێی نییە؟ تۆ چی دەبینیت؟

نەبەز: نازانم باسی جەمالت کرد وتت کەوا شتتان لەسەر نووسیووە، ئەڵێم نەوەک فێڵ بێت.

ماکوان: ئەگەر بەناوی خۆشەویستی و کاری بێماناوە بهاتایە قسەکەت ڕێگای تێدەچوو، بەڵام ئەو داماوە دەڵێت خوشکتم پاشان جەمال تا ئەم ساتەوەختەش نازانێت کە من برای ئەوم، ئەوانیش دیاربوو تووشی شۆک بوون، ئینجا گەنم دەرچووی کۆلێژی کۆمەڵناسییە و زۆر ووریاو زیرەکە، ئەو جۆرە ئافرەتانە بەکار نایەن بۆ هەڵخڵەتاندنی خەڵکی بەگشتی.







نەبەز: ببورە خۆت باشتر دەزانیت تەنها مەبەستم تۆیە، هەر وتم حەزەری خۆت وەرگری، چونکە رووداوەکان هەمووی دەڵێی فیلمی هیندییە.

ماکوان: بەڕاستی هەمووی دەڵێی هیندیە، هیچی جێگای باوەڕ نییە، دەمخۆش خۆزگە لەخەوندا بوومایەو لەپڕ هەستامایە و هەمو ئەوەی کە ڕوویداوە خەوێک بوایە و هیچی تر.

نەبەز: بەخوا سورەی برام هەمووی خێری تێدایە، با بڕۆینەوە بۆ ماڵی ئێمە یان با بتبەمەوە بۆ ماڵی خۆتان.

ماکوان: نا، حەز ئەکەم بڕۆم بۆ جێگایەک هەر خۆم بەتەنها بم، هیچ شوێنێکی وا شک دەبەیت؟

نەبەز: بۆ هەر جێگایەک بڵێیت لەگەڵت دێم، بەس بانەچین بۆ سەرقەبران.

ماکوان: ئاقڵ من ئەڵێم بەتەنها بم، ئەگەر بڕۆم تۆ نایەیت، من خۆم ئەڕۆم.

نەبەز: ئێ بۆ حەزت بەوێیە؟

ماکوان: ئاخر دەمەوێت ڕابێم لەگەڵ گۆڕستاندا زۆرم نەماوە بڕۆم بۆ وڵاتی مردووەکان ڤیزەکەم حازرە.

نەبەز: ئەم شەو نا، بیخەرە کاتێکی کە.

ماکوان: کێ وتویەتی دەڕۆین بۆ ئەوێ، تۆ دەڵێیت من حەزم بە جێگایەکی تەنهایە، شک ئەبەیت؟

نەبەز: دەڕۆین بۆ ماڵی ئێمە بۆ ژورەکەی من.

ماکوان: دایکت ئەمخاتە گریان ئەم شەو یادی لەدایک بوونی دالیایە.



لەم قسانەدا بووین لەبەردەم کەبابخانەکەدا پیاوێکی ڕیش سپی، تەماشای وەجاخی کەبابەکەی وەستا حەسەنی دەکرد، منیش قسەکانم بڕی و خێرا ڕووە و ئەو مامە پیرەیە چووم زۆر خۆشەویستی چووە دڵمەوە دەستیم گرت و وتم میوانی منیت.

مامە پیرەکە: برا من پارەی کەبابم پێ نییە، ئەگەر بۆم دەکڕیت دەبمە میوانت، بەڵام دوایی کڵاو نەکەیتە سەرم.

ماکوان: ئەمە ٢٥ هەزار با لەگیرفانتا بێت، ئەگەر من پارەکەم نەدا خۆت بیدە باشە؟

لەگەڵمدا هات و داوای نەفەرێک کەبابم بۆ کرد، دوو کەبابی خوارد و دووکەبابی هێشتەوە و بانگی شاگردێکی کرد وتی ئەو کەبابەم بۆ بپێچەوە.

ماکوان: خۆت بیخۆ کەباب بەگەرمی خۆشە خوای گەورە ڕزقی خۆی هەر دەنێرێت، هەڵیمەگرە قوربان.

مامە پیرەکە: نا بۆ پیرێژنەکەی دەبەمەوە، گوناحە ئەویش دەمێکە کەبابی نەخواردووە.

ماکوان: خۆت بیخۆ بەو شاگردەم وتووە نەفەرێک کەبابی ترت بۆ دابنێ و بۆت بپێچێتەوە.

دەستی کردەوە بەنان خواردن، منیش وام ئەزانی هەموو دنیا هیی منە.

نەبەز: خۆ سوپاسێک و دوعایەکی خێریشت بۆ ناکات، تۆ تەماشایکە چۆن دەیخوات، بیخۆ بەلاشە.

خەریکبوو بکێشم بە دەمی نەبەزدا، بەڵام کێشام بە دەستیا و وتم من هیچم ناوێت، تەنها ئەمەوێت ئەو لە خۆشیدا بێت، من و تۆ تێروپڕمان خوارد بزانە تۆ بیری دایکت و سەیرانت بوو، بەڵام ئەو چەندە بەوەفا بوو بیری لای خێزانی بوو، ئەو زۆر لەمن و تۆ باشترە.






مامە پیرە دەستی کرد بە پێکەنین بەقسەکانی من و وتی: زۆرت چاندوە و کەمت دووریوەتەوە، ئەو ورگ زلەی هاوڕێت تەپوتۆزی زۆری لە سەر نیشتووە، بارانێکی بەخوڕ دابکات هەموو خۆڵەکە دەسڕێتەوە، بەردەکە جوان دەردەکەوێت، تۆش باخەکەت بەرهەمی هەیە مەهێڵە بسووتێت.

نەبەز: ئەمە لەشێت ئەچێت، بڕواناکەم ئەقڵی تەواو بێت، هیچی لێتێگەیشتی؟

ماکوان: هیچ تێنەگەیشتم، بەڵام بڕواناکەم ئەو قسانەی هەروا سادە بێت، هەڵسا بڕوات و دەستی کرد بە گیرفانیا ٢٥ هەزارەکەی دەرهێناو وتی نانەکەم خوارد بە زیادەوە ئەوە پارەکەت، وتم نامەوێت ئەویش هەڵبگرە بۆ خۆت، خستییەوە گیرفانی، تەنها وتی خواتان لەگەڵ، منیش خواحافیزیم لێکرد.

نەبەز: ئەو جۆرە کەسانە ئەوەیان پێناخۆشە وادەزانن تۆ گێلی و لەدوای وەرگرتنی پارەکە دوعایەکی خێریشت بۆ ناکەن.

ماکوان: کاکە بۆ ئەوەندە حەز دەکەیت خەڵک زەلیلت بێت، وەڵاهی من زۆر ئاسوودە بووم کە وەکو هاوڕێ و ناسراو مامەڵەی کرد، من و تۆ لەبەر خوا دەیکەین، ئینجا خوا عەفوت بکات خەڵک هەیە بە ملیۆن دۆلار دەبەخشێت لە پێناوی خوادا دوو نەفەر کەبابمان بۆ کڕیوە ئەم هەموو نازو منەت و فیزە چییە بیکەین بەسەریدا.

نەبەز: من مەبەستم خێرەکە نییە، بەڵام بەگەمژەمان دەزانێت، ئاگات لێ بوو پێی ڕابواردین، بەمنی دەوت بەردی خۆڵاوی و باران پاکت دەکاتەوە تۆش باخەکەت نەسووتێت.

ماکوان: ئەی بۆ نەڵێین یەکێکە لە ئەولیا و پیاوچاکانی خوا، ئەو قسانەی ئەو کردی من و تۆ ئەقڵمان پێ ناشکێت.



نەبەز: دەی مەیکە بە فەلسەفە بەسەرمانەوە بابڕۆین، دێیت بۆ ماڵی ئێمە، یان بۆ ماڵەوە؟

ماکوان: لێخوڕە بۆماڵی ئێمە، ئەڕۆمەوە بۆ ماڵ ماندووم دەمەوێت پشو بدەم.

کە هاتمەوە بۆ ماڵەوە باپیرم دانیشتبوو کەبابی دەخوارد، باوەشم پیا کرد وتی دابنیشە نانەکەت بخۆ، لەگەڵ دایکت و باجیت و منداڵەکان قسەم ئەکرد وتم خۆزگە خەسرەو بهاتایەتەوە بەیەکەوە بچووینایەتە دەرەوە کەبابێکمان بخواردایە، ئەوەندەی پێ نەچوو کوڕێکی گەنج لەدەرگای دا، هەموو وامان دەزانی تۆیت و میوانت لەگەڵدایە، بۆیە لەدەرگا ئەدەیت، کەچی ئەو کوڕە وتی کاک خەسرەو ئەم کەبابەی ناردووە بۆ باپیری و ئێستا خۆشی دێتەوە.

وتم بەخوا هەبێ ونەبێ تەلەفۆنەکەم لە گیرفانما دەستم بەری کەوتووە زەنگی بۆ ڕۆشتووە و گوێی لە قسەکانی من بووە بۆیە کەبابی بۆ ناردووم.

تووشی شۆک بووم ئەو چوار کەبابە بوو کە مامە پیرەکە داوای کرد بۆ خێزانی، کەچی وا باپیرم دانیشتووە دەیخوات، زوو زوویش باپیرم دەیوت چۆنت زانی من حەزم لەکەبابی وەستا حەسەنە لە توی مەلیک، هیچ تەفسیرێکم بۆ نەدەکرا هەر ئەوەندە وتم خۆم کەبابم خوارد حەزم کرد بۆ تۆشی بکڕم و بەگەرمی بیخۆیت.

دایکم: دەی ڕۆڵە با بۆ ئێمەشت بکڕیایە، ئەبێ بەدەمی باوکما بڕوانین؟

ماکوان: ببورە هەڵە بووم بەڵام کوا تۆ چەوری دەخۆیت؟ بۆ ئەم جارە لەخزمەتی هەموتان دەبم یان پێشڕەو دەنێرم کەباب بهێنێت بۆتان.

باپیرم: من خۆم بە پیاو دەزانم، هەر تۆ ئەمەت نارد پێشڕەوم نارد کەباب بۆ هەموویان بێنێت، ئێستا دێتەوە، ئەی چۆن خۆم بە پیاو دەزانم.

ماکوان: باشە قوربان مادام وایە دوو جار وتتان واتا من پیاو نیم.




باپیرم: با پیاویت بەس بەقەدەر من نا.

لەگەڵ باپیرم کەوتینە قسەی خۆش تا درەنگانێکی شەو زۆر بیرم دەکردەوە لەو ڕوویداوەی ڕوویدا، داخۆ چی بێت و کێ بووبێت؟ زوو زوو دەموت فێڵی باپیرم بووە، ئەو پیاوە پیرە هاوڕێی خۆی بووە، دوایش دەموت من تەمەنێک ژیانم کردووە لەگەڵیا هاوڕێ و کەسە نزیکەکانی دەناسم، ئەو پیاوە یەکەم جاربوو لەژیانمدا ببینم. قسەکانی زۆر سەیر بوو کەوتمە بیرکردنەوە لە قسەکانی، بە نەبەزی وت تۆ وەک بەردی خۆڵاویت و ئەگەر بارانی بەخوڕ لەسەر بەردەکە ببارێت ئەوا بەردەکە بەجوانی دەردەکەوێت تۆش ئاگات لەباخەکەت بێت مەهێڵە بسووتێت.

ئەم قسانە ئاسایی نەبوو، لەپڕ دایکم بانگی کردم وتی نەخەوتویت، منیش بۆ خۆشی وتم با لەگەرمەی خەودام.

دایکم: ئەگەر دەتوانیت وەرە خوارەوە ئەو ئایەتەم بۆ ناخوێنرێتەوە بۆم بخوێنەرەوە، بەڵکو دەمم پێی ڕابێت زۆر قورسە.

ماکوان: واهاتم، کە چوومە خوارەوە دایکم قورئانی دەخوێند لە سورەتی البقرة هەندێك وشەی تێدابوو بۆی نەدەوترا، منیش بۆم خوێندەوە دوو جار، کە سەیری ئەو ئایەتانەم کرد سەیر دەکەم هەمووی باسی حاڵەتی دانیشتنی من و نەبەز و ئەو پیاوە پیرە بوو!





﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِى كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّاْئَةُ حَبَّةٍ ۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦١﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ لَا يُتْبِعُونَ مَآ أَنفَقُوا۟ مَنًّا وَلَآ أَذًى لَّهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٦٢﴾ ۞ قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِّن صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَآ أَذًى ۗ وَٱللَّهُ غَنِىٌّ حَلِيمٌ ﴿٢٦٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُبْطِلُوا۟ صَدَقَٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ كَٱلَّذِى يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۖ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٌ فَتَرَكَهُۥ صَلْدًا ۖ لَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَىْءٍ مِّمَّا كَسَبُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٦٤﴾ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ كَمَثَلِ جَنَّةٍۭ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ فَـَٔاتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٦٥﴾ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ لَهُۥ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَأَصَابَهُ ٱلْكِبَرُ وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَآءُ فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَٱحْتَرَقَتْ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٦٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنفِقُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ۖ وَلَا تَيَمَّمُوا۟ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُوا۟ فِيهِ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿٢٦٧﴾ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦٨﴾ يُؤْتِى ٱلْحِكْمَةَ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِىَ خَيْرًا كَثِيرًا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٦٩﴾﴾ البقرة

واتە: نموونەی ئەو کەسانەی کە ماڵەکانی خۆیان لە پێناوی خوای گەورەدا ئەبەخشن بۆ بەرزکردنەوەی وشەی خوای گەورە لە جیهاد کردندا، وەکو نموونەی جوتیارێك وایە کە دەنکێك دانەوێڵە ئەڕوێنێ پاشان ئەو دەنکە حەوت گوڵ گەنم ئەگرێ، لە هەر گوڵە گەنمێکدا سەد دەنکی تیایە



واتە: ئەکاتە حەوت سەد، هێشتا خوای گەورە یەك بە حەوت سەد زیاتری دەکات، واتە: کەسێك ئەگەر دینارێك بکاتە خێر خوای گەورە بە حەوت سەد خێر بۆی ئەنووسێ تا زیاتریش خوای گەورە چەند قاتی ئەکات بە گوێرەی نیەتی ئەو کەسە، بە گوێرەی پێویستی ئەو کەسەی کە تۆ خێرەکەی پێ ئەکەیت، بەڕاستی فەزڵ و ڕەحمەتی خوای گەورە زۆر فراوانە و خوای گەورە زۆر زانایە ﴿٢٦١﴾ ئەو کەسانەی کە ماڵی خۆیان لە پێناو خوای گەورەدا ئەبەخشن، پاشان منەت ناکەن بەسەر ئەو کەسەی کە پێیان بەخشیوە و ئازاریشی نادەن بەوەی کە دەمدرێژی و قسەی پێ بکەن ئەمانە مادەم نیەتیان بۆ خوای گەورە بووە و منەتیان بەسەر ئەو کەسەدا نەکردوو ئازاریان نەداوە ئەجرو پاداشتی خۆیان هەیە لای خوای گەورە دوای ئەوەی کە مردیشن ترسیان لەسەر نیە بۆ داهاتوویان خەفەتیش ناخۆن لە ڕابردوویان لە دونیادا لەبەر ئەوەی خوای گەورە لە قیامەتدا باشتریان پێ ئەبەخشێ ﴿٢٦٢﴾ کاتێك کەسێك داوات لێ ئەکات ئەگەر بە وتەیەکی باش بەڕێی بکەی ئەوە باشترە، ئەگەر هاتوو زۆر ئیلحاحی کرد یان کە نەتدا پێی قسەیەکی نارێکی کرد لێی خۆشبی ئەمە باشترە لەوەی کە صەدەقەو خێرێك بکەی بەڵام پاشان ئازاری ئەو کەسە بدەی کە خێرت پێی کردووە، بەوەی قسەی پێ بکەی و دەمدرێژی بکەیت و جنێوی پێ بدەیت و قسەی ناشرینی پێ بکەیت و بیشکێنیتەوە، بەڕاستی خوای گەورە زۆر دەوڵەمەندە و زۆر بە حیلم و لەسەرخۆیە ﴿٢٦٣﴾ ئەی باوەڕداران ئێوە کاتێك کە صەدەقەو خێرێك ئەکەن صەدەقەو خێرەکەتان بەتاڵ مەکەنەوە بە منەت کردن بەسەر ئەو کەسەی کە خێرەکەتان پێی کردووە و بە ئازار دانی بەقسەو تانەو تەشەرو دەمدرێژی کردنە سەری وەکو کەسێك کە ماڵی خۆی ئەبەخشێ بەڵام مەبەستی ڕەزامەندی خوای گەورەو ئەجرو پاداشتی قیامەت نییە، بەڵکو بۆ ڕیایەتی بۆ ئەوەی کە خەڵك بیبینێ و مەدحی بکەن و وەسف و سەنای بکەن ئیمانی بەخواو بەڕۆژی دوایی نییە، نموونەی ئەم کەسە وەکو نموونەی بەردێکی لووسی گەورە وایە کە



خۆڵ و تەپوتۆزی پێوە بێت بارانێکی بەلێزمەی سەخت ئەداتە سەر ئەو بەردە گەورە لووسەدا کە ئەو بارانە بەلێزمە بەخوڕە لەو بەردە ئەدات هیچ تەپوتۆزو خۆڵێکی پێوە ناهێڵێ و پاکی ئەکاتەوە، بەهەمان شێوە ئەو کەسەی کە شتێك ئەبەخشێ بۆ ڕیایەتی لە قیامەتدا هیچ ئەجرو پاداشتێکی نامێنێ وەکو ئەو بەردە کە هیچی پێوە نەماوە، ئەوانەی کە منەت بەسەر خەڵکدا ئەکەن و ئازاری خەڵك ئەدەن ئەو ڕیابازانە لە ڕۆژی قیامەتدا ناتوانن ئەجرو پاداشت کۆ بکەنەوە یان وەری بگرن شتەکەشیان لە دەست چوو و ئەجرو پاداشتیشیان نەما، بەڕاستی خوای گەورە هیدایەتی کەسانێك نادا کە کافرو بێ باوەڕ بن ﴿٢٦٤﴾ نموونەی ئەو کەسانەی کە ماڵی خۆیان لە پێناو ڕەزامەندی خوای گەورەدا ئەبەخشن، نەفسی خۆیان دامەزراو و جێگیر ئەکەن و ڕائەهێنن لەسەر ئیمان و بەخشین لە پێناو خوای گەورەدا، چاوەڕوانی پاداشتن لە خوای گەورە نموونەی ئەم کەسانە وەکو نموونەی باخێك وایە کە جۆرەها داری تیابێ و لە شوێنێکی بەرزدا بێت بارانێکی بەخوڕو بەلێزمە بدات بەسەر ئەو باخەدا کاتێك بەرهەمەکەی دێت دوو قات بەرهەم دێنێ لەبەر ئەوەی شوێنەکەی بەرزو باش بووە و باران گرتویەتییەوە، ئەگەر هاتوو ئەو بارانە بە خوڕە بە لێزمەیەش نەیگرێتەوە ئەوە بارانێکی کەم و سووك و نەرم هەر ئەیگرێتەوە لەبەر ئەوەی شوێنەکەی بەرزە هەر سوود ئەبینێ، ئەمە نمونەیە بۆ مرۆڤی باوەڕدارە کە لە پێناو خوای گەورەدا ئەبەخشێ ئاوا خوای گەورە ئەجرو پاداشتی ئەداتەوە خوای گەورە زۆر بینایە بە هەموو ئەو کردەوانەی کە ئێوە ئەیکەن ﴿٢٦٥﴾ ئایا یەکێك لە ئێوە ئاواتەخوازە کە باخی هەبێ لە دار خورماو لە ترێ کە جۆگەلە ئاو بە ژێر ئەو دارانەدا بڕوات و لە هەموو بەروبوومێکی هەبێت، ئەو کەسە خۆی بچێتە ناو ساڵەوە و منداڵیشی هەبێ منداڵەکانیشی لاواز بن و نەتوانن خزمەتی باخ و بێستانەکەی بکەن تووشی بایەکی سەخت و گەردەلولێك بێت و ئەو گەردەلولە ئاگریشی تیا بێ و هەموو باخ و دارەکانی بەرهەمەکەی بسوتێنێ، ئەمە نموونەیەکە خوای گەورە بۆ ئەو کەسانە ئەیهێنێتەوە کە




ڕیابازن واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا چەندێ موحتاج و لاوازن کەس نییە سەریان بخات و ڕزگاریان بکات بەڵام هیچ شتێکیان نییە هەمووی لە دونیادا سوتا و خۆیان سووتاندیان بە ڕیا، یان نمونەی کەسێکی باشە دواتر خراپ دەبێت خوای گەورە بەم شێوەیە ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕوون ئەکاتەوە بەڵکو بیر بکەنەوە ﴿٢٦٦﴾ ئەی باوەڕداران لە پاکترین و حەڵاڵترین شت ببەخشن کە هەتانە، ببەخشن لەوەی کە لەزەویەوە بۆتانمان دەرکردووە لە بەروبووم و دانەوێڵە، لە کانزاکان و لەو خشڵ و زێڕو زیوانەی کە ئەیدۆزنەوە لەناو زەویدا بەڵام مەبەستان ئەوەنەبێ کە کام ماڵەی خراپە ئەوە ببەخشن خوای گەورە ئەوە قبوڵ ناکات لە کاتێکدا کە خۆتان ئەگەر ئەو شتە خراپەتان پێ بدرێ وەری ناگرن، ئەگەر لە بازاڕ بفرۆشرێ نایکڕن، مەگەر چاوتان بنوقێنن یان لە شەرما وەری بگرن، ئەنصاریەکان لە کاتی ڕنینی خورما لە نێوان دوو کۆڵەکەی مزگەوت خورمایان بە حەبلێك هەڵدەواسی و هەژارو موهاجرین دەیانخوارد جا پیاوی وا هەبوو خورمای خراپ و وشکی دەهێنا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند، لە پاش ئەوە باشترین جۆریان دەهێنا بزانن کە خوای گەورە زۆر دەوڵەمەندەو زۆر بێ پێویستە، زۆر حەمدو سەناو ستایش و سوپاسکراوە ﴿٢٦٧﴾ بەڕاستی شەیتان وەعدو بەڵێنی فەقیری و هەژاری بە ئێوە ئەدات و بەوە ئەتانترسێنێت بۆ ئەوەی کە نەبەخشن، فەرمانتان پێ ئەکات بە بەدڕەوشتی و خراپەکاری و چروکی و ڕەزیلی، بەڵام خوای گەورە وەعدو بەڵێنی لێخۆشبوون و فەزڵ و چاکەی خۆی داوە بە هەر کەسێك کە لە پێناو خوای گەورەدا ببەخشێ و جێی بۆ پڕ ئەکاتەوە و بەرەکەتی تێ ئەکات، بەڕاستی فەزڵ و ڕەحمەت و میهرەبانی خوای گەورە زۆر فراوانە و خوای گەورە زۆر زانایە ﴿٢٦٨﴾ هەر نەفەقەو خێرێك کە ئێوە بیکەن بۆ خۆتان یان بۆ غەیری خۆتان، یان هەر نەزرێك کە بیکەن خوای گەورە ئاگای لە هەموویەتی، ئەجرو پاداشتتان دەداتەوە ئەو کەسانەی کە زاڵم و ستەمکار بن بەوەی کە نەیانبەخشیێ یان نەزریان کردبێت و



نەزرەکەیان نەبردبێتە سەر هیچ پشتیوان و سەرخەریان نییە لە ڕۆژی قیامەت (٣٦)

ئەو شەوە زۆر دڵخۆش و ئارام بوم قسەی ئەو مامە پیرەیەو باپیرم و گەنم و هەمووی کاتی جوان و خۆش بوون.

بەڵام بەدوای ئەو قسەیەوە بووم کە وتی زۆرت چاندووە کەمت دوریوەتەوە. تەماشای خۆمم دەکرد وا هەستم نەدەکرد کەوا چاکەم زۆرتر بێت لە خراپە، لەبەر ئەوەی من خۆم باش دەناسم، بەڵام دەموت خوایە دەبێت ئەم پیاوە پیرە کێ بێت؟ چۆن ئەم کەبابەی هێناوە بۆ ماڵی ئێمەو چۆن بووە بە کوڕێکی گەنج و ناوی منی بە خەسرەو بردووە؟ لەکاتێکدا نەبەز بە منی دەوت ماکوان لەبەرچاوی ئەودا، بەدەم بیرکردنەوە و خەیاڵەوە خەوم لێ کەوت بە ئارامی خەوێکی زۆر خۆش و بێ پچڕان، بەدەنگی موکەبەرەی بانگی مزگەوتی عەلی کەمال خەبەرم بوویەوە.

چوومە دەرەوە ئارامی بلەی بەهارم بینی وتی بۆ کوێ دەچیت؟ منیش بۆ خۆشی وتم دەچم بۆ ژن مارە کردن، زانی گاڵتەی لەگەڵ دەکەم وتی وەرە دەچین بۆ مزگەوتێک نزیک قەسابخانە لەوێ نوێژ دەکەین و منیش دەڕۆم جگەر دەهێنم.

چووینە مزگەوتێک لەنزیک فولکەی کۆنی مامە ڕیشە، ئەگەر هەڵە نەبم بەو مزگەوتە دەوترێت خانەقای مەلا عەلی.

نوێژی بەیانیمان کرد ئارام وتی بەیەکەوە بڕۆین بۆ سەروپێ خواردن بۆ ژێر پردەکە، منیش خەریکی خوێندنی زیکرەکان بووم کابرای پیر لە ڕیزی پێشەوەی من بوو، چوومە تەنیشتی وتم ئەمناسیت؟ وتی: بەڵێ (عادل)یت!

وتم: نا خەسرەوم.







وتی: نا عادلی، ناوی خەسرەو خراپە بیگۆڕە، بەعەرەبی بە خاسڕەو دەڵێن عادل، تۆش ناوت لە خاسڕەوەو هاتووە، پێت ئەڵێن خەسرەو خۆشت باش دەزانیت خەسرەوی پەروێز نامەکەی پێغەمبەر ﷺ-ی دڕاند خۆت ئەو ناوە لابەرە.

وتم: ناوم ماکوانە، خەڵک پێم دەڵێن ماکوان کەس نازانێت من ناوم خەسرەوە

مامە پیرە: دەزانم، بەڵام ناوی عادل زۆر خۆشەو زۆر جوانە بۆتۆ گونجاوە.

ماکوان: ئەوە کێشە نییە، وەرە دەچین بەیەکەوە نان دەخۆینم، دەعوەتی منی باشە؟

مامە پیرە: نا، کەبابەکەی دوینێ زۆر چەور بوو ناتوانم.

لەم قسانەدا بووین ئارام هات وتی:ماڵتئاوا بێت چاوەڕیی تۆم درەنگە موشتەرییەکانم وەستاوەن خێراکە بابڕۆین.

ماکوان: تۆ بڕۆ من لەگەڵ مام حاجی دەبم.

ئارام: کوا مام حاجی؟

کە ئاوڕم داوە کەسی لێنەبوو، زانیم شتێک هەیە، بەڵام بۆم تەفسیر نەدەکرا، لەگەڵ ئارام ڕۆشتین بۆ سەروپێ خواردن، بەڵام من هەستێکی زۆر عەجیب و سەرسامم هەبوو، بۆ مامە پیرەکە. ئارام دەیوت بۆ مەشغوڵی ماڵت ئاوا بێت دایمە مێشکت مەشغوڵە.

ماکوان: بزانە پرسیمان ناوی چییە؟

ئارام: کێ؟

ماکوان: هیچ بابە نانەکەت بخۆ لەگەڵ خۆم قسە دەکەم، داوای مۆخم بۆ بکە بەڵکو تۆزێک مۆخی منیش باش بێت.



ئارام زمان ناخۆیت، خراپ نییە با تۆزێک زمانیشمان درێژ بێت.

ئارام منی هێنایەوە بۆماڵەوە، دیسان لێی خەوتمەوە تا نزیک کاتژمێر ١٠ی بەیانی، خەریکی شۆردنی دەموچاوم بووم لەجەڕەسی ماڵمان درا و دایکم چوو بەدەمیەوە، هەستم کرد کەسێکی فەقیرەو داویەتی لەدەرگا، دایکم وتی بەخوا مام حاجی پشتم تەواو نییە، مەگەر تۆ بێیتە سەرەوە پارەکەم لێ وەربگریت.

مامە پیرەکە" منێ شقاچم تەواو نییە، ناتوانم بە پلیکانەکاندا سەرکەوم، بە منداڵێکا بۆم بنێرە خوارەوە.

دایکم: خەسرەو، خەسرەو...

ماکوان: بەڵی

دایکم هاتە ژورەوە وتی: ئا ڕۆڵە ئەو هەزار دینارە بدە بەو پیاوە پیرە لەبەردەرگا وەستاوە ناتوانێت بێتە سەرەوە.

چوومە خوارەوە تەماشام کرد مامە پیرەی ناسراوی خۆمە.

مامە پیرە: نەموت ناوی خۆت بگۆڕە، دایکت هەر دەڵێت خەسرەو!

ماکوان: ئاخر مامە پیرە دایکم ٣٦ ساڵە دەڵێت خەسرەو، ناتوانم خێرا بیگۆڕم.

مامە پیرە: بۆ ئەوە هاتم پێت بڵێم دەرناکەویت لە زیکر و یادی خوا و پێغەمبەرەکەیدا، ئەوەش بزانە ناڕەحەتی بە زیکر و سڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لادەچێت، خەفەت مەخۆ ئومێدت بەخوا زۆر بێت لەو کاتەی کە خەریکە هیوات نامێنێت، ئەوکات چارەسەر دەست پێ دەکات، بارانی زۆر بە خوڕ لەئاسمان نایەت تا هەموو دامینی هەور لە زەوی نەدات و چڕ نەبێتەوە.

دایکم بانگی کردم وتی ڕۆڵە وەرە سەرەوە باچاکەت سارد نەبێتەوە، من هەر هەزار دینارەکەم بەدەستەوە بوو.





دایکم: ئەوە ئەو پارەیەت بۆ نەداوە بەو سواڵکەرە؟

ماکوان: لە ڕاستیدا من سواڵم لەو کرد، ئەو سواڵکەر نەبوو.

دایکم: ئەوە ئەڵێی چی؟

ماکوان: هیچ زیاترم دایە لەو هەزار دینارەی تۆ.

بەدیار چاکەی دایکمەوە خەیاڵم ڕۆشتبوو، ئەوەندەم کەوچک لێدابوو

دایکم: ڕۆڵە منیش و کەوچکەکەیش سەرمان گێژ دەخوات، چاکەت بخۆ.

لەم قسانەدا بووین نەبەز خۆی کرد بە ماڵدا، نان و چای نەخواردبوو، لای دایکم بەرچایی کردەوە بەمنی وت تۆ بەرچایی ناخۆیت تێر دیاریت؟

دایکم: ئارامی زاوام بردویەتی بۆ سەروپێخانە.

نەبەز: ئاها بۆیە یاری بە چاکەش دەکات، نەک تێر دیارە بەڵکو مڕە ئەونەی سەروپێ خواردووە.

ماکوان: ئەرێ نەبەز ئەگەر فەرشێک بکڕم بینێرمەوە بۆ نەرویج لەگەڵ خۆمدا ئەتوانی لە فڕۆکەخانە هاوکاریم بکەیت؟

نەبەز: جاخۆ من لە فڕۆکەخانە کار ناکەم، من سەربازم نەک ئاسایش و شورطە، دەوامم لە جێگایەکی ترە.

ماکوان: ئەی ترحێو دڵم خۆش بوو وام زانی لە فڕۆکەخانەیت، ئەی ئەو ڕۆژە چیت دەکرد لەوێ؟

نەبەز: ئێمە سەربازین، بەچواردەوری فڕۆکەخانەدا دامەزراوین و ئەو ڕۆژە جێگاکانمان دەگۆڕی.

ماکوان: باشە برا.



لەم قسانەدا بووین دایکم بەجێی هێشتین و داوام کرد لە نەبەز لەگەڵ سەروەری بەلوعە و تاڤانە ڕەش قسە بکات بزانین ئەم قسەیە چۆن کراوە و چی لەپشتەوەیە؟

نەبەز: بۆ ئەوە هاتم، ئەم سەگە چۆن ڕووی دێت تەماشای من بکات ئەوەندە بێ چاوو ڕووە دەڵێت تۆ لەگەڵ ژنەکەم خەوتویت و منداڵێکت لێی هەیە و دەیەوێت سوڵحم لەگەڵ بکات، کاکە من سوێندت بۆ دەخۆم کە شتی وا ڕووینەداوە و ئەسڵی نییە، بەڵام دەمەوێت پێش مردنم تۆڵەی لێ بسەنم.

نەبەز: کاکە هەموومان سەروەر دەناسین، پێویست ناکات کاتی خۆتی تێدا بەکارت بهێنیت.

ماکوان: برا من خۆی و دایکی و هەرسێ خوشکەکەی وبراکەشی باش دەناسم، بەڵام پێچاویەتییە من ئەوە تێناگەم، من نامەوێت لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانەدا نەک کێشەم هەبێت بەڵکو قسەوباسیان لەگەڵ بکەم، بەس تۆ بزانە لەم سەیرانەی زێوێ چی ڕوویداوە؟

نەبەز: ماکوان ئەو کاتە هیچت نەکرد، دڵنیایت؟

ماکوان: برا خۆ لەخوا نەترسم، لە ئێوە ناترسم، سوێند بەخوا هیچ لەنێوان من و ئەو ئافرەتە ڕووینەداوە، نازانم چاوێکم لێ داگرتبێت یان دوو قسەی خۆشم بۆ کردبێت، چونکە من ئەوکات خوا هیدایەتی دابووم تەنانەت موشروبیشم نەخواردەوە.

نەبەز: کێمان لەگەڵ بوو؟ من باش بیرم نایەت.

ماکوان: زۆر بووین ٣ سەیارە بووین من لەگەڵ سەردار و ئاراس و عەلی دا بووم ئەگەر هەڵە نەبم لە دەبڵ کابینەکەی ئاراس بووین وەستا دیاری ڕۆنگۆڕیشمان لەگەڵ بوو، ئەم پێنج کەسە بەیەکەوە نامان دەخوارد تۆ و سلێمان و سەرهەنگ کوڕانی تر بەیەکەوە بوون، خێمەمان جیابوو لەیەک، سێ شەو بوو یان چوار شەو بوو پێمان چوو، هەموو کاتەکان لەگەڵ ئێوە





بووم، ئەگەر شتێک بوایە ئێوە دەتانزانی، بۆ ڕۆژی دوایی من دەچووم بۆ ئێران و ئیتر نەهاتمەوە چووم بۆ تورکیا، نەبەز تکات لێ دەکەم ئەو کارەم بۆ چارەسەر بکە، من لەخۆم ئەترسم بەخوا، ئەترسم ئەو سەروەرە خوێڕییە بکوژم، جا توخوا گوناح نییە دەست لە گەوادا سەرف بکەم، بزانە چییەو بۆ وا دەکەن.

نەبەز: خەمت نەبێت ئەمڕۆ بۆت دەچمە بنجو بناوانی، ئەی ئێستا چی دەکەیت ناچیت بۆ نووسینگە.

ماکوان: نەبەز ئەو پیاوە پیرە لە دوێنێوە سێ جار بینیومە، ئەوەی کەبابخانەکە، هەست دەکەم شتێکی ئاسایی نییە.

نەبەز نەوەستا قسەکەی بۆ تەواو بکەم وتی ئێستا تۆ لەباری دەروونی ئاڵۆزدایت لەوانەیە بێتە بەرچاوت یان لە پارانۆیدی خۆتدا قسەی لەگەڵ بکەیت و لێت نزیکە. سواڵکەرێک بوو هات و هەندێ قسەی کرد و خۆشی لەخۆی تێنەدەگەیشت.

کەوای وت زۆر زانستیانە بۆی چارەسەر کردم، منیش دڵم نەهات پۆرتی بشکێنم وتم باشە، گوێم پێ نەدا و لەدڵی خۆمدا وتم: قابیلی ئەوە نیت ئەو باسەت بۆ بکەم،

ماکوان: نەبەز گیان ڕاست دەکەیت نەخۆشی سەرەتانی دەماغ مرۆڤ تووشی پارانۆید دەکات لەگەڵ هەزارو یەک شتی تریش.

نەبەز: کورە مەبەستم ئەوە نەبوو، ئەوەندە دڵت ناسکە بێدەنگ بە با دایکت گوێی لێمان نەبێت هەستە خۆت بگۆڕە بابڕۆین بۆ بازاڕ.



## شەڕکردن بۆ مەرگ

بەیانی هەر دەمویست خۆم دوابخەم، چونکە لەگەڵ کاک جەمال کاتمان دانابوو یەکتر ببینین، دەمویست ئەو چاوەڕێم بکات و تەلەفۆنم بۆ بکات بڵێ نووسینگەکەت لەکوێدایە؟

لەبەردەرکی سەرا لای کتێبفرۆشەکان تەماشای ڕۆژنامە و گۆڤارەکانم دەکرد، تەلەفۆنەکەم لێیدا، جەمال بوو.

کاک خەسرەو من لەبازاڕی ڕەشەمۆڵم نهۆمی دووەم، نووسینگەکەت نادۆزمەوە لای بەرگدورەکەدا وەستاوم.

ماکوان: وا هاتمە خزمەتت کاک جەمال ببورە، هەر لەوێ دابە بەخزمەتت دەگەم، چووم بەرەو ڕەشەمۆڵ و نزیکی بوومەوە ئەویش وتی کاک ماکوان چۆنیت ئەوە نووسینگەکەتانە.

ماکوان: بەڵێ کاک جەمال بفەرموو بابڕۆینە نووسینگەکە لەوێ دابنیشین.

جەمال: بە ڕۆزەوە کاکە بۆ لای ئێوە نەهاتووم لەم ناوە کەسێک ناوی کاک خەسرەوە ئەویش نووسینگەی هەیە چاوەڕوانی ئەوم، قسەم لەگەڵ کرد وتی ئێستا دێم.

ماکوان: دەی برا من خەسرەوی عەبدولکەریم محمد سەعیدم، برای گەنم کە تۆ هاوسەری دایکی خوشکەکەی منیت، ئیتر چۆن نایەیت بۆ لای من، جەنابت هەر بۆ لای من هاتویت (بەپێکەنینەوە) دەستم گرت و هێنام بۆ نووسینگەکە و دانیشتین، بەڵام تف لەدەمیا وشک بوو هەرچەندە من زانیارای تەواوم لەسەر کۆکردبووەوە لەلایەن ڕۆژنامەنووسەکانی هاوڕێم، وامزانی لەوە دەترسێت کەشتی لەسەربڵاو




بکەمەوە، منیش بۆ دڵنەوایی وتم: پێش هەموو شتێک کاروباری خۆت و مەسەلەی نەوت و ئاشتی هەورامی بخەرە لاوە، من ئەمڕۆ زۆر سوپاسی تۆ دەکەم کە خوشکەکەی منت بە باشترین شێوە پەروەردە کردووە.

هەرگیز لەبیری ناکەم، پاشان ئەوەندەی تر سوپاست دەکەم کە لەگەڵ گەنم دا زۆر بەڕێز و چالاک بوویت، هەڵسوکەوتی باوکانەت کردووە، دەبوو من بهاتمایەتە لات، بەڵام تۆ گەورەیت نواند و هاتیت.

هەستم کرد تووشی شۆک بووە، بەڵام نازانم بۆ!

جەمال: زۆر سوپاس کاک ماکوان، مەمنونی هەڵوێستم، من نەمزانی جەنابتی، ئەو ڕۆژە لەگەڵ گەنم دا بوویت هەر هەستم پێ نەکردی وامزانی مامۆستای گەنمی.

ماکوان: نا، مامە جەمال گیان من برا گەورەی گەنمم، لەماوەیەکی کەمدا هەموو کەسوکار لەگەڵ ئێوە دەناسێنم، بەڵام جارێ پەلەم لێمەکەن، ئەم کارە زۆر سەختە دەبێت ڕاهێنانێکی لەسەر بکەین، وایە؟

جەمال ئەوەندەی تر وەزعی تێکچوو کە وتم کەسوکار لەیەکتر ئاشکرا دەکەم و دەیانناسێنم.

جەمال: بەئارەزووی خۆت، من دەبێت بڕۆم هەر ئەوەندە بەسە کەزانیم جەنابت برا گەورەی گەنمیت، ماڵئاوا بێت و خوات لەگەڵ.

بە پەلە ماڵئاوایی کردو ڕۆشت.

نەبەز: ئەو پیاوە بۆ وا لەتۆ ترسا چی بوو؟

ماکوان: بەخوا نازانم، ئاگام لە حاڵی بوو منیش، ئەوە بۆ وای لێهات؟

نەبەز: دەیناسیت ئەم جەمالە کێیە؟

ماکوان: ئەمە خەڵکی کەرکوکە وابزانم، خەڵکی حەوێجەشە کورد نییە، دەڵێن تورکومانە لە بنەڕەتدا، بەڵام لای کورد دەڵێت کوردم، لای عەرەب



دەڵێت عەرەبم، لای تورکمانەکانیش دەڵێت تورکمانم! هەرسێ زمانەکە دەزانێت، دەرجە یەکە لە جاسوسی، پاشان بەرپرسیارێتی حوکمی و حیزبی نییە، بەڵام دەستی دەڕوات لەهەموو لاکان، کورت و پوخت هەتا بڵێیت بێڕەوشتە، دزە، جەردەیە، هەرچی تۆ پێت خۆشە پێی بڵێ، بەڵام گەمی خوشکم لەبەردەستیایە بۆیە وا موجامەلەم کرد.

نەبەز: باشە وامزانی نایناسی، بەڵام باشی دەناسیت.

ماکوان: ئەم جۆرە کەسانە نەبەزی برام دزی و جەردەیی لە خوێنیاندایە، جا مرۆڤ کە دز بوو زۆر ئاسانە درۆ بکات، کە درۆی کرد زۆر ئاسانە پیاو بکوژێت، کە پیاوی کوشت زۆر ئاسانە بگاتە پلەی گەوادی بۆ مانەوەی خۆی ئەم جەماڵە لەو جۆرە کەسانەیە، من سەرم سوڕ دەمێنێت چۆن گەیشتووە بەم خانەوادە لە پشدەر!

نەبەز: زۆر جار ئەم جۆرە خەڵکانە بەناو خێزان و عەشیرەتن و هۆزی باشدا خۆیان دەشارنەوە و ئەو بەرگی چاکی ئەوان دەکەنە بەری خۆیان واتا (تەغلیفە)، کاکە من دەڕۆم وا ڕۆژنامەنووسەکانی هاوڕێت هاتن، خوات لەگەڵ.

ماکوان: زۆر ورد بە لەگەڵ سەرەوەر و تاڤان دا، باشە برا؟ خوات لەگەڵ.

لەگەڵ هاوڕێ ڕۆژنامەنووسەکانی هاوڕێم ماینەوە چەند کاتژمێرێک لە نووسینگە و لە کاتژمێر ٤ی دوا نیوەڕۆ دوکتۆر چالاک تەلەفۆنی بۆکردم کە دەبێت سەردانی بکەم، چووم بۆلای و دوای هەواڵ پرسین وتی: دەبێت دۆسیەیەکت بۆ بکەمەوە ناوت تۆمار بکەم لە نەخۆشخانە جا پێویستم بە ڕەزامەندی خۆت هەیە بۆ ئەو کارە، بۆیە بانگم کردی تکات لێدەکەم، هەرچۆن بووە بڕیاری نەشتەرگەرییەکە بدە، ڕاستە تا ئەم ساتە کاریگەری لەسەر جەستەت نەکردووە، چونکە خۆت کەسێکی بەهێزی، ئەم نەخۆشییەش مرۆڤی بەهێز ئەتوانێت ڕووبەڕووی بێتەوە.

ماکوان: دوکتۆر گیان من سوپاسی خەمخۆریت دەکەم، بەڵام بەهیچ شێوەیەک دۆسییەم بۆ مەکەوە ڕازی نیم و من خۆم بڕیاری کۆتایم داوە، هەرکات پەشیمان بوومەوە دڵنیابە جەنابت ئاگادار دەکەمەوە.

د. چالاک: بەڕاستی کاک ماکوان ئەگەر بڵێم تایبەتی خۆ پێت ناخۆش نییە، من نازانم بۆچی ڕەتی دەکەیتەوە؟

ماکوان: دکتۆری بەڕێز تۆ خۆت دەزانی من تاڕادەی ئەو کاتەی کە زۆرم نامێنێت بۆ مردن ئەم نەخۆشییە دەشارمەوە، خۆشت باش دەزانیت من تاڕادەیەک لەناو کۆمەڵگای خۆماندا ناسراوم ئەگەر بڕواتە نەخۆشخانە دڵنیام زۆر ئەم نەخۆشییەم ئاشکرا دەبێت، منیش نامەوێت بەهۆکاری نەخۆشی من کەسوکار، دایکم و برا و خوشکم و خێزانم بەتایبەت ترو منداڵەکەم بزانن و ئەوانیش نەخۆش بخەم، بەهۆکاری نەخۆشی من، بۆ زانیاریت خەفەت خواردن جۆرێکە لە نەخۆشی بێچارەسەر بەتایبەت کە نەخۆشییەکەی من چارەسەری زۆر لاوازە و ئەنجامی چاک بوونەوەی ناڵێم نییە، بەڵکو زۆر کەمە، ئەوە هەموو هۆکارەکەیە جا لەبەر ئەوە لەبیری بکە و تا ئەم ساتە.

من هیچ کێشەم نییە و تا مردنیش بە پشتیوانی خوا کێشەم نابێت.

د.چالاک: فێری دوو وشە بووم لە جەنابتەوە کە پێشتر هەردووکیانم بەجیاواز باس دەکرد، بەڵام ئێستا دەڵێم (سەربەست و ئازادی).

ماکوان: من دەمویست باسێکت لەگەڵ بکەمەوە نازانم تا چەند هاوکاریم دەکەیت؟

د. چالاک: بەفەرموو لەخزمەتام.

ماکوان: نازانم ئایا نەخۆشت هەیە لە دەرەوە چاوەڕێت ناکەن، ئەگەر نەخۆشت هەیە دەیخەمە کاتێکی کە.

د. چالاک: نا لە ئێستادا هیچ نەخۆشێکم نییە.





ماکوان: سوپاس بۆ خوا، برای عەزیز زۆر حەز دەکەم هاوکاری گەلاّ و دلاوە بکەم، دڵنیام بۆ لێکۆڵینەوەکەی جەنابیشت سوودی زۆری دەبێت، ئەویش بەیەک گەیاندنی ئەم دوو خۆشەویستەیە، هەردووکیان یەکتریان خۆش دەوێت، جەنابیشت دڵنیام حەز بە خێروچاکەیان دەکەیت، من دەتوانم هاوکاری تەواویان بکەم بێ هیچ مەرجێک، تەنها ئەو دوو کەسە بڕۆنە جێگاو ماڵی خۆیان و خێزانێکی بەختەوەر دروست بکەن، دەزانم ئەو وتەیە دێتە ڕێمان کە بڵێن ئاخر کێ دەڵێت دەژین؟ منیش دەڵێم ئاخر کێ ناڵێت ناژین و مردن و ژیان تەنها لای خوای گەورەیەو ئەو بڕیاری لەسەر ئەدات.

جا هاوکارم بە بۆ بەیەک گەیاندنیان، نازانم پرۆژەکەی منت پێ چۆنە؟ تۆش بە دوو دیودا تەماشی بکە من نازانم تا چەند ئیمانداریت و پیادەی ئایین دەکەیت، خۆ ئەگەر پابەند نیت بەدینەوە ئەوا بیکە بە پرۆژەیەکی زانستی بۆ لێکۆڵینەوەکەت، بەڵکو پرەنسیپی خۆشەویستی کاری خۆی بکات.

د. چالاک: کاک ماکوان پێش هەموو شتێک زۆر حەز دەکەم سوپاست بکەم کەسی وەک جەنابت لەم ولاّتەدا زۆر پێویستە، بۆ ئیمانداریم زۆر باوەڕم بەخوا هەیەو ڕێز و تەقدیرم بۆ ئایین و کلتوری کۆمەڵگەکەم هەیە، بەڵام تا ئێستا وەکو جەنابت بیرم لە ئایین نەکردۆتەوە، بۆ کارەکەت جا زانستی بێت یاخود خێر و چاکەو پیاوەتی بێت ئەوا ١٠٠٪ هاوکارتم. حەز دەکەم زۆر بە ڕاستگۆیی سەرنجی خۆمت پێ بڵێم، تۆ تاکە کەسی لەناو کورد دا و لەناو ئەم کلتورەدا زۆر جەخت لەسەر دەستەواژەی عیشق و خۆشەویستی دەکەیتەوە، زۆر سەرسامم بەو شێوازی قسەکردنەت لەسەر خۆشەویستی، ڕاستیت دەوێت من ماوەیەکی زۆر کاریگەری ئایینی مەسیحیم لەسەر بوو لەولاّتی بەریتانیا، بەڵام وەکو بڵێیت تێری نەکردم دەقەکانی ئینجیل کە خوێندمەوە، بەڵام خەڵکی (کریستیان) یان نەسرانی زۆر بڕوایان بە خۆشەویستی و عیشق هەیە، زۆر گرنگی بە جوانی ژیان






ئەدەن و گوڵ و پاک و خاوێنی و ڕەوشت و میوزیک و ئەدەب و...هتد، لەڕاستیدا لەکۆمەڵگەی خۆماندا نییە خۆ لێم زوێر نابیت بڵێم خۆشەویستی و جوانی تێدا نییە، هەموو لەم وڵاتەی ئێمەدا پارەو دەسەڵات و ڕوتانەوەی خەڵکی هەژار و دەسەڵاتداری زاڵم و زۆرشتی تر تەنگی بە هەرچی جوانییە هەڵچنیوە.

ماکوان: نەک زویر نابم، بەڵکو ١٠٠٪ لەگەڵتام و ئەوەی جەنابت باست کرد لەهەردوولا مەبەستم خۆراوا و خۆرەڵاتی ناڤینە، هەمووی ڕاستە و بەتەواوەتی بەرجەستەی حاڵەتەکەیان کردووە.

د. چالاک: باشتێکی ترت پێ بڵێم توخوا لێم زوویر مەبە.

ئەمهێشت قسەکەی تەواو بکات پێم وت: باشە من ئەوەندە دەموچاوم ترسناک و توڕەم کەوا زوو زوو پێم دەڵێیت توڕە مەبەو زوویر مەبە؟ یاخود هۆکاری نەخۆشییەکەمەو لەبەر باری دەروونیم وا دەڵێیت؟

د. چالاک: دەستی کرد بە پێکەنین نا نەترسە و نە نەخۆشی، بەڵکو خاوەنی کەسایەتییەکی زۆر تایبەتی، ڕێزی تەواوەتیم هەیە بۆت تەنها لەڕووی ئیحتیرامەوە وا دەڵێم.

ماکوان: لوتفت هەیە، دوکتۆر چالاکی بەڕێز، بفەرموو شتەکەت بڵێ.

د. چالاک: هەڵە نیم و زیادەڕۆیی ناکەم ئەگەر بڵێم پڕ پڕیت لە ڕۆشنبیری و ئەدەب و ڕێزی تەواوی زانستت لایە، چۆن تۆ کەسێکی ئیسلامیت؟

زۆر پێکەنیم بە قسەکەی، ئەویش وتی خۆ هەڵەم نەکردووە، لەوەڵامدا وتم: هەتا کۆتا وشەت هەمووی پێ بەخشیوم، لەبەر ئەوەی ئیسلامی و موسڵمانم ئەو ئاراستەیەم وەرگرتووە، من لەبنەماڵەیەکی زۆر ئاسایی پەروەردە بووم، واتا بنەماڵەکەمان گرنگی نەبوو بۆ دین، تەنها خەریکی کوردایەتی بوون، من بە پێچەوانەی باوک و مام و باپیرم خەریکی دینداری بووم، کەس پێی نەوتووم نوێژ بکە، یان موسڵمان بە، بەڵام کاریگەری



کۆمەڵگەو خودی ئیسلام لەسەرم هەبووە، هەروا بەکوێرانە دوای ئیسلام نەکەوتوم، بەڵکو پێش پابەند بوونم بە ئیسلامەوە کەسێکی واقعی و بڕوای تەواوم بە وجودی فەلسەفە هەبوو، زۆر قاڵ بوبوومەوە لە بوارەکانی (ئەنطۆلۆژیا، ئەبستمۆلۆژیا و ئارکۆلۆژیا) ئەم سێ بنەمایە فەلسەفەی پێکهێناوە، ئەنتۆلۆژیا لە کوردیدا واتا (بوون)، بە عەرەبی (الوجود) ئەگەر خەڵکی لەم بەشەدا زۆر شارەزا بێت، زۆر ترسناکە ئەگەر خۆی پابەند نەکات بە ئایینەوە، بۆ وەڵامی پرسیاری ناو ئەم خانەیە کە فەلسەفە دا پێی دەوترێت (کاتەگۆری) بەشی بنەڕەتی فەلسەفە، بێدین و مولحید دەکات و ناچار پەنا دەبەیت بۆ هەرچی باسی پەرەسەندنە لە بوارەکانی بایەلۆجی و تەنانەت ئەنترۆپۆلۆجی...

د. چالاک قسەکانی پێ بڕیم و وتی: من لەم بەشەدا گیرم کردووە زۆر بڕوام پێیەتی.

ماکوان: تۆ پەلەم لێ مەکە قسەکەم تەواو نەکردووە، تۆ لەم بەشەدا کە باسی بایەلۆجییە و باسی زانستی مرۆییە بەگشتی لەناو ئەم بەشەدا لەوانەیە یەک بەشی هەڵبژاردبێت لە ١٠٠ بەشی تر تەنها ئەنطۆلۆژیای پێکهێناوە، چونکە گەڕان لەناو وجوددا هەروا سادە و سانا و ساکار نییە، بە پەرەسەندن و ئەنترۆپۆلۆجی و کۆسمۆلۆجی...هتد. کە لەڕاستیدا هەموو لەبەشی ئەبستمۆلۆجیادان، لە مەعریفەیە و باسی لەسەر زانستی کۆنکرێتیە، بۆ ئەوەی زۆر قورسی نەکەم بێمەوە ناو باسکەم، من بۆیە موسڵمان بووم و ئیسلامم هەڵبژارد لەبەر ئەوەی وەڵامی پرسیارەکانی بوونم تەنها لە ئیسلامدا دەستکەوت، خۆی قسەکە ئاوایە ئەنطۆلۆژیا پرسیار دەوروژێنێت و دەڵێت: من کێم؟ من چیم؟ بۆ هاتووم؟ بۆ کوێ دەچم؟ مردن چییە هەزار و یەک پرسیاری تر کە وەڵامی نە لە زانستدا هەیە، نە لە فیکردا نە لە فەلسەفەدا، تەنها ئیسلام وەڵام ئەداتەوە، هیچ ئایینێکی تر جورئەتی وەڵامدانەوەی نییە، هەر ئەمەشە ڕۆژاوایی کردووە بە (بێ دینی، لادینی و ئەگنۆستیک) زۆرجار ناسنامەی دینداری




مەسیحییان لەدەست داوە، بە بواری تەصەوف و ڕۆحانی لەنگەری خۆیان گرتووە لە ئەوروپا دا بەگشتی، بەڵام لە وڵاتە یەکگرتووەکان دین بەهێزترە، لەبەر ئەوەی ناهێڵن زانست بڕواتە ناو دین، بەتەواوەتی جیایان کردۆتەوە، دین بۆ کۆمەڵگە وەکو مۆڕاڵ و ڕەوشت ئاکار و بەهاکان بەو چاوە تەماشای دەکەن، بەڵام لە پرێستێک بپرسە من بۆ لێرەم نازانێت، پێی بڵێ ئەقڵ چییە، نایزانێت، بڵێ بۆ دەبێت بمرم وەڵامی پێ نییە، پێی بڵێ ئەم هەموو پێغەمبەرە بۆچی هاتوون، بۆ بەهەشت و دۆزەخ هەیە، هەربنەمای دۆزەخ و بەهەشت بۆ، وەڵامیان بۆ ئەم پرسیارە وجودیانە نییە، من وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانەم لە ئیسلامدا دەست کەوتووە.

د. چالاک: کاک ماکوان منت هەڵڕشتووە، نازانم چۆن خۆم کۆبکەمەوە، چیت لێ کردم، ماوەی ١٠ ساڵە سەرقاڵم بەم پرسیارانەوە، تکایە هاوکاریم بکە؟

ماکوان: هەرتۆ نیت، هەموو مرۆڤێکی ئاقڵ و خاوەن هۆشیاری بەدوای ئەو پرسیارانەوەیە، ئاخر برا خۆ ئێمە ئاژەڵ نین بخۆین و بخەوین و بزێین، دڵنیابە ئامانجێک هەیە لە دروستکردنماندا.

د. چالاک: بەدڵنیاییەوە وایە، کاک ماکوان دەمەوێت ئەو پرسیارانەی مێشکم لەجەنابت بکەم، کە فەرموتان نەزانست نە فیکر نە فەلسەفە ناتوانێت وەڵام بداتەوە، بزانم وەڵامەکەم لە ئیسلامدا دەست دەکەوێت؟

ماکوان: بەخۆشحاڵییەوە دکتۆر گیان، مەرج نییە هەمیشە پزیشک چارەسەری نەخۆشییەکان بێت، زۆرجار دیمەنێک یان وشەیەک یان موزیکێک دەروونەکان چارەسەر دەکات، بەڵام پەلە لە ئیشەکەی دلاوەر و گەڵا بکەین و کاتەکە لەوان زەوت نەکەین.

د.چالاک: ڕاستە زۆر باشە هەرچەندە قسەکە لەشان و شەوکەتی پزیشک کەمدەکاتەوە، بەڵام تا سەرئێسقان قسەکەت تەواوە، بەنیسبەت



گەڵاو دلاوەر من پێم باشە قسە لەگەڵ هەردووکیان بکەین، بزانین چێ دەکەن و چییان دەویت.

ماکوان: من قسەم لەگەڵ کردن زۆر هەرزەکارانە بیردەکەنەوە، پێویستە لەگەڵ کەسوکاریان قسە بکەین پێش ئەوەی ئەوان بڕیاری هەڵە بدەن.

د. چالاک: تۆ چیت لە مێشکدایە و بەتەمای چی بکەیت بۆ ئەو دوانە؟

ماکوان: من وەرەمێکی پیس لە مێشکمدایە (دەستمان کرد بە پێکەنین)

خانەوادەی دلاوەر زۆر گرنگ نییە، لای من باوک و دایکی گەڵا گرنگە ڕازی بکرێن و ڕازی بن تا ئەو دوانە هاوسەرگیری بکەن، من کەسوکاری گەڵا ناناسم بەڵام ئەو ڕۆژە جەنابت باسێکی کورتت بۆ کردم لەسەر قسەی بەڕێزتان زۆر خۆشحاڵ دەبم باوکی گەڵا ببینم و دوایش لەگەڵ دایکی قسە بکەم، پاشان خاڵی جەوهەری لەم کارەدا تۆیت دەبێت لەگەڵمدا بیت و وا دەری بخەیت کە بەشێک لە چارەسەری نەخۆشییەکەیان خۆشەویستی و بەیەک گەیشتنیانە.

د. چالاک: هەر زۆر بەخۆشحاڵییەوە، حەز دەکەیت ئێستا تەلەفۆنی بۆ دەکەم کاتی لێ وەردەگرین و دەچینە لای، باوکی زۆر پیاوێکی چاک و بەڕێز و میهرەبانە و گەڵای زۆر خۆش دەوێت.

دوکتۆر چالاک تەلەفۆنی بۆ کرد و داوای لێکرد کە بیبینێت بۆ کارێکی پێویستە دەربارەی گەڵایە، کەوای وت من ئاگام لەباوکی بوو ئۆقرەی لێبڕا و وتی ئێستا دێم بۆلاتان.

د. چالاک: نا پێویست ناکات کاتێکی تر.

ئاماژەم بۆ کرد و وتم ئێستا دەچین چونکە هەستم کرد کە دڵی باوکی خستە نارەحەتی، هەر بۆیە دوکتۆر وتی ئەگەر ئێستا ئێمە بێینە لات ئاساییە؟





نوری: زۆر خۆشحاڵ دەبم بفەرموون.

د. چالاک: کەسێکی ترم لەگەڵدایە بەناوی کاک ماکوان، ئەویش لەگەڵمدا دەبێت.

نوری: سەرچاو یاخوا بەخێر بێن.

من و دوکتۆر بەڕێ کەوتین بۆ ماڵی کاک نوری، گەیشتین و پێشوازییەکی زۆر گەرممان لێ کرا و گەلا منی بینی زۆر بەلایەوە سەیر بوو، هەستم کرد ترسی پێوە نیشت.

نوری: نانتان خواردووە؟ ئێمە نانمان نەخواردووە دەنێرم لەوبەرمانەوە مریشکی برژاوی زۆر جوانی لێیە بیهێنن.

ماکوان: دەستان خۆش بێت پێویست ناکات، زۆر نامێنینەوە. هەندێک قسە هەیە لەگەڵ جەنابت و خانمی بەڕێزتاندا بیکەین دەربارەی گەلای کچت و پەیوەستە بە نەخۆشییەکەیەوە.

نوری: بەخۆشحاڵییەوە کاک ماکوان گیان، جەنابت دوکتۆری؟

ماکوان: نا؛ من هاوکاری دوکتۆر چالاکم و هاوکاری گەلاشم، خۆم وەکو گەلا تووشی نەخۆشی سەرەتان بووم، ئەزموونێکم لەم نەخۆشییە وەرگرتووە.

نوری: خوای گەورە ڕەحم بە هەموو لایەکتان بکات و شیفاتان بدات، پەلە مەکە با چنوری خێزانم بانگ بکەم، ئەویش هات دوای هەواڵ پرسین و یەکترناسین دوکتۆر چالاک دەستی کرد بە قسەکردن و وتی: لە ڕووی ئوسلوبی کۆمەڵایەتی من زۆرباش ناتوانم ئەوەی لە دڵمدایە دەری ببڕم، بۆیە داوا دەکەم با کاک ماکوان بفەرمووێت.

ماکوان: ژیان و مەرگ لای خوای پەروەردگارە، مرۆڤی ئیماندار بڕوای تەواوی بە قەزا و قەدەری خوای پەروەردگار هەیە، ئێمەش لەڕووی زانستییەوە قاچمان لە نێوان ژیان و مەرگدایە، بەڵام کەس نازانێت کە



دەمرین و چۆن دەمرین و چەندیش ئەژین، زۆرجار هۆکارێکی ئەم دنیایە کە پەیوەستە بە قەزا و قەدەرمان، تەمەنمان بۆ درێژ دەکاتەوە و بە پێچەوانەشەوە هەر ئەو هۆکارانە دەبێتە کەمی تەمەن، ئەوەی کە دوکتۆر ڕەچاوی کردووە هۆکاری خۆشەویستی نێوانی دوو کەس کە مەبەستمان گەڵا و کوڕێکە ناوی دلاوەرە هەتا بڵێیت کەسێکی چاک و خواناسە، هەردووکیان گیرۆدەی یەک دەردن، بەڵام زۆر واریدە و ئومێدمان بە خوای پەروەردگار هەیە کە ئەم زەواجە چارەسەری نەخۆشییەکەیان بکات ئەمە ئەو داوایەیە کە منیش و دوکتۆریش بۆی هاتووین.

نوری: یاخوا بەخێر بێن، من نازانم ئەمە خوازبێنییە یان چارەسەری نەخۆشییە؟

د. چالاک: هەردووکیانە، چارەسەری نەخۆشییەکە بە هێنانەدی ئاواتیان.

نوری: کێشەکە لەوەدانییە من ڕازی بم یان ڕازی نیم، کێشەکە لەباری دارایی و نەدارییە، من ئەگەر توانام بوایە هەموو کارەکەیانم ئەگرتە ئەستۆی خۆم، بەڵام دلاوەریش زۆر نەبووە و هیچی نییە.

ماکوان: مادام کێشەکە لەسەر مادەیە بڕواناکەم چارەسەر نەکرێت، گرنگە ئێوە ڕازی بن و ژینگەیەکی خۆش بۆ گەڵا و دلاوەر دروست بکەن، تێچووی ماڵ و کەرەستە و چون بۆ مانگی هەنگوینیان من دەیگرمە ئەستۆ، هەرچەندی تێبچێت.

دڵنیام هەردووکیان زۆر لەماڵی ئێوە و براکەی دلاوەر باشتر پەیدا دەکەن و دەتوانن خۆشیان بەڕێوە بەرن، منیش مەبدەئی ٢ دەفتەر ئەدەمە کاک نوری خۆی کێشەکە چارەسەر بکات، بەڵام تکایە لە شکۆ و پیاوەتی دلاوەر کەم نەبێتەوە، خۆ من دەتوانم پارەکە بدەمە دەست دلاوەر، بەڵام باوکی گەڵا خان بە شیاوتر دەزانم و دڵسۆزتریش لەخۆیان، تاکە داوام ئەوەیە کە شکۆو کەرامەتی دلاوەر نەڕوشێت و بۆیە حەزیش

دەکەم لەژێر دەستی کاک نوری بێت، بۆ ئەوەی دلاوەر زیاتر تەقدیری گەڵا بگرێت و حورمەتی باوکی و دایکی بگرێت و بە دایک و باوکی خۆی بزانێت، ئەمە پێشنیاری منە.

نوری: برا ئەو کارەی تۆ دەیکەیت زۆر گەورە و خێرە، پێویست بەو پارە زۆرە ناکات، پێم وابێت دەفتەرێک سەرو زیا بێت.

ماکوان: من زیاتر متمانەم بۆ دروست بوو کە جەنابت بەچاوی تەماعەوە ناڕوانیتە کارەکە زۆر گەورە دەینرخێنم، بەڵام داوا دەکەم کە چاوی باوکانەت بۆ دلاوەریش بێت، ئەو کە نە باوکی هەیە و نە دایک، من پێشنیار دەکەم بۆ ئاهەنگەکەیان سەفەر بکەن بۆ مککەی پیرۆز و عومرە بەجێ بهێنن، بە پشتیوانی خوای گەورە بەیانی پارەکە دەگەیەنمە دەست، من دەبێت بڕۆم برسیمە و زۆریش ماندووم.

لەگەڵ دوکتۆر دەچین ئەو مریشکە برژاوە دەخۆین، کە جەنابت باست کرد.

نوری: کاکە تۆ دەڕۆیت خۆت دەیخۆیت و ئێمەش بێبەش دەکەیت، مادام وایە هەموو بەیەکەوە دەیخۆین، دانیشتینەوە من هەڵسام بۆ دەست نوێژگرتن، گەڵا هات دەستم ماچ بکات نەمهێشت و پێم وت تۆ خوشکەزای منی مادام موحەجەبەیت، خوشکی منی و نوری چاوی منی، زۆر ئاسان هاتن بەدەستەوە، سوپاس بۆ خوا دوای نانخواردن بەڕێکەوتین و دوکتۆر منی هێنایەوە بۆ ماڵ.

منیش لەدوای پشوو تەلەفۆنم کرد بۆ دلاوەر کەبەیانی دوای نوێژی نیوەڕۆ بینیم، کە تەلەفۆنم بۆ کرد لەسەر مۆلیدە کارەباکە کاری دەکرد، دەنگەدەنگی مۆلیدەکە زۆر ئیزعاج بوو، زوو دامخستەوە.

تەلەفۆنم کرد بۆ نەبەز وەڵامی دامەوە وتم دەنگوباست چییە و گەیشتینە کوێ؟

نەبەز: برا بێم بۆلات یان دێیت بۆلام؟

ماکوان: بەخوا ماندووم بەڵام بە تەلەفۆن پێم بڵێ چی ڕوویداوە؟

نەبەز: لەگەڵ هەردووکیان دانیشتم، تاڤان دەڵێت کە ئەو کارەمان ئەنجام داوە ماکوان ئاگای لەخۆی نەبووە!

ماکوان: ئەی من کە کارەکەم ئەنجام داوە ئاگام لەخۆم نەبووە، ئەی خۆم لەکوێ بووم؟ ئەمانە زۆر بێڕەوشتن لەبەر چاوی سەروەری بەلوعە ئەم قسانەی کرد؟

نەبەز: بەڵێ؛ ئەڵێ گوایە تۆ ئەوکاتە جۆرە حەبێکت خواردوە و چویتە ناو خێمەکە، بە سەردارت وتوە بۆ ماوەیەک دەخەوم، دوای ئەوە هەڵدەسم، دەڵێت دوایی خۆشی هەستی پێ کردووە کە هەستاوە چووە خۆی شتووە و زانیویەتی لەشی گرانە، تۆ ئەوکات گوایە ئاگات لەخۆت نەبووە.

ماکوان: ڕاستە من حەبم خواردووە، بەڵام حەبی خەو بووە، خۆ من سەرخۆش نەبووم حەبی ڤالیۆم بووە، بەڵام زۆر قورس بوو ئیتر من بخەوم چۆن کاری وا دەکەم؟

نەبەز: تۆ کاری وات نەکردووە، گوایە کە تۆ بێهۆش بوویت ئەو کارەی لەگەڵ کردوویت.

ماکوان: نەبەز ئەو قسەیە بەس ڕاست نییە، ئەی سەردار، ئەی ئاراس، هەمو وڕەفیقەکانم جلوبەرگو خواردنیان لە خێمەکەدا بووە، شتی وا دەبێت، پاشان من ئەوەندە گەمژە نیم بخەوم کاری وام لەگەڵ بکات تاڤانە ڕەش من بەخۆم نەزانم؟

بەو مانایە بێت ئەوان خیانەتیان کردووە و دەست درێژیان کردۆتە سەر من، وەڵڵا ئەمە خۆشە یەکەم جارە شتی وا ببیستم کە ئافرەت دەستدرێژی بکاتە سەر پیاو، سەر کێش خەسرەوە سور.

نەبەز: بابێم بۆلات قسە دەکەین، بەتەلەفۆن نابێت باشە.



ماکوان: وەرە بزانم چی ترت پێیە یان مەیە من بە پیاسە دێم بۆلای ماڵی ئێوە، دەچین بۆ شوێنێک دادەنیشین.

نەبەز: تۆ بەسەر جادەکەدا وەرە من دێم لەڕێگا ئەتبینم بەکۆڵانەکەماندا مەیە.

ماکوان: باشە.

هات منی هەڵگرت زۆر تورە بووم وتم بابڕۆین ئەو دوو سەگە بکوژم، بزانم ئەم قسە بێ ماناو قۆڕانە چییە دەیکەن؟

نەبەز: منیش ئەوەم پێ وتن ئەی ڕەفیقەکانی ماکوان لەکوێ بوون.

تاڤان دەیوت هەموویان چووبوون بۆ شاخی پیرەمەگروون واتا لەسەر لوتکەی پیرەمەگروون تۆش گوایە لە خێمەکەدا بوویت و تاڤان خانمیش بەهەلی زانیوە کاری خۆی کردوە لەگەڵ تۆدا.

ماکوان: نەبەز ئەو قسەیە زۆر خەتەرە ئاخر خوا ڕەحمی کرد من ئافرەت نەبووم دەنا ئێستا سکی من پڕ دەبوو، ئاخر کام ئافرەت جورئەتی ئەوە دەکات ئەم باسە هەروا ئاسان نییە، باشە شتێکی تر ئەی دەچین فەحس دەکەین، ئیتر بۆ ئەم هەموو ئینێرجییە بەکار بهێنین؟

نەبەز: ئاخر ئەو فەحسە دەبێت حاکم بینووسێت، دەنا ناکرێت.

ماکوان: ئەی بە پارە لە تورکیا یان ئێران ناکرێت، لە ئەوروپا ئاساییە بۆ لێرە قەدەغەیە.

نەبەز: کاکە ئەوە لەکوردستان ڕێگای بۆ بکەنەوە کێشە زۆر دروست دەکات، تۆ پێم بڵێ لەقسەکانتا وتت حەبم خواردوە و خەوم لێکەتووە کەواتە کاکە تورە مەبە کەوانەیە لە ٩٠٪ ڕوویدا بێت، بەڵام خۆت نەبویت ئەوان کارەکەیان ئەنجام داوە.

ماکوان: ئەگەر ئەم قسەیە ڕاست بێت من سێ کەس دەکوژم یەکەم تاڤان، دووەم سەردار سێیەم سەروەری بەلوعە، هەروا ئاسان نییە ئەم



کێشەیە، نازانم ئێستا بڕۆمە لایان زۆر دەترسم لەخۆم بەرگە نەگرم و کارەساتێک دروست بکەین، نەبەز نابێت ئاوا هێمن بین.

نەبەز: کاکە ئەگەر دەڵێیت دەچینە سەریان و هەمویان دەکوژین، ئەمە بکەین؟

ماکوان: سویند بەخوا موستەحەقن، ئاخر ئەمە یاری کردنە بە شعوری خەڵکی و دوای ١٥ ساڵ یان ١٦ ساڵ تەمەن بۆ زیندوو بکەنەوە، لەناو خەڵکدا چەندە کەرامەتت بشکێنن، تۆ تەماشای ئەو چاوقاییمیەی تاڤان و سەروەر چەندە بێحەیا و بێحورمەتن، ئەوانە بۆ کۆمەڵگە باری قورسن، پێویستە وەکو ڕەگی گولی لەناو بچن.

نەبەز: ئێستا چی بکەین، ئیهمالیان بکەین بڵێین بڕۆن چی دەکەیت بیکەن؟

ماکوان: ئەرێوەڵڵا نەبەزی برام تاکەو تاک بیانکەرە پێت، چی دەکەن بابیکەن.

نەبەز: بەڵام بزانە هەر ئەوەندە چوە فەرمانگەیەکی پۆلیس گۆڤار و ڕۆژنامەکان و سایت و تۆرە کۆمەڵایەتییەکان نایبڕنەوە ئەوە با تەلەفزیۆنەکان لەولاوە بوەستێت.

ماکوان: وەڵڵا برا منەتی هەموویان بە پێڵاوەکانی تۆ، من کە ئاگام لە شتێک نییە چۆن دەتوانن قسەم لەسەر بکەن، باشە پرسیارێک گریمان چون بۆ پۆلیس ئەگەر ڕاستگۆ بن، خۆ هەر خۆی سزا دەدرێت لەبەر ئەوەی ئەو دەستدرێژی کردۆتە سەر من.

نەبەز: ئاخر ویستم ئەمەت پێ بڵێم، خۆ ئەوان نەیان وتووە سکاڵای لەسەر تۆمار دەکەین، ئەوان دەڵێن پێویستە ماکوان بزانێت شێرکۆ کوڕیەتی، تەنانەت سەروەر وتی ئەو ڕۆژە قسەیەکم کردووە خەسرەو زۆر توڕە بووە وا دەزانێت من داوای پارەی لێ دەکەم، ئەوان تەنها دەیانەوێت ئاشنات بکەنەوە بە کوڕەکەت.




ماکوان: ئەی بۆ ناڵێیت بە زۆڵەکەت؟

نەبەز: جا ئەو بڵێ چی برا؟

ماکوان: نەبەز زۆر حەز دەکەم ئێستا بمرم و کۆتایی بەژیانم بێت توخوا مەعقولە من لە تاڤانە ڕەشی عەزە بێ سمێڵی سوک، پاشان ژنی سەرەوەری بەلوعەی سوک کوڕێکم هەبێت، دوو بنەماڵەی زۆر سوک پەروەردەیان کردبێت، داخۆ چی ڕادەستی من بکەن داوای چی ترم لێ بکەن.

نەبەز: من دەڵێم زۆر بەسەختی مەیگرە، دەڕۆین سەردانێکیان دەکەین بزانین چی دەڵێن و چییان دەوێت، ئەگەر هەر ناساندنی کوڕەکەت بێت کێشە چییە و بیگرە و دەستخۆشیان لێ دەکەین.

ماکوان: نەبەز ئەزانی زۆر کەری؟ خۆ تووڕە نابیت پێت بڵێم کەرە، چۆن ئاسان وەریبگرم کوڕێکم هەیە بەقەدەر خۆمە، من لەسەر لێواری مەرگم ٣٦ ساڵە بونیادی کەسایەتی خۆم دەکەم، بەکەرێتی تۆ و تاڤان و سەروەر نەبێت بەخۆڵ.

نەبەز: دەی باشە برا من کەرم، بە قسەم مەکە بزانم تۆچی دەکەیت.

ماکوان: لەجێگایەکدا بوەستە با ئاوێک بکرم دەمم وشک بووە.

دابەزین لای سەمونخانەیەک و گەصێک، لەوێدا ئاوێکم کڕی و نەبەز دووچای هێناو وتم نەبەز گیان ببورە زۆر داوای لێبوردن دەکەم، بەڕاستی زۆر شەرمەندە و خەجاڵەتی لای تۆم زۆر زیاد سنورم تێپەڕاند.

نەبەز: توخوا کەی ئەوە قسەیە دەیکەیت برا تۆ برای گەورەمیت.

لەگەڵ نەبەزدا چامان دەخواردەوە مامە پیرەکەم بینی وتم نەبەز ئەوە پیاوە پیرەکەیە دەیناسیتەوە.

نەبەز: سواڵکەرەکەیە؟

ماکوان: وەرە بابڕۆین بۆلای.



دەستم کرد بە گرفانمدا هەرچی تێدا بوو دەرم هێناو سڵاوم لێکرد و کردمە دەستی، دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: کاکە عادل بۆ زانیاریت باشترین شارەزا لە ڕێگادا کە هەرگیز ون نابێت گوێدرێژە، جا زۆر جار دەبێت یان ناچار دەبین شوێن گوێ درێژەکە بکەوین، تۆش بەقسەی بکە و شوێنی بکەوە شتی زۆر دەبینی لەڕێگای گوێدرێژەکە.

ماکوان: زۆر حەز دەکەم دەستت ماچ بکەم و بزانم ناوت چییە.

مامە پیرە: ناوم عەبدوڕەحمانە، ناسراوم بە شێخ عەبدورەحمان، بۆ ماچکردنی دەستم دەبێت ببیتە مورید و ڕێگا و مەسلەکی عارفان وەربگریت، ئامادەی؟

ماکوان: بە دڵنیاییەوە.

دەستم ماچ کرد و یەک زەردەخەنەی کرد و بەجێی هێشتم، زانیم و تێگەیشتم کە مەبەستی گوێدرێژەکە نەبەزە، دەبێت بەقسەی نەبەز بکەم و بڕۆم بۆماڵی سەروەری بەلوعە و تاڤان و شێرکۆ ببینم بزانم لەم ڕێگایەدا چی تیا بەدی دەکەم و فێر دەبم، بۆیە وتم: نەبەز ببورە کە قسەی نابەجێم کرد تۆ چی دەڵێیت لەقسەت دەرناچم.

نەبەز: ئەزانم ماندوویت، بەیانی قسە دەکەین، بڕۆ بخەوە ئێستا دەتبەمەوە.

ماکوان: باشە نەبەز گیان، چاک بووم بە عەزێت و ئەرک بۆ جەنابتان.

گەڕامەوە ماڵەوە بەیانی ئارام هات بەشوێنما چوین بۆ مزگەوتی عەلی کەمال هێنامیەوە بۆ ماڵ و لێی خەوتم هەتا سەعات ١١، شەو خەوم لێنەدەکەوت بەیانی دلاوەر خەبەری کردمەوە بە تەلەفۆن و داوام لێ کرد کە نەڕوات بۆ نووسینگە و بێتە ماڵەوە و دوو دەفتەرەکەمم پیا نارد بۆ کاک نوری باوکی گەلا.






کەهات دیاربوو ماندوو بوو، شەو لەکار بووە و پێوەی دیار بوو کە کەم خەوتبوو، هەستیشم کرد گەڵا هیچی پێ نەوتووە کە وتم ئەو ئەمانەتە بەرە بۆ کاک نوری باوکی گەڵا تووشی شۆک بوو، وتی چۆن دەیناسی؟

ماکوان: دلاوەر گیان ڕەفیقمە، ئەو پارەیەی بۆ بەرە و بڵێ ماکوان زۆر سڵاوی بۆت هەبوو لەجیاتی منیش دەستی ماچ بکە باشە؟

دلاوەر: کاک ماکوان گاڵتەم پێ ناکەیت؟

ماکوان: نەوەڵڵا برا زۆر بە جدیمە و حەدیشم نییە گاڵتە بە جەنابت بکەم، تەلەفۆنی بۆ بکە و ئەو ئەمانەتەی بدەرێ و دەستی ماچ بکە، ئەوە زۆر گرنگە بڵێ ماکوان وای وتووە، باشە برا؟

دلاوەر: بەسەرچاو.

کە ئەو ڕۆیشت دیسان لێی خەوتم هەتا کاتژمێر ١:٣٠ دایکم هەڵیساندم وتی نەبەز دووجار تەلەفۆنی بۆ کردوویت، نوێژی نیوەڕۆ بکە کات درەنگە.

نوێژی نیوەڕۆم کرد لەگەڵ ئانای کچم بە تەلەفۆن قسەم دەکرد، بەڵام زۆر خەفەت بار بووم خەمۆکی و دایگرتمەوە توانای وەستانم نەبوو، هەر لەماڵەوە مامەوە نەبەز هات بەشوێنمدا وتی بابڕۆین کاری زۆر زەروورم پێتە، خۆم گۆڕی و لەگەڵی چوومە دەرەوە.

نەبەز: کاکە ئەچین شێرکۆ دەبینین و زۆر ئاسایی بە تکات لێ دەکەم توڕە مەبە، ئەمڕۆ تەنها تەعاروفێک بکەن.

ماکوان: لەکوێ؟

نەبەز: لەماڵی تاڤان





ماکوان: ئەوە بەڕاستە؟ من یەکجار لەسەیرانێک لەگەڵیدا بووم منداڵێکم لێی هەیە، بڕۆمە ماڵەکەی دەڵێت سەرووەری مێردیشم کوڕێکی لێت هەیە، من چۆن دەچمە ماڵی بێ شەرەفی وا.

نەبەز: ئەی چی بکەین؟

ماکوان: بابێنە جێگایەک لەوێ یەکتر ببینین.

نەبەز: کوێ باشە پێیان بڵێم؟

ماکوان: خۆت بڕیار بدە، بزانە چ ئوتێلێک، سەیرانگایەک شوێنێک بدۆزەرەوە، تەنها ماڵی ئەوان نەبێت.

نەبەز کەمێک بیری کردەوە و تەلەفۆنی کرد بۆ سەیرانی خوشکی وتی نەسرین چو بۆ ماڵی پورم؟

سەیران: وا چاوەڕیی منە، من خۆم دەگۆڕم قاپ و قاچاخم شۆردووە و ئێستا دەڕۆین، نەبەز ماڵم پاک کردۆتەوە پیسی نەکەیتەوە، ئەم شەو نایەنەوە، ماڵ پیس بکەیت لەژیانتا فاصۆلیا ناخۆیت.

نەبەز: خەمت نەبێت من و ماکوان ئێوارە دەڕۆینەوە بۆ ماڵەوە.

سەیران: خەمی خەسرەوە سوریشم هاتە سەر، ئەو لەتۆ خراپترە.

کە وای وت دەنگم بەرز کردەوە وتم باش سەیران من لەنەبەز خراپترم، وەڵلا دەبێت نیو کیلۆ گوڵەبەڕۆژە بخۆین، لەتاواندا تەلەفۆنەکەی داخست شەرمەزار بوو نەیزانی من لەگەڵ نەبەزدام.

نەبەز: ماڵی ئێمە باشە، خۆ ئاساییە ئێستا دایکم و سەیران دەڕۆن، با بڕۆم تۆزێک شیرینی و شت بکڕم بۆیان دابنێین.

ماکوان: شیرینی چی؟ من زەهریان دەرخوارد ئەیەم، سەیران نەیوت ماڵەکە پیس نەکەن، نە چا، نە ئاو نە میوە و نە شیرینی هیچمان نییە،



یەک شت بکەیت نایەم، بۆ زانیاریت من دەمەوێت تەنها چڕوچاوی شیرکۆ ببینم بزانم شێوەی خۆمی تیایە.

نەبەز: کاکە بیکە بە خاتری خوا عەیبە، با میوەیەک تۆزێ جەرەس بکڕین هەر بۆ خۆمان دەیخۆین.

ماکوان: بەخوا دەمی لێ نایەن، تەلەدۆنیان بۆ بکە باملیان بشکێنن بێن.

نەبەز: تۆ بڕۆ بۆماڵەوە من دەچم دەیانهێنم.

ماکوان: جا تۆ دەچی باخۆیان بێن.

نەبەز: ماکوان وانابێت برا، تۆ وتت هەرچی بڵێم لە قسەم دەرناچیت، ئێ کاکە من قسەم کردووە تۆ ئیحتیرامی من بگرە، باشە.

ماکوان: لەبەر خاتری پێڵاوەکانی تۆ باشە.

چووینەوە بۆ ماڵی نەبەز کەسی لێنەبوو، سەیران ماڵەکەی جوان پاک کردبووەوە، سەلاجەم کردەوە بەس خەیاری تیا بوو، هەموو خەیارەکانم خوارد وتم نەوەک نەبەز بۆ ئەوانی بهێنێت، چاکەشم شاردەوە بۆ ئەوەی چا لێنەنێت، لەپڕ تەلەفۆنەکەم زەنگی لێدا نەبەز بوو وتی پێنج خولەکی تر لەماڵەوەین، کاتێک کە گوێم لە هاتنە ژورەوەیان بوو خۆم کرد بە تەوالێتەکەدا زیاتر لە دە خولەک لەوێ مامەوە بە تەلەفۆنەکەم خۆم مەشغوڵ کردبوو، کە هاتمە دەرەوە ئەوان لەبەرم هەستانەوە، بۆیە ئەو کارەشم کرد بۆ ئەوەی من لەبەر ئەوان هەڵنەسم بەخێر هاتنم کردن و بەلاچاو تەماشای شێرکۆم کرد.

سەروەر: کاک ماکوان ئەوە شێرکۆی کوڕتە!

ماکوان: خوای گەورە تەمەنی درێژ بکات، شێرکۆ لە پۆلی چەندی؟

شێرکۆ: مامە خەسرەو من لە پۆلی ٩م.

ماکوان: شێرکۆ گیان من باوکتم یان بڵێ بابە، یان بڵێ ماکوان باشە؟

دانیشتنێکی زۆر سارد و سەیر بوو، من تاقەتی قسەم نەبوو...

شیرکۆ: بەڵێ باشە.

ئەوانیش هەموویان زانیان من جەوم نییە و بێزارم.

ماکوان: ئەگەر دەکرێت من و شێرکۆ دەڕۆینە دەرەوە، دوایی لەگەڵ خۆم دەیهێنمەوە بۆماڵەوە، تا ناو بازاڕ دەڕۆین، شێرکۆ حەز دەکەیت؟

شێرکۆ: بەڵێ.

کەواموت سەروەر و تاڤان وتیان باشە، ئێمەش دەڕۆینەوە بۆ ماڵەوە با کاک نەبەزیش ئیسراحەتی خۆی وەربگرێت.

نەبەز: پەلە مەکەن من ئەتانبەمەوە، دوایش مامە خەسرەو و شێرکۆ بۆ کوێ چوون دەیانگەیەنم.

نەبەز ئەوانی برد و منیش دەستم کرد بە قسەکردن لەگەڵ شێرکۆ.

ماکوان: شێرکۆ چۆن زانیت من باوکتم؟

شێرکۆ: دایکم پێی وتم، کە بابە سەروەر باوکم نییەو تۆ باوکی ڕاستی منیت.

ماکواڕن: باشە کوڕی خۆم خۆشحاڵی ئێستا لەگەڵ منی؟

شێرکۆ: بەڵێ زۆر خۆشحاڵم، چونکە تۆ باوکی منیت.

ماکوان: ئەی لە من توڕە نیت کە ئەو هەموو ساڵە تۆم بەجێ هێشتووە؟

شێرکۆ: ناخۆشە، بەڵام حەدم نییە لە تۆ توڕە بم.

ماکوان: ئەمڕۆ چی بکەین بەیەکەوە، حەزت لە کوێیە بۆی بڕۆین؟

شێرکۆ: تۆ دەزانیت، بۆ هەرکوێ بڕۆیت لەگەڵت دێم.

ماکوان: ئەمڕۆ بەیەکەوە دەبین و حەزت لەهەرچی بوو پێم بڵێ.

شێرکۆ: تەنها ئەمڕۆ، ئەی ئەگەڕێیتەوە بۆ خاریج؟

ماکوان: نا مەبەستم ئەمڕۆ و هەموو ڕۆژەکانی ترە، بڕوا ناکەم بڕۆم بۆ خاریج، بۆ شوێنێکی زۆر دوور دەڕۆم، خۆشم زۆر باش شارەزاییم نییە لەو جێگایە، بەڵام تۆ ئێستا لەگەڵ منیت، حەز دەکەیت بڕۆین بۆ کوێ؟

شێرکۆ: تۆ کوێت پێ خۆشە، من نازانم.

ماکوان: پەلە مەکە با نەبەز بێتەوە، دەچین نان دەخۆین، حەز لە چی دەکەیت.

شێرکۆ: کەباب!

دەستم کرد بە پێکەنین لە دڵی خۆمدا وتم: پێویست بە فەحس ناکات، جیناتی خۆمی هەڵگرتووە، پێم وت: ئەچین بۆ بازاڕیش دوایی حەزت لە جلوبەرگیش بوو بیکڕە، باشە کوڕی خۆم؟

وردە وردە هەستم بۆی جوڵا، دیار بوو زۆر بە ئەدەب بوو، بەڵام لێم دەترسا تۆزێک قسەی خۆش و یاریم لەگەڵ کرد، تۆپێکی منداڵانە لە حەوشەی ماڵی نەبەز بوو لەگەڵیدا دەستم کرد بە یاری، بەڵام چەندە دڵخۆش بووم پێی ئەوەندەش خەم دایگرتبووم.

نەبەز هاتەوە چوین بۆ کەبابخانە و جارێکی تر مامە پیرەکەم لێ پەیدا بویەوە، خۆی هات بۆلام. لەبەری هەستامەوە و داوای نەفەرێک کەبابم بۆ کرد بە حورمەت و ئەدەبەوە لە خزمەتیا بووم.

مامە پیرە یان شێخ عەبدوڕەحمان: ئەم کوڕە منداڵکارە کێیە لەگەڵتا؟

نەبەز: جا تۆ حەقت چییە؟

ماکوان: زۆر بەڕێزەوە، ببورە شێخ عەبدورەحمان، ئەوە کوڕی منە ناوی شێرکۆیە.



شێخ عەبدوڕەحمان: کاکەی دڵ، جارێک پیاوێک هات بۆلای مەلا نەصرەدین پێی وت جەنابی مەلا نەصرەدین من زۆر دەوڵەمەندم، هەموو پارەو سەروەتم لەگەڵ خۆم هەڵگرت بۆ ئەوەی بەدوای خۆشیدا بگەڕێم، بەڵام دەستم نەکەوت، بەڵام زۆری تر دەبینم کە تەنها ئاسمان و زەوی هەیە و کەچی دڵی خۆشە.

لەوکاتەدا مەلا نەصرەدین بەو پیاوەی وت پارەو ئاڵتونەکانت لەناو ئەو کۆڵە پشتەدایە؟

کابرای دەوڵەمەندیش وتی بەڵێ؛ مەلا نەصرەدین لەشانی داکەند و ڕایکرد، هەموو کەشکۆڵەکەی پڕ بوو لە پارە، کابرای دەوڵەمەند دوای مەلا نەصرەدین کەوت و هاواری دەکرد دز بگرن، دز بگرن، مەلا نەصرەدینیش ڕایکرد بۆلای دارێک، پێش ئەوەی بگاتە دارەکە کەشکۆڵە پڕ لە پارە و ئاڵتونەکەی بۆ فڕێداوە، کابرای دەوڵەمەند لەخۆشیدا باوەشی کرد بە کەشکۆڵەکەیدا، دوای کەمێک پشوو لە ژێر دارەکەدا مەلا نەصرەدین بانگی کابرای دەوڵەمەندی کرد و پێی وت: زۆرجار دەبێت ئەوەی خاوەنیت لەدەستی بدەیت، دوایی بەدەستی بهێنیتەوە بۆ ئەوەی بەهاو قیمەتی بزانیت.

ماکوان: بڕوا بکە من بەها و قیمەتی نیعمەتەکان دەزانم، جەنابی شێخ هەمیشە لەدەرگای خوای پەروەردگارم داوەو بێجگە زاتی بەرزی پەناو هانام بۆ کەس نەبردووە تا ئەو ڕۆژەی دەمرم هەر لە دەرگای خوای تاک و تەنها دەدەم.

شێخ عەبدوڕەحمان زۆر پێکەنی وتی: کێشەی تۆ لە دەرگاکەدایە، کە عادل خوای گەورە دەرگای دانەخستوە و کراوەیە، تۆ بەناحەق لەدەرگا ئەدەیت بڕۆ ژورەوە.

خواردنەکەیان هێناو ئەو هەستا ڕۆشت وتی دابەشی بکەن بەسەر خۆتاندا.



ماکوان: توخوا مەڕۆ لەگەڵماندا بە.

شێخ عەبدوڕەحمان: سوێند مەخۆ زۆر درەنگە دەبێت بڕۆم، بەڵام لەبەر سوێندەکەت کەمێکی کە دادەنیشم. کەمێکی کە دانیشتەوە لامان کە نەبەز زانی من بەجدی قسەی لەگەڵ ئەکەم و ئەویش جدییە لە قسەکانیا بۆیە بێدەنگ بوو و گوێی لێ گرتین.

ماکوان: جەنابی شێخ هیچت پێویست نییە؟

شێخ عەبدوڕەحمان: کاکە عادل هەرگیز هەوری ڕەش کاریگەری لە تیشکی خۆر ناکات، دەشێت ماوەیەک بەری بگرێت، بەڵام هەر دەڕەوێتەوە، لە ناختدا نەهێڵی هەوری ڕەش و تەمی تاوان ڕوناکی و گۆڕانکاری بکات بەردەوام بە زۆری نەماوە، ئەمەی وتو هەستا ڕۆشت، وتی خوای پەروەردگار بەرەکەت بخاتە ڕزقی زانستت، السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته.

ماکوان: وعلیکم السلام.

کەوتی بەردەوام بە و زۆری نەماوە، وتم تەواو کاتی مەرگم نزیکە بۆیە وای وت.

نەبەز: ئەم پیاوە ئاسایی نییە ماکوان.

ماکوان: بەدڵنیاییەوە بەڵام کێیە و چییە و چۆنە نازانم.

نەبەز: ئەی چۆن پێی دەڵێیت شێخ عەبدوڕەحمان؟

ماکوان: ئێ خۆی وتی، شێخ واتا پیر و هەموومان بەندەی ڕەحمانین، کێ ئەڵێت ئەوە ناوی خۆیەتی.

نەبەز: ئێ بۆ پێت دەڵێت عادل؟

ماکوان: ناوی خەسرەوی کردووە بە عەرەبی.



واز لەوە بێنە با شێرکۆ بەرین بۆ جێگایەک هەندێ جلوبەرگ و مۆبایلێکی بۆ بکڕم، مۆبایلی نییە، تا من پەیوەندیم لەگەڵیدا هەبێت، بڕۆین بۆ کوێ؟

نەبەز: مۆڵێک هەیە لای فولکەی قۆری و پیاڵەکە شتی زۆر جوانی لێیە دەچین بۆ ئەوێ.

وتم بابڕۆین، لەڕێگا پرسیارم لە شێرکۆ دەکرد و دەمدواند لەباسی ئەوەی نوێژ دەکات و ئایا دەزانێت قورئان بخوێنێتەوە، لەم قسانەدا بووین دوکتۆر چالاک پەیوەندی پێوە کردم کە وەڵامم دایەوە وتی: کاک ماکوان ئەمڕۆ کۆبونەوەمان هەبوو لە باخەکە بۆ نەهاتویت، مەگەر وەعدت نەدا بێیت؟

ماکوان: وەڵاهی ڕاست دەکەیت من زۆر داوای لێ بوردن دەکەم، ئەمڕۆ زۆر سەرقاڵ بووم، خوا شاهیدە کە جەنابت فەرموت بیرم کەوتەوە، عوزرم قبوڵ بکەن، ئیتر وایە تووشی نەخۆشی سەرەتانی مێشک بووم.

نەبەز پێیدا کێشام و بە ئیشارەت وتیی چی دەڵێت شێرکۆ لە دواوە دانیشتووە.

داوای لێبوردنم کرد کە ناتوانم بڕۆم بۆ دانیشتنی دواتر هەوڵ ئەیەم ئامادە بم.

لەگەڵ نەبەز و شێرکۆ چووین بۆ ناو بازاڕەکە و بە شێرکۆم وت بڕۆ بە ئارەزووی خۆت جلوبەرگ هەڵبژێرە، وتم جلوبەرگو هەندێک دیاری بۆ بکڕم تا وردە وردە ئاشنا دەبین بەیەک و خۆشەویستی لەنێوانماندا دروست دەبێت، دوای ئەوە تا ماوم لەگەڵیدا دەبم و فێری ئەوەی بکەم کە من دەمەوێت.

لەناو بازاڕەکەدا هەر دەهات و دەچوو دەیوت باوکە ئەوە باشە، منیش ڕای خۆمم لەسەر دەوت یان دەیوت باوکە ئەوە جوانە، لەپڕ چەند هاوڕێ و ناسراو و کەسوکاری خۆمم لێ پەیدا بوو ئەویش هەر دەهات و دەیوت

باوکە ئەوە جوانە، ئەوە باشە تا یەکێک لەوان وتی کاک ماکوان ئەوە کوڕی خۆتە؟

ماکوان: نا گیان؛ ئەوە کوڕی کاک نەبەزە لەباوکی توڕەیە ئەڵێت ئیتر بە تۆ دەڵێم نەبەز و بەتۆش دەڵێم باوکە.

دەیەوێت نەبەز توڕە بکات،، باش بوو بەو درۆیە خۆم دەرباز کرد لێیان، دوایی خۆم بەزەیم بە شێرکۆدا هاتەوە بەزەیشم بە خۆمدا دەهاتەوە دەموت ئەگەر ئەم دەردەم نەگرتایە ئەمبرد بۆ ئەوروپا لەوێ لەگەڵ ڕەوشەکە ڕادەهات وەکو کوردستان نییە، بەڵام هەموو دەرگاکانم لەسەر داخراوە.

تا درەنگانێکی شەو بەیەکەوە بوین ئەوەی حەزی لێی بوو بۆم کڕی دوای ئەوە نەبەز بردیەوە بۆ بەردەرگا و دایە دەستی دایکی، ئەو بێ چاووڕووەی دایکی دەیوت توخوا وەرنە ژورەوە پشویەک بەن بە نەبەز.

نەبەز هاتەوە ناو سەیارەکە و وتی: ئەمڕۆ زۆر ئاسوودە بینیمیت لەگەڵ شێرکۆدا وابووو؟

ماکوان: نەوەڵڵا، حەز دەکەم کەلەی سەرم بتەقێت و لەم ژیانە ڕزگارم بێت.

هەروام وت گەنمی خوشکم تەلەفۆنی کرد، بە نەبەزم وت ئاگات لێیە قوڕەکە چەندە خەستە؟

ماکوان: بەڵێ گەنم گیان باشی خوشکە جوانەکەم؟

گەنم: کاکە لەکوێیت ئەبێت ئێستا بتبینم.

ماکوان: خێرە خۆ هیچ نەبووە؟

گەنم: کاکە تکا دەکەم دەبێت بتبینم، هەر ئێستا.

ماکوان: بێم بۆ کوێ؟



گەنم: وەرە چێشتخانەی شکار، لای بەرگدوورێکی ئافرەتانەوەیە وەرە ئەو جێگایە منیش دێمە ئەوێ، باشە؟

ماکوان: زۆر باشە وا هاتین ئاگات لەخۆت بێت.

بە نەبەزم وت دەمانچەت پێیە؟

نەبەز: دەمانچەکەی خۆت لەناو داشبۆردەکەدایە دەریبهێنە.

منیش دەمانچەی خۆم پێیە، خێرە چی بووە؟

ماکوان: نازانم، لێخوڕە بۆ ئەم ناونیشانە، یاخوا هیچ ڕووینەدابێت، بەڵام گەنم زۆر نارەحەت و سترێس دیار بوو، دڵنیام شتێک بووە.

نەبەز: بڵێیت دایکی یان باوکی مردبێت یان شەڕیان کردبێت؟

ماکوان: ئەگەر لەنێوان دایکی و جەمال بێت چاویان دەرێ، ئەمری ئەژی شەڕ دەکەن بۆ من گرنگ نییە، بۆ من گەنم گرنکە.



# ئاشکرا کردنی پلانی جەمال لەلایەن گەنمەوە

من و نەبەز زوو کەوتینە ڕێ بەدەم بانگەوازەکەی گەنمەوە، چووینە ئەو دوکانەی کە ناونیشانی دابوینێ، دیار بوو بەناوی جلوبەرگ دوورینەوە هاتبووە دەرەوە لەماڵ و هاتبوە ئەوێ، گەیشتم بە گەنم و باوەشی پیا کردم وتی: کاکە لەگەڵ بابە جەمال چی ڕوویداوە لەنێوانتاندا؟

ماکوان: هیچ ئەو ڕۆژە هات بۆلام خۆی و کەسێکی تر بوون، وەکو پاسەوانی بوو لەدەرەوە وەستابوو منو جەمالیش هەر زۆر ئاسایی قسەمان کرد، بەڵام ئەو شڵەژا بوو، چی بووە گەنم گیان بیڵێ.

گەنم: وەڵاهی کاکە خۆشم سەری لێ دەرناکەم بەڵام باشترە پێت بڵێم نیوەڕۆ ویستم بێم بۆلای ئەم خەیاتە، ویستم داوای سەیارەیەک بکەم کە نزیک بوومەوە لە ژووری دانیشتنەکەمانٛ گوێم لێ بوو دایکم و جەمال قسەیان دەکرد، بابە جەمال وتی: کارێک ئەکەم بە ماکوان کە لە ژیانیدا لەبیری نەچێتەوە، من خۆم داگرت دایکم وتی: ئەمە چۆن ڕوویداوە، ئەویش وتی: بە سوودفە لەسەر گۆڕی باوکی ماکوان یەکتریان بینیوە، ئیتر جەمال وتی بە دایکم خەریکی پلانم خەمت نەبێت کۆتایی بەو کێشەیە دەهێنم، منیش نازانم کێشەکە چییە؟

لە نیوەڕۆوە خەمی تۆمە ئێستا بڕیارم دا پێت بڵێم، بەڵام کاکە خەسرەو توخوا ئاگات لە خۆت بێت، نامەوێت تۆم لەدەست بچێت.

ماکوان: گەنم گیان مەترسە، بزانە تورەت کردوون، باسی منت زۆر کردووە ڕقی ئەوانت هەڵساندووە، ئەو ناتوانێت هیچ بکات، ئەوپەڕی هەڕەشەی کوشتنم لێ دەکات.

ئێ خۆ من و مەرگ زۆر ڕەفیقین من خۆم داناوە بۆ مردن تۆ باش دەزانیت، ئەی نەتزانی پلانەکەی چییە؟

گەنم: نەبەخوا، هەر ئەوەندەی وت و چووە دەرەوە، دوایی لەگەڵ دایکم قسەم کرد وەکو شتێکم لێ بشارێتەوە، وتی نەچویت بۆلای خەسرەو؟ ئەی وت بۆ نایەت بۆ ماڵمان و ئەم پرسیارانەی دەکرد.

ماکوان: وەڵڵا گەنم گیان من ئێستا خەمی تۆمە نەک خەمی خۆم، ئەگەر شتێک دەزانی بەرانبەر بە تۆ دەیکەن، هەر ئێستا لەگەڵ خۆم دەتبەم با ئەوانیش سیر بخۆن و زوڕنا لێبەن.

نەبەز: بەیارمەتی دەتوانم من ڕای خۆم بڵێم؟

پێمان وت فەرموو ڕای خۆت بڵێ ئەویش وتی: من پێم باشە دادە گەنم با هەر لەماڵەوە بێت، ئەگەر شتێک ڕوویدا ئاگادارمان بکاتەوە، هەوڵبدات تەلەفۆنێکی نهێنی دەست بخات پەیوەندی بە تۆوە یان منەوە هەبێت بۆ ئەوەی ئەگەر تەلەفۆنەکەی خۆشیان لێسەند دانەیەکی زیادەی لابێت، ئاگاداری ئێمە بکاتەوە.

گەنم: ئەتوانم ئەوە بکەم، ژمارەیەکی ترم هەیە، دەتوانم بەکاری بهێنم لای خۆتان بینوسن.

ژمارەکەیمان نووسی و پێشنیارەکەی نەبەز زۆر باش بوو، ٣٠٠ دۆلارم دایە وتم ئەوە بشارەوە با پێت بێت، نەوەک پارەو شتت نەیەنێ و چیت هەیە لێت بسەنن و بۆ ئەوەی نەتوانیت بێتە دەرەوە، هەرچەندە وتی پارەم زۆر پێیە، بەڵام هەردامێ، نەبەز ئامۆژگاری باشی کرد لەڕووی ئەمنیەوە کە چ جۆرە جلوبەرگێک لەبەر بکات و چ جۆرە پێڵاویک لە پێ بکات و حازر بێت بۆ ڕوودانی هەموو شتێک، کلیلی ماڵەوەمان لە گەنم وەرگرت و خێرا لەسەر کاغەز و تەپەدۆر وێنەی جۆری کلیلەکەمان کێشا و هەڵکەند بە مۆبایلەکانیشمان وێنەمان گرت وتمان ئەگەر خوانەخواستە شتێک بوو زوو دەگەینە لات.

داوامان لێ کرد کە زوو بڕواتەوە بۆ ماڵەوە تا سەعات ١٢ی شەو هەموو سەری کاتژمێرێک نامەیەک بنێرێت کە هەموو شت باشە، دواى

کاتژمێر دوانزەش ئەگەر بەخەبەر بوو هەر چەند کاتژمێرێک جارێک ئاگادارمان بکاتەوە لە وەزعی خۆی، هەروەها با گوێ بگرێت بزانێت کە چی ڕوودەدات و بەتەمای چین، ئێمەت لەگەڵە خەمت نەبێت.

گەنم: من خەمی تۆمە کاکە، ئێستا تۆ وات کرد کەمن خەمی خۆم بێت، هەر تۆ سەلامەت بیت من هیچم ناوێت، بەخوا بڕواناکەم هیچ کێشە بۆ من دروست ببێت.

ماکوان: گەنم گیان هیچ ڕوونادات بەڵام پێشبینیە و دەبێت حەزەری خۆمان وەرگرین و لە ئامادە باشیدا بین، باشە گوڵەکەم؟

گەنم: باشە کاکە گیان، تۆ چی دەڵێیت وا دەکەم.

ماکوان: ئێمە دەڕۆین بەگەیشتنت بە ماڵەوە تەلەفۆنێک بۆ من بکە، با دایکت و جەمال گوێیان لێ نەبێت، بۆ ئەوەی نەزانن کە یەکترمان بینیوە، وا خۆت نیشان بدە کە من کەسێکی زۆر ئیهماڵم و هەر گوێت پێنادەم، باشە؟

گەنم: زۆر باشە وا دەکەم، من دەبێت بڕۆم خواتان لەگەڵ.

ئەو ڕۆشت من و نەبەزیش دوور بە دوور شوێنی کەوتین تا گەیشتە ماڵەوە، لەو ناوە ماینەوە تا درەنگانێک، پاشان تەلەفۆنی بۆ کردم ئەوەی پێمم وتبوو کردی، من و نەبەزیش کەوتینە بیرکردنەوە.

نەبەز: چی دەبینیت و تێڕوانینت چییە و چۆن لێکی دەدەیتەوە؟

ماکوان: دوو سیناریۆ دەبینم، یەکەم ئەوەیە کە باوکم زۆری بۆ بەجێ هێشتووین و بەشی زۆری دەگەڕێتەوە بۆ ئێمە لە ڕووی یاساییەوە، جەمال و دایکی گەنم دەترسن لەسەروەتەکەیان، دووەم یان جەمال و دایکی گەنم لەوە دەترسن کێشەکە گەورەتر بێت و لەسەر سومعە و کەسایەتی جەمال بکەوێت؟ لەم دوانە زیاتر خوێندنەوەی ترم بۆ ناکرێت لە ئێستادا، ئەی تۆ چی دەڵێیت؟

نەبەز: من وای نابینم، هەردوو گریمانەکە دورە کە تۆ خوێندنەوەت بۆ کردووە، بۆ ئەوەی باوکت زۆری بەجێهێشتووە ناگاتە چارەکێکی سەروەتی جەمال، جەمال خاوەنی ملیۆنان دۆلارە نەک دیناری عێراقی، خۆت باش دەزانیت جەمال لەناو خەڵکدا تەنها گوێ بە پارە دەدات تەنها ترسی لەدەستدانی سەروەتی خۆیەتی، سومعە لای ئەو هیچ نییە، ئەو پارەی هەبێت گوێ بەهیچ نادات، هەموو کورد و کوردستان بۆ پێکی شەوێکی دەفرۆشێت، لەبەر حورمەتی تۆ و گەمی خوشکت قسەی تر ناکەم.

ماکوان: دەمخۆش نەبەزی برام، خۆشم دەزانم ئەی تۆ دەڵێی چی؟

نەبەز: ئەگەر بڵێم نازانم لات ئاسایی بێت، هەرچی سەر دەهێنم و سەر دەبەم بیرم بەلای یەک شتا دەڕوات، ئەویش زۆر بەهێز نییە، لەوانەیە بڵێت توشم بووە بە تووشی ماکوانی ڕۆژنامەنووسی ئیسلامی کە ئەوەندەی ویستی دەیکات و دەیڵێت و ئاشکرام دەکات، ئەگەر لێم نزیک بێتەوە لەڕێگای گەمەوە، هەرچەندە جەمال وەکو ڕێوی وایە فێڵباز و تەڵەکەبازی وەکو خۆی نییە.

ماکوان: جا پێشتریش ئەو کوڕانەی لەگەڵم هاوکارن دەستیان نەپاراستووە، هەرچییان دەست کەوتووە لەسەری لە گۆڤاری ڕێگا بڵاویان کردۆتەوە.

نەبەز: هەرچەندە ئەوانەی وتمان هەمووی لاوازە، بەڵام با ئێمە بڵێین هەموو ئەم هۆکارانەن، بەڵام چی لەتۆ دەکات، ئەتفرێنێ؟

پێکەنیم و وتم: وەڵڵا ئەبم بە بار بەسەر خۆی و پاسەوانەکانیشیەوە.

نەبەز: یان بڵێین تەقەت لێ دەکات و تیرۆرت دەکات.

ماکوان: ئێ من هەر دەمرم بەمە بەسەر ئەو خوێڕیەدا ساغ ببمەوە باشترە، بەڵکو دوای من کەسێک تۆڵەم بکاتەوە.



نەبەز: من دەمەوێت تۆ نەکەویتە داوی، دەنا تۆڵە سەندنەوە ئاسانە، پێشنیارێکم هەیە هیوام وایە لێم وەربگریت و بەقسەم بکەیت.

ماکوان؛ منو تۆ بیفڕێنین یان تەقەی لێ بکەین؟

نەبەز: نا بەڵکو بیترسێنین.

ماکوان: چۆن؟

نەبەز: پلانێکم لایە لەگەڵ زۆر کەسی تر بەکارمان هێناوە سەریگرتووە، نە شەڕ دەکەین نە تەقە، نە کەسیش دەفڕێنین.

ماکوان: ئەمەی تۆ باسی دەکەیت مەتەڵە پلان نییە، ئەی جنۆکەی بۆ دەنێریت؟

نەبەز: نا، چوار پێنجێک لە ئەفسەرەکانی خۆمان بانگ دەکەم بەجلی سەربازییەوە ڕۆژێک لە دەوامەوە تۆ دەبینن و تۆ برۆ ژورەوە هەموو بەدەورتا دەبین و ئەوانەی کە جلی سەربازی لەبەر دەکەن لەداڵ و نەجمە کەمتریان نەبێت و یەکە یەکە بانگمان بکە زۆر گەورە و وەکو بەرپرس مامەڵە بکە، جەمال نەک دەترسێت بەڵکو هەرچی پلانی هەیە لە ترسا کۆتایی پێدێنێت، ئەمە سەرەتا زۆر باشە بۆ ئەوەی لانی کەم پلانەکەی دوابخەین زیاتر بە خۆیدا بچێتەوە و تۆش گەورەتر تەماشا بکات و حسابی زیاتر لەسەر تۆ بکات، تێمە گەنمان هەیە لایان هەوڵ ئەدەین زانیاری لێ وەربگرین، پێت چۆنە؟

ماکوان: بیرۆکەکە باشە، بەڵام ئەم چوار و پێنج کەسەر کێن و کارەکە دەکەن لەگەڵماندا، گریمان کردیان دوای نەبێتە کێشە بۆ تۆ یان جەمال سوودی لێ وەرناگرێت بەکاری بهێنێتەوە دژمان، ئەو لەگەڵ بەرپرسی گەورەتردا تێکەڵە.

نەبەز: خەمی ئەوەت نەبێت لەکوردستان لای هەردوو دەسەڵاتەکە سەنتەری هێز لای یەک کەس نییە، زۆرێک لە دەزگا و خەڵکەکان هێز و توانایان هەیە، تەنانەت بەرپرسەکان خۆیان لەخۆیان دەترسن.

ماکوان: کەسەکان لە مێشکتا هەیە، یان دات نەناون هەر پێشنیار و سیناریۆیە؟

نەبەز: نا کەسەکان ئامادەن، بەڵام نازانم تۆ ڕازی دەبی. بۆ دوانیان تۆ دەیانناسی ئێستا کێشەکە تۆیت؟

ماکوان: من بۆ؟

نەبەز: دوانیان هاوڕێی کۆنن، بەڵام تۆ قسەیان لەگەڵ ناکەیت لەساڵی ١٩٩٦وە ئەوانی تریش هاوڕێی خۆمن و هەموو زابتن.

ماکوان: کێن؟

نەبەز: هیوا و وریا، هیوا ڕەش داڵی هەیە و وریا حاجی حەسەنیش سێ ئەستێرەیە، ئەوانیتر هەموو ڕەفیقمانن، بەڵام تۆ نایانناسیت.

ماکوان: وریای حاجی حەسەن دەمێکە ئاشت بوینەتەوە، بەڵام هیوا ڕەش هەر زۆر سەخیفە و ڕەشە لەبەرچاوم، ئیهمالی بکە با ئەوی تیانەبێت.

نەبەز: بەخوا هیوا زۆر کوڕی چاکی لێ دەرچووە، نەمزانیبوو لەگەڵ وریا ئاشت بوونەتەوە، باسی نەکردووە.

ماکوان: سێ ساڵ بەرلەئێستا بوو وابزانم، لەگەڵ دوکتۆر موسەنا کۆڕێکم هەبوو هاتبووە کۆڕەکە هات بۆلام وتی هاتووم پاسەوانیت بکەم نەهاتووم بۆ کۆڕەکە، باوەشم پیا کرد و وتم ئەی نەهاتوویت ڕاپۆرتم لەسەر بنووسیت دەستمان کرد بە پێکەنین و وێنەیەکیشمان بەیەکەوە گرت، پێشتریش گوایە هەر لە تۆڕی پاڵتۆڵک بەرگری لێ دەکردم، بەڵام من نەمدەزانی کە ئەوە وریایە. لەژووری پێشمەرگە دێرینەکانی یەکێتی بوو،

ناوەکەشی پێوتم، وریا زۆر جیاوازە لەگەڵ هیوا ڕەش دا، من کاتی خۆی لەگەڵ وریادا کە دەنگە دەنگمان بوو زۆر ئاسایی بوو من بەرگریم لە یەکێتی دەکرد ئەویش بەرگری لە حسک دەکرد لەسەر ئەوە دەنگە دەنگەکە دروست بوو شتی حیزبی بوو، بەڵام هیوا زۆر خوێڕییە هەر نامەوێت بیبینم، تۆ لەبیرتە نەژادی شێخ حامی دایە بەر چەقۆ لەسەر پارەی قاورمە؟ ئێ من شەڕەکەم لەسەر نەژاد بوو کەچی ئەو خوێڕییە دووکانەکەمی سووتاند کە چوومە سەریشی سوێندی خوارد وتی من نەبووم.

نەبەز: دەسوێند بە خوا لەم ڕۆژانەدا باسمان کردی ئەی وت خەسرەوە سورمان کەمە، زۆر بەڕێز و پیاوانە باسی کردی، وتیشی قەرزاری خەسرەوم ئەمەوێت بیبینم و داوای گەردن ئازایی کێ بکەم، چووە بۆ حەج و دوو جاریش چووە بۆ عومرە کە جارێکیان بە یەکەوە چوین.

ماکوان: ئەمە هیوا ڕەش، بەخوا بۆیە وا دەڵێیت دەتەوێت دڵی من باش بکەیت، بڕواناکەم هیوا هەرگیز ببێت بە پیاو.

نەبەز: سوێدت بۆ دەخۆم ئەوەی وتم ڕاستییە، بەخوای گەورە ئەگەر پێت خۆشە بانگی دەکەم بۆ نووسینگە و داوای لێبوردنت لێ بکات و چیش بڵێیت ئەو ئەداتێ، بەدواتا دەگەڕێت داوای گەردن ئازاییت لێبکات حەقی ئەوەی دووکانەکەی سووتاندوویت.

ماکوان: نەبەز توخوا لە شەڕی هیوا لامە، خۆ شەڕی پیاوانە نییە کە شەڕیش دەکات لەدواوە خەنجەرت لێ ئەدا، خۆ من ئەوکاتە ئەمتوانی لۆریەکەی باوکی بسووتێنم بەڵام بەکاری نامەردیم زانی.

نەبەز: ئەڵێم سوێند بەخوا بەدواتا دەگەڕێت داوای لێبوردنت لێبکات، پێی وتوم دوکانەکەی حساب دەکەین بە پارەی ئەمڕۆ هەمووی بۆ دەگەڕێنمەوە.

ماکوان: بەهەرحاڵ تۆچی دەڵێیت باوا بێت.





ئەو شەوە من و نەبەز گیرمان خواردبوو بەدەستی گەمەوە، ئێمە وتمان هەر سەری سەعاتێک جارێک ok بنێرێت کەچی ئەو لە سەعاتێکدا دووجار دەینارد، ئەو شەوە تەلەفۆنەکانمان پڕ بوو لە نامەی گەنم.

وەکو ڕۆژانی ئاسایی لەشاری سلێمانی دەڕۆشتم بۆ نووسینگە و لەهەمان کاتدا چاوەڕوانی چرکەساتی ئازار و مەرگ بووم، نووسینگە قەرەباڵغ بوو ئەو کاتانەی کە من لە کوردستان بومایە، لەگەڵ دیزاینەری وێب سایت و گۆڤاری بزاڤ خەریکی دیزاینی وێب سایتی بزاڤ بوین (کاتەگۆرییەکانم جیادەکردەوە) لەپڕ هیواڕەش و وریا و نەبەز خۆیان کرد بە نووسینگەدا، منیش لەبەریان هەڵسام و بەرەو ڕوویان ڕۆشتم بەگەرمی بەخێرهاتنم کردن و هیوا وتی: بەخوا ترسام من دەربکەیت.

ماکوان: چەند جار لەگەڵ پێشڕەوی برام دەمە بۆلەم بووە و ئاشتیشمان بۆتەوە، تۆش پێشڕەوی بۆ من ئێمە برای یەکین.

هیوا: بەڕێزی مامە خەسرەو چاومانی.

نەبەز داوای کرد بەیەکەوە بچین بۆ جێگایەک بەیادی جاران و هەندێک قسە بکەین.

ماکوان: ئەگەر یادی جاران بێت دەبێت بڕۆین بۆ کارێزی وەستا شەریف یان نادی هێشو، ئێ باوەڕ ناکەم ئێستا کەسمان بخۆینەوە.

وریا دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: ئەی بۆ نەچین بۆ کەباب خواردن، هیوایەتی تۆیە و کەبابێکم دۆزیوەتەوە زۆر خۆشەو وەستاکەشی زۆر پاکوخاوێنە.

ماکوان: بەو مەرجەی میوانی من بن.

نەبەز: میوانی منن چونکە من ڕێکمخستووە.

هیوا: نا میوانی منن لە بەر ئەوەی مام خەسرەو لە ئەوروپا هاتۆتەوە.







وریا: ئێ من وتم ئەچین بۆ ئەوێ و من دەعوەتم کرد، تۆ بابڕۆین دوایی ڕێ ئەکەوین.

هەرچوارمان هەڵسماین چووین بۆ نانخواردن، چووینە جێگایەک کەبابێکی ناخۆش، پڕ چەوری و چەق و بەز، پڕ لە وردە نان هەر مۆڕەمان لە وریا دەکرد، کە هاتینە دەرەوە وریامان بە قسە شۆرد، هەر نەیدەوێرا قسە بکات یەکسەر باسی کەبابەکەمان بۆ دەهێنایە پێشەوە، چووین بۆ کافتێریایەک لەسەرچنار لەوێ دانیشتین نەبەز وتی مامە ماکوان تا ئەم ساتەش هیچم لەگەڵ ئەماندا باس نەکردووە، ئەمان هەموو وەکو پێشڕەون، ئەگەر ڕازی بیت با لێرە باسەکە بکەینەوە، نەبەز زۆر وریا بوو هەموومانی خستە ناو ئەمری واقیعەوە و منی ئیحراج کرد، منیش ناچار وتم پێویست ناکات بۆ خۆشی هاتوین ئەو باسە لەبیر بکە.

وریا: یان هەر باستان نەکردایە یان کە مادام نەبەز باسەکەی کردەوە دەبێت بزانین چییە.

هیوا: مامە خەسرەو بۆچی ئێمە بە برای خۆت نازانیت، بەس نەبەز براتە؟ ئێ ئەگەر شتێکمان پێ نەکرێت دڵنیابە قسە ناکەین.

ماکوان: وەڵڵاهی مامە هیوا و کاک وریا ماوەی چەند ڕۆژێکە لە ئەوروپا گەڕاومەتەوە بۆ ئەوەی پشویەک وەربگرم، خوا شاهیدە دنیا بەسەرمدا ڕووخاوە، نازانم چی بکەم و چۆن بکەم و لەکوێوە دەست پێ بکەم.

هیوا: تا لای مام جەلال دەتوانم بڕۆم، کێ ئیزعاجی کردوویت؟

ماکوان: کێشەکە نە بە مام جەلال چارەسەر دەبێت نە بەهیچ دەسەڵاتدارێک، کێشەی یەکەمم تەنها بە دەستی خوایە، دووەم دەشێت ئێوە هاوکاریم بکەن، سێیەم کەس ناتوانێت هاوکاریم بکات و تا تەوقی سەرم هەر قوڕە.



من و نەبەز ئەوەی لەماوەی ١٢ ڕۆژدا بەسەرم هاتبوو بۆمان گێڕانەوە، هەموویان بە خۆشمەوە زۆر بێتاقەت بووین، چارەم نەبوو دەبوو من ژینگەیەکی خۆش دروست بکەمەوە بۆیان، نەدەکرا وا بەجێیان بهێڵم، هەرچەندە ئەوان منیان زۆر ماندوو کرد بە پرسیار و وەڵام، کە چی بکەن و چی نەکەن، چارەسەری نەخۆشییەکەم چییە، بەڵام لە ئەنجامی قسەکانی هیوادا گومانێکم بۆ دروست بوو بەس زۆر گرنگیم نەدا بەو باسە لەبەر شیرکۆ وتم نەوەکو لە کۆتاییدا هەر کوڕم بێت.

کە باسی تاڤانە ڕەش و سەروەری مێردیمان کرد هیوا وتی: زۆر کێشەی ئەخلاقییان لەسەرە لە ئاسایش، بەڕێوەبەری ئاسایشی ئەو ناوچەیە هاوڕێی هیوا بوو.

هیوا وتی مامە بڕوایان پێ مەکە بەهیچ شێوەیەک، ئەوانە ساختەچین و دوایی زۆر شتی ترت بۆ باس دەکەم، بەڵام ئێستا نا، لەسەر باسی گەمی خوشکت قسە بکەین و چی لە جەمال بکەین، نەبەز و هیوا پلانیان دانا کە ئەوان بەجلی سەربازییەوە کۆمەڵێک سەرباز ببەن لەگەڵ خۆیان و بڕۆنە ئەو ناوە لەگەڵ هیوا و جەمال و وریا و ئەفسەرێکی تری هاوڕێیان، ئەوان لەوناوەدا دابنیشن من دەڕۆم تەماشای سەیارە بکەم، منیش کاتێک لە جەمال دەخوازم کە بڕۆم بۆلای و داوای من لەجەمال ئەوە بێت کە دەمەوێت بۆ ماڵیان بەڵام بە تەلەفۆن دەڵێم جێگای کارت لە کوێیە و دەمەوێت بێم بۆلات.

دوای ئەوەی پلانمان داڕشت وردەکاری باسەکەمان کرد، داوایان لە من کرد کە ئێستا تەلەفۆن بۆ جەمال بکەم.

ماکوان: پەلە مەکەن با قسەیەک لەگەڵ گەنم بکەم بزانم هیچی نوێ ڕووی نەداوە، تەلەفۆنم کرد بۆ گەنم و هەموو شتێک ئاسایی بوو ئینجا تەلەفۆنم کرد بۆ جەمال و داوام لێکرد بەیانی کاتژمێر ٤ی عەسر بیبینم یان دوای نوێژی عەسر ئەویش وتی زۆرباشە وەرە بۆ پێشانگای سەیارەکەم لەوێ چاوەڕێتم، پاشان نەبەز ئاگاداری کردمەوە لە دوای ئەم نمایشە بزانین

هەڵویستی چی بێت، بەڵام سبەینێ زۆر ئاسایی وەریبگرە کە تەحیەمان بۆ کردی وەکو ئەوە وابێت لات ئاساییە دەبێت هەروات بۆ بکەین، نەک بڵێیت برای گەورەن ڕێزتان هەیە و ئەم شتانە نەبەکار مەهێنە سوپاس کورِم زۆرباشە، ئاسایی بەرەوە، هەر تەحیەیان بۆ کردی لە ئەفسەرەکان دەست بەجێ بڵی ئاسایی ببنەوە لەدەوامدا نین، بەم شێوەیە ئەگەر دوای ئێمە ڕۆشتین تۆ زۆر دامەنیشە لەگەڵیدا و ئەگەر پرسیاری لێ کردیت بڵێ تەنها هاوڕێمن و ڕێزی هاوکاری یەکتری دەگرین و هەرچی لێپرسیت دەربارەی ئیشوکارت بەلاچاو مۆرەیەکی لێ بکەو دوایی پێبکەنە بەدەمییەوە هیچی تر مەڵێ، ئیتر ئەویش دڵنیابە پرسیار ناکات.

کاتێکی زۆر خۆشمان لەگەڵ ڕەفیقە کۆنەکانمدا بەسەر برد، ئێوارە تەلەفۆنم بۆ ئانا و شێرکۆ و گەنمی خوشکم کرد و هەواڵی ئەوانم زانی و دوای ئەوە چووم بۆلای باپیرم لە خزمەت ئەودا شەوم بەسەر برد و قسە و باسی زۆر خۆشی بۆ کردم و شەو هەر لەماڵی ئەوان خەوتم و بەیانی هاتمە دەرەوە بۆلای دایکم بەیەکەوە نان و ماست و چامان خوارد، دلاوەر تەلەفۆنی کرد وتی: دەمەوێت بتبینم هەر چۆنێک بووە.

ماکوان: لە خزمەتام وەرە بۆ نووسینگە بە پشتیوانی خوا یەک کاتژمێری تر لەوێ دەبم.

لەگەڵ دلاوەر کاتم داناو بەرەو نووسینگە بەڕێکەوتم، کاتێک گەیشتمە ئەوێ دلاوەر چاوەڕێی دەکردم، سەلامم لێ کرد و باوەشی پیا کردم وتی نازانم بە چ زمانێک سوپاست بکەم، هەر ئەوەندە دەڵێم خوای گەورە بیخاتە میزانی حەسەناتت، نازانی چەندە دڵی من و گەلات خۆش کرد.

ماکوان: دلاوەر گیان هەر ئێوە دڵخۆش بن من هیچم ناوێت، ئەرێ بەڕاست ئەمرۆ کاتژمێر ٤ چی دەکەیت؟ ئەگەر ئیشت نییە من دەڕۆم بۆ جێگایەک حەزدەکەم بەتەنها نەڕۆم کەسێکی خۆت ئاسام لەگەڵ بێت.

دلاوەر: کاک ماکوان هیچ کارێکم نییە، ئەمڕۆ تەنها لەگەڵ گەلا دەچین بۆ جلکڕین و دوای ئەوە هیچ ئیشێکی ترم نییە.

ماکوان: نا، پێویست ناکات، مادام وایە بڕۆ لەگەڵ گەلابە و چی دەکەیت لەگەڵ مندا، بڕۆ بۆخۆتان بگەڕێن و قسەی خۆش بکەن، من خەڵکی تر دەبێت لەگەڵ خۆم دەیبەم، حەز دەکەم ئێوە خۆشحاڵ بن.

دلاوەر: کاک ماکوان بەخوا گەلا دایکی گیری داوە کە دەبێت تا کاتژمێر ٢ لەگەڵ من بێت، دەبێت ئەو کاتە بگەڕێتەوە، من لەدوای کاتژمێر ٣ تا نیوە شەو هیچ کارێکم نییە، تا نیوە شەویش دەخەوم ئیشم نییە تا سبەینێ کاتژمێر ٤ی ئێوارە دەچمە سەرکار تا ١٢ی شەو.

ماکوان: بڕۆن بۆ بازاڕ، ئەگەر حەزتان کرد من میوانداریتان دەکەم دەچین بۆ کەباب خواردن؟

دلاوە: بەخۆشحاڵییەوە بەڵام تۆ دەبێت میوانی ئێمە بیت کاک ماکوان گیان، دەکرێت لێرە بم تا گەلا دێت؟ بە گەڵام وتووە بێتە ئێرە.

ماکوان: بە خۆشحاڵیەوە نووسینگەی خۆتانە برا.

ماوەیەک قسەو باسمان کرد لەگەڵ گەلا و ئەوان ڕۆشتن منیش لەگەڵیان ڕۆشتم بۆ نانخواردن، میوانی گەلاو دلاوەر بووم، دوای کە گەڕامەوە بۆ نووسینگە بەتەلەفۆن لەگەڵ نەبەز و هاوڕێکانمدا ئاگاداری یەک بووین، دلاوەر لەلام بو کاتژمێر ٤ و نیو دوای نوێژی عەسر بەرەو لای پێشانگاکەی جەمال بەڕێکەوتین، لەگەڵ دلاوەر قسەباسی زۆر خۆشمان کرد کە گەیشتینە ئەوێ بە هێواشی بەرەو نووسینگەکەی ڕۆشتم بەڵام ئەو سەرقاڵ بوو لەگەڵ نەبەز و هیوا و وریا کەسێکی تر من نەمدەناسی، دەستم بەرز کردەوە بۆ جەمال وەکو ئاگاداری کە هاتووم.

جەمال: کاک ماکوان بڕۆ ئۆفیسەکە دابنیشە پاش کەمێکی کە دێمە خزمەتت، منیش وتم باشە.



ئەوان لەگەڵ جەمال بوون، بە جەمالیان وتبوو ئەوە ماکوان کەریم بوو؟

جەمالیش جوابی دابوەوە بەڵێ ئەوە ئەو تیرۆریستەیە لە ژێر ناوی ڕۆژنامەنووس خۆی شاردۆتەوە.

هیوا داڵێکی لەسەرشانە بە جەمال دەڵێت، کاکە تۆزێک بە ئەدەب بە، کاک ماکوان براى گەورەمانە مامەڵەکە بەجێ دەهێڵێت و بەجەمال دەڵێت دەچین بۆلای کاک ماکوان! جەمالیش ڕەنگی تێک دەچێت و ڕووەو من دێت.

خۆم سەرقاڵ کرد بە هەندێک گۆڤاری بیانی کە دەربارەی سەیارە بوو خۆم وانیشان دا کە سەرقاڵم و جەمال نابینم و ئیهمالم کرد.

جەمال: بەدەنگی بەرز کاک ماکوان هەندێک هاوڕێت حەز دەکەن مەرحەبایت بکەن.

سەرەتا نەبەز یەک تەحیەی بۆ کردم وتی: گەورەم زۆر خۆشحاڵم کە ئەتبینم لێرە.

هەڵسام دەستم برد بۆ تەوقە کردن خیرا دانیشتمەوە وتم کاک نەبەز ئاسایی بە تکایە.

هیوا خۆی کرد بە ژوورا تەحیەی بۆ کردم وتی گەورەم ماکوان زۆر خۆشحاڵم بەبینینت، ئەوەندە بە قایم قاچی کێشا بە ئەرزا جامخانەکە ئەلەرییەوە، دوای ئەو خێرا وریا هات و بەدوایدا کەسی چوارەم.

بەجەمالم وت کاک جەمال بەیارمەتی بۆ چەند خولەکێک ئێرەمان بۆ چۆڵ بکەن هەندێك ئیشم بەم پیاوە شۆڕشگێڕانە هەیە، تکام وایە تا ١٠ خولەک کەس نەیەت ئێرە.

جەمال: کاک ماکوان گیان لە خزمەتانداین، ئێستا دەڵێم چاو و خواردنەوەی ساردتان بۆ بێنن.

ماکوان: نا تکایە با کەس نەیەت.

جەمال چووە دەرەوە سڵاوم لێکردن و هیوا وتی جەمال لە پیاوەتی کەتووە، دوایی بۆت دەگێڕمەوە کە پۆرتم شکاندووە (مەبەستی ئەوە بوو کە پێشتر ئاماژەم پێدا وتبووی ماکوان تیرۆریستە) هەمووومان بە جەمال پێدەکەنین، نەبەز وتی کاکە ئێمە دەڕۆین، بۆ ئەوەی ١٠٠١ پرسیاریان بۆ دروست بێت، بەڵام وەرە دەرگای ئۆفیسەکە و سەرو سڵاوی ترت بۆ دەکەین و کۆتایی بە دراماکەمان دێنین. ئەوان ڕۆشتن و منیش هاتم بەردەرگای ئۆفیسەکە و هەموویان بەیەکەوە سەلامیان کرد ئەو خەڵکە تەماشای دەکردم، جارێ دلاوەر چاوی زەق بوبوو لە جەمال زیاتر دەترسا. جەمال هات و دەستی کرد بە ماستاو کردن و بەخێرهاتنی گەرم.

جەمال: کاک ماکوان گیان جەنابت لە (سلکی سەربازیت) واتا لە دەزگای سەربازی کار دەکەیت؟

مۆڕەیەکم لیکرد و وەڵامم نەدایەوە و زەردەخەنەیەکم بۆ کرد.

جەمال: ئەم کاکەیە کێیە لەگەڵتا چی دەخۆن؟

ماکوان: کاک جەمال هاتووم هەواڵی گەنم بزانم هەست دەکەم باری دەروونی خراپە، بەو پێیەی جەنابت ئەوەندەی بزانم زۆر باش مامەڵەت کردوە، هەندێک شتم لە ژیانی بۆ باس بکە، چونکە دەبێت هەموو شتێک لە ژیانی خوشکەکەم بزانم.

جەمال دەمی گۆی نەدەکرد قسە بکات، حاڵی تێکچوبوو وتی: کاک ماکوان با لێرە قسە نەکەین کاتێکی تر دابێنین بەیەکەوە قسە بکەین بەئارامی و هێمنی.

ماکوان: باشە هەست دەکەم حاڵت باش نییە خۆ نەخۆش نیت؟

جەمال: نا؛ کاک ماکوان گیان هەر حەز ناکەم لێرە ئەو باسانە بکەینەوە لەبەر سومعەی تۆش و خۆشم، بۆچی خەڵک لە نهێنی خانەوادەیمان بزانن.

ماکوان: باشە من دەڕۆم چاوەڕێتم ئاگادارم بکەوە، کەی بۆت کرا هەواڵم بدەرێ کاتێکی خۆش سڵاوم بکەیەنە بە شیرین خان و قسە دەکەینەوە.

لەگەڵ دلاوەر تەکسییەکمان گرت و وتم: دلاوەر من دەڕۆم بۆ توی مەلیک تۆش دوای من بگەڕێرەوە بۆ ئەو جێگایەی کە دەتەویت، ئاگام لە دلاوەر بوو زۆر لای سەیر بوو ئەو دیمەنانە، چووم بۆ ماڵی نەبەز جەماعەت لەوێ بوون، هەموو کردیان بە فشقیات و قسەی خۆش، ئەو کوڕەی هاوڕێیانم ناسی ناوی نەقیب سۆران بوو، ئەویش کەسێکی بەڕێز بوو.

ماکوان: وەڵلا قسەی بۆ نەکرا جەمال لەگەڵ مندا، تف لەدەمیا وشک بووبوو، چ دەردێکی کێشا ئەمڕۆ، وەکو هیوا ئەڵێت لە پیاوەتی کەوت.

نەبەز: کاکە جارێکی تر لەگەڵ خاڵە هیوا هەمانکارمان کرد بۆ کەسێکی تر زۆر سەرکوتوو بوو، بەڵام ئەو شەڕی تێکەوت، ئەمە هیچ نەبوو تەنها نمایش بوو.

هیوا: بەخوا خەریک بوو لێیبەم، بەس وتم کاتی نییە کە وای وت، نەبەز پیای کێشا وتی دەمت بگرە.

ماکوان: چی بووە هیوا پێم بڵێ با دەمی نەگرێ قسە بکە.

نەبەز: کورە ئەو بێ ڕەوشتە بەتۆی وت ئەو ماکوانە تیرۆریستە ئیتر هیواش پۆرتی شکاند وتی بە ئەدەب بە.



ماکوان: دەستی ئێوە و مامە هیواش خۆش، وشەی تیرۆریست تۆمەتی موعەلەبە لەم وڵاتە و هەموو دنیادا، هەرکەس خواناس بوو بەدڵی خەڵکی تر نەبوو مۆری تیرۆریست ئەدەن لێی زۆر ئاسان بووە.

ئەو تۆمەتە بە بەلاشە، نەوەڵڵا تورە نابم ئەوەندەم پێوتراوە خۆشە بۆم گوێی نادەمێ ئێستا وەکو (موخەریبەکەی صدامی لێهاتووە بۆ پێشمەرگە).

هیوا: مامە خەسرەو من قەرزاری جەنابتم کاتی خۆی من دوکانەکەتم سووتاند، ئەزانم ئەزانی بەڵام چوومەتە ماڵی خوا داوای تۆبەم کردووە، لەچەند مەلایەکیشم پرسیوە دەڵێن دەبێت مافەکەت بۆ بگەڕێنمەوە، جا ئەوە دوای منو شەقی تۆ، ئەوە گیرفانم و ئەمر بکە بە شاهیدی ئەم پیاوانە.

ماکوان: بە شاهیدی ئەم پیاوانە گەردنت ئازاد بێت و تەنها دووعای خێر و چاکەم لەجەنابت دەوێت و ئەوەی ئەمڕۆ کردت بە پارە بۆم حساب ناکرێت مەگەر هەر پیاوی وەکو ئێوە و برای وەکو ئێوە ئەنجامی بدات، جا تکا دەکەم ئەگەر منت خۆش دەوێت ئیتر باسی مەکە و لە دنیاو قیامەت گەردنت ئازاد بێت.

نەبەز: وەڵڵا حەقە دەعوەتی کەبابمان بۆ بکات.

ماکوان: وەڵڵا ناهێڵم وریا و هیوا جارێکی تر باسی کەبابیش بکەن، ئەوان چوزانن کەباب بخۆن.

هیوا: من بۆ کاکە؟ وریا کەباب خۆر نییە من تاوانم چییە، بڕۆن تۆزێکی تر دەڕۆین بۆلای وەستا حەسەنی کەباب چی لەخوار و ماڵی خۆتانە، قسەتان ماوە؟

ماکوان: من ئامادەم کێ دێت من یەکەم کەسم بۆ کەباب خواردن.



هەموو ئامادەییان دەربڕی، لەوەدا بووین ئەوان خەریکی خۆگۆڕین بوون جلەسەربازییەکانیان داکەندو جلی ئاساییان لەبەر کرد، لەوکاتەدا گەنم تەلەفۆنی بۆ کردم، وەڵامم دایەوە...

گەنم: کاکە باشی شوکر دەنگوباست چۆنە؟

ماکوان: باشم گەنم گیان، دەنگوباس چییە؟

گەنم: چیتان کردووە لەبابە جەمال (بە پێکەنینەوە قسەی دەکرد) هاتەوە بۆ ماڵ وتی ئەو ماکوانە زۆر ترسناکە خوا بکات تووشی بەڵایەکمان نەکات، چیت لێ کردوون دایکم و بابە جەمال ئۆقرەیان لێ بڕاوە.

ماکوان: گەنم گیان هیچم نەکردووە، من نازانم چی ڕوویداوە، گوێ هەڵبخە بزانە چیتر دەڵێت باشە گوڵە گیان؟

گەنم: کاکە ماکوان وەڵڵا بە دایکمی وت ماکوان ڕوتبەی لە لیوا گەورەترە، نازانم مەبەستی چی بوو، بەیانی حەز دەکەم بتبینم دێم بۆلات، خۆ ئاساییە؟

ماکوان: هەمیشە بۆ تۆ ئاساییە، من دەڕۆم لەگەڵ هاوڕێکانم بۆ نانخواردن بەیانی قسە دەکەین باشە ئاگات لە خۆت بێت، هەرشتێک بوو تەلەفۆن بکە، ئیتر نامە مەنێرە تا بزانم سەلامەتی وەزعەکە گۆڕاوە، باشە؟

بە پێکەنینەوە گەنم وتی: باشە.

لەگەڵ جەماعەت چووین بۆلای وەستا حەسەن.

هیوا: مامە خەسرەو هەندێک پرسیارم هەیە دەمێکە بەدوای وەڵامەکەیدا دەگەڕێم، مامە وریا وتی باشترین کەس مامە خەسرەوی خۆمانە لێی بپرسیت ، لەگەڵ مامە نەبەز لە عومرە بووین لەوێش پرسیارم کرد وەڵامێکی ئەوتۆم دەست نەکەوت، پرسیارەکەم ئەوەیە من نازانم قورئان بخوێنم زۆریش هەوڵم داوە فێر نەبووم، بەڕاستی لەتوانامدا نییە فێر ببم، چوومە لای مەلای مزگەوتەکەشمان فێرم بکات هەر فێر نەبووم،



پرسیارەکەی من ئەوەیە قورئان بۆ خوێندنەوەیە یان بۆ ئەوەیە فێرمان بکات، لەوانەیە پرسیارەکەم باش نەگات زیاتر ڕوونی بکەمەوە تۆ لەژیانتا چەند جار قورئانت خەتم کرووە.

ماکوان: نازانم زۆرە نەمبژاردووە.

هیوا: پرسیارەکەی من ئەوەیە ئەگەر من بمەوێت وەکو تۆ بکەم، خۆ من هیچی لێ تێناگەم ئیتر بۆ دەبێت خەتمی بکەم هەموو جارێک؟

ماکوان: وەڵامی ئەو کەسەی کە لە مەککەی پیرۆز پرسیارت لێ کرد چی بوو؟

هیوا: وەڵلا وتی عێبادەتە هەروەک نوێژ و ڕۆژوو دەبێت بخوێنرێتەوە.

ماکوان: ئەی زیاتر شی نەکردەوە؟

هیوا: نەوەڵلا مامە خۆ مامە وریا شاهیدە، هەر ئەوەندەی وت ئیتر وەڵامی پرسیاری تری دایەوە، منیش زۆری لەسەر نەڕۆشتم و عەرەبییەکەم وەکو سەیارەی لادا وایە لە فیلمی عەرەبییەوە فێری بووم باشی لێنازانم.

ماکوان: وەڵامەکەی ١٠٠٪ ڕاستە بەڵام بێشیکاری وەڵامی داویتەوە بۆیە تۆش نەچۆتە مێشکت و لێی تێنەگەیشتوویت، چونکە هەندێک زاراوە هەیە لە ئیسلامدا بە ڕستەیەک یاخود بە شیکاریەکی دورو درێژیش ناکرێت، بۆ تێگەیشتن لە زاراوەی بەندایەتی بۆ زۆرینەی خەڵک پێویستی بە کتێبە و نابێت بخوێنرێتەوە، بەڵکو دەبێت بخوێندرێت.

بۆ ئەوەی بەکورتترین ڕێگا بۆی شی بکەمەوە ئەگەر تورەکەیەک کەسێک بۆ خەڵوز بەکاری بهێنێت ئەم تورەکەیە کە لە پارچە قوماشێکی دووراو پێکهاتووە، کەسێک خەڵوزی پێ دەگوازێتەوە ئەگەر من و جەنابت بڕۆینە سەر چەمێک کەسێت بێت سەتڵێک بداتە دەستی من و ئەو تورەکەیەش بداتە دەستی تۆ بەهەردووکمان بڵێت ماکوان بەو سەتڵە ئاوم



بۆ بکەرە ناو بەرمیلێک، بەتۆش بڵێت هیوا بە تورەکەیە ئاوم بۆ بکەرە ناو بەرمیلە، تۆ چی دەڵێیت؟

هیوا: دەڵێم نابێت، چونکە ئاو بە قوماش و تورەکە ناگوازرێتەوە.

ماکوان: ئەی ئەگەر کەسەکە بڵێت هەردەبێت بیکەیت و لایەنی کەم دەبێت هەوڵێک بدەیت، گریمان تۆ بەقسەی دەکەیت لەبەیانی تاکو ئێوارە بە پارچە قوماشە ئاو دەهێنیت بۆ بەرمیلەکە، بەڵام لەکۆتایدا تووشی بێئومێدی دەبێت بڵێیت ئاخر ناکرێت، وایە؟

هیوا: بەدڵنیاییەوە وایە.

ماکوان: بەڵام خۆ لانی کەم پەڕۆکە یاخود تورەکەکە ئەوەندی کە لە چەمەکەدا ئاوت پێ هێناوە نەگەیشتبووە لای بەرمیلەکە خۆ تورەکەکە لە ڕەشی خەڵوزەکە پاک بۆتەوە، وایە؟

هیوا: ئەمەش وایە مامە، بەڵام بەخوا تێنەگەیشتم نە لە سەتڵەکە و نەلە تورەکەکە، نازانم ئەم بەڕێزانەی تر تێگەیشتوون.

ئەوانیش هەموویان وتیان: نا؛ تێنەگەیشتین.

ماکوان: هەست دەکەم ئاسان بێت ئەوەندە ئاڵۆز نییە، پەڕۆ یان تورەکە خەڵوزەکە کە ڕەشی بەخۆیەوە گرتبوو ناخی هەموومانە، چەمەکە خودی قورئانەکەیە، خۆ ئەگەر نەتوانێت ئاوی پێ بکەینە بەرمیلەکە مەبەستم پێی زانستە لانی کەم تورەکە پڕ لە ڕەشی و تاوانەکانی مرۆڤەکان پاک دەکاتەوە، خوێندنی قورئانیش وایە بۆ ئەو کەسەی زانستی پێیە وەکو سەتڵەکە وایە بەئاسانی ئاوەکە دەگوازێتەوە بۆناو بەرمیلەکە کە زانستی ئیسلامییە بەشی خۆی لێ دەردەهێنێت.

هیوا: وەڵڵا مامە زۆر جوان تێگەیشتم واتا خوێندنی قورئان تاوانەکانمان لادەبات.

ماکوان: بەڵێ؛ کە تاوانمان لاچوو واتا عیبادەتمان کردووە مامە هیوا.

هیوا: دەستودەمت خۆش بێت حاڵی بووم.

ماکوان: قورئان زۆر سەیرە لەڕاستیدا واهەست دەکەین ئێمە قورئان دەخوێنینەوە، بەڵام لەڕاستید ڕێک پێچەوانەیە. قورئان ئێمە دەخوێنیتەوە ناخمان بۆ خۆمان دەناسێنێت، تاکو خۆمان چاک بکەین و مرۆڤێکی چاک وباش و تەندروستمان لێ دەربچێت.

وریا: جا نازانم چۆن بگەینە ئەو ئاستەی ئەم چاکەکارییە وەربگرین؟

ماکوان: هەست دەکەم زۆری ماوە، بەخۆشەویستی دەگەینە ئەو ئاستە، ئەگەر بینیتان مامۆستایەک بە قوتابییەکانی وت لەبن ئەو دارە کەچەند ماوەیەک لەو کۆمەڵە قوتابییە دورە سەبەتەیەک سێوی تێدایە هەرکەس زوو گەیشتە لای سەبەتەکە سێوەکە دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی لە سێوەکە بخوات، لەوکاتەدا منداڵەکان دەستی یەک بگرن و هەموو پێکەوە ڕابکەن بۆلای سەبەتە سێوەکە و بە پێکەنین و خۆشحاڵییەوە بیخۆن ئەوکات وەزعمان چاک دەبێت.

نەبەز: ئەمەی ماکوان باسی دەکات لە ژیانیدا ڕوونادات.

ماکوان: بڕوا بکە کاک نەبەز ئەوەی باسم کرد ڕووی داوە، لە جێگایەکدا کە ئێمە زۆر لەوان پێشکەوتورین لە ئەفەریقا ڕووی داوە، ئەو ڕۆشنبیری کۆمەڵگەیە زۆر گرنگە بە خۆشەویستی و خۆنەویستی کار ئەنجام بدەن، کە منداڵەکانمان فێر بوون لە گەورەیدا زۆر باشتر دەبن.

وریا: باشە چۆن دەگەین بەم ئاستە، ئەگەر ئەوە خودی ئاستەکە بێت گەیشتن پێی چۆن دەبێت؟

ماکوان: دوو مەسەلەکە یان با بڵێین دوو ڕێگایە بەدوای یەکدا و بریتیە کە (دەست پێ کردن و بەردەوام بوون).

هیوا: چۆن دەتوانین بەو شێوەیە بەرز ببینەوە؟

ماکوان: خۆ پیاوچاکان و عارفان کە زیکر و یادی خوا دەکەن، بۆ ئەوەیە خوای گەورە بەرز بکەنەوە و بە پیرۆزی ڕایبگرن، عارف، صوفی و زانا و چاک و خراپ، هەرچی بکەن خوای پەروەردگار بەرزە و پیرۆزە، بیانەوێت یان نەیانەوێت بەڵکو پیاوچاکان زیکر و یادی خوا دەکەن بۆ ئەوەی ئاستی تەقوا و نەفسی خۆیان بەرز بکەنەوە بۆلای خوای پەروەردگار، گەیشتن بەو ئاستە بەرزە، پێویستە لە یادی زاتێکی زۆر بەرز و پیرۆزدا بین، پێویستە لەم ژیانە تێبگەین، بەوەی خوا دەیەوێت بەڵام ئێمە دەگەڕێین بەدوای نهێنی ئەم ژیانە بەوەی خۆمان دەمانەوێت، لەکۆتاییدا دەڵێن منیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ، ژیان حەکایەتی مێش نییە، گرنگە بزانین ژیان ڕوناکی مۆمێکە ئەو ڕوناکییە لەکوێوە هاتووە پاشان کە فومان کرد لە مۆمەکە بزانین ڕۆشناییەکە بۆ کوێ چوو.

هیوا: دەمێکە لە نانخواردن تەواو بووین شاگردەکان مۆڕەمان لێ دەکەن و دانیشتنیش لەگەڵ مامە خەسرەو تێرت ناکات، با جێگاکەمان بگۆڕین تا نەیانکردوینەتە دەرەوە.

ماکوان: وەڵڵا من و نەبەز پشتمان لەوانە، ئێوە دەیانبینن بابڕۆین ناحەقیان نییە کات درەنگە.

نەبەز: برا ماکوان ماندووە با زۆرتر ماندووی نەکەین، با بڕواتەوە بۆماڵەوە.

دەستم کرد بە پێکەنین و وتم: نەبەز دەیەوێت بڵێت ماکوان نەخۆشەو سەرەتانی مێشکی هەیە، پێویستە بڕواتەوە بۆ ماڵەوە.

نەبەز: بەخوا لەبەر تۆمە، دەڵێن بۆ بۆرە پیاو خۆت بە بەکوشت بە دەڵێن بە دەردی خوایی مرد.

وریا: مانای ماکوان بۆرە پیاوە؟

نەبەز: تۆ قسە مەکە با کەبابەکەت بۆ زیندوو نەکەمەوە.

هیوا: وەڵڵا دەڵێم بڕۆین بۆ کافتریایەک دانیشین، بڕواناکەم مامە خەسرەو ماندوو بێت، کاتی وامان دەست ناکەوێت، مامە خۆ ئاساییە بڵێم خەسرەو.

ماکوان: هەر زۆر ئاساییە حەز دەکەیت وەکو جاران بڵێ خەسە سور، خۆشحاڵ دەبم، من ماندوو نیم حەزم بە ژیان و حەز دەکەم لەگەڵتاندا بم، خۆ ئەگەر مردیشم لەگەڵ ئێوە بەسە کە ئاگاتان لێمە.

هیوا: مامە زۆر ناڕەحەت دەبم توخوا باسی مەکە، بباسی ژیان بکەین.

ماکوان: هیوا گیان خوای گەورە کە ئادەم و حەوای دەرکرد لەبەهەشت دا بۆ ئەوە نەبوو کە ڕقی لێیان بوو، بەڵکو بۆ ئەوەبوو کە پێیان بڵێت بەهای بەهەشت بزانن، ئەوان بە ئاسانی چوبوونە ناو ئەو باخ و باخاتە کە لە دەستیان دا قیمەتی بەهەشتیان زانی، بەخوا لە مردن ناترسم ئەگەر ئێوەش بەجێ بهێڵم دەچم بۆ گۆڕستان من لە تاوانەکان دەترسم.

وریا: وەڵا برا نایەڵم بڕۆیت، با بڕۆین بۆ کافەتێریا باشترە من تۆم دەستکەوتووە، لە پاڵتۆڵک تا کاتژمێر ١٢ی شەو بەدیارتەوە دادەنیشتم ئێستا لەبەردەستمایت ئەڕۆین بۆ جێگایەکی کە.

ماکوان: بابڕۆین لە مزگەوتێک نوێژی عیشا بکەین دوایی بۆ کوی دەڵێن دێم، بەپێ چووین بۆ مزگەوتێک لە شەقامی توی مەلیک، لەڕێگادا من و هیوا بەیەکەوە دەڕۆشتین وتم مامە هیوا مردنەکەم و گەنم هێندەی ئەو منداڵەی لە تاڤانە ڕەش هەمە پێم ناخۆش نییە، هەستێکم هەیە هەرچەندە ڕەحمم بۆ شێرکۆ زۆرە بەڵام هەست دەکەم درۆیە و ڕاست نییە، من کاری وام نەکردووە، تاڤانیش جورئەت ناکات من بخەوم و بێتە لام و بخەویت.

هیوا: ڕاستی منیش ناچێتە ئەقڵم، بەڵام پەلەم لێ مەکە بزانم سەردار نادۆزمەوە، بزانم چییەو چۆن بووە، تۆ دەڵێیت سەرداری لێ بووە، ئەو دەڵێت لێی نەبووە.

ماکوان: سەردار لەولایە لە هەولێر دەژی لەئێستادا، زۆر هەواڵم پرسی دەمەوێت بڕۆم بۆ بۆلای لەهەولێر.

هیوا: خەمت نەبێت بۆت ئەدۆزمەوە، بەخوا هەرچەندە من ناچمە هەولێر، بەڵام خەڵک هەیە بۆمان بدۆزێتەوە.

ماکوان: کێشە لە دۆزینەوەیدا نییە هەر ئەیدۆزینەوە، بەڵام لەدوای مەرگی خۆم هەموو شتێک بەجێ دەهێڵم زۆر سەختە مامە هیوا.

هیوا: مامە من دڵم ناڵێت تۆ دەمری، بەخوا تۆ چاک دەبیتەوە، مامە تۆ پیاوێکی زۆر بەهێزیت، بڕوا بکە ئێمە هەموو دەمرین تۆ نامریت، تۆ بەهێزی پیاوی بەهێز و ئازا تەمەن درێژە، بەخوا ئەم شەو بەیەکەوە وادەزانم هەموو دنیا هی خۆمە، خێزانم کچی ماممە، بەخوا تۆی بەقەدەر براکانی خۆش دەوێت.

ماکوان: خوای گەورە سەربەرزی بکات، بەڕاست (سانیە)ی ئامۆزات خێزانتە؟

هیوا: نا؛ بێخاڵ، سانیە مرد.

ماکوان: بۆچی، بەچی؟

هیوا: سانیە دەمێکە عەمری خوای کردووە، بەهۆی ڕووداوی هاتوچۆوە، خۆی و منداڵەکەی و هاوسەرەکەی.

ماکوان: ئەی خوای گەورە لێیان خۆش بێت، وەڵڵاهی هەواڵێکی ناخۆش بوو، خوای گەورە بیانخاتە بەهەشت.

هیوا: وەڵڵا وامزانی زانیوتە دەنا قسەم نەدەکرد، دەزانم سانیەت خۆش دەویست، هەرگیز ئەو یادگارییەم بیر ناچێتەوە.

ماکوان: بەخوا شێرە کچ بوو، هیوا بیرتە شەڕم بوو لەگەڵ دوو کەس هات نەعلەکانی داکەند و لەسەری کردمەوە؟ بەخوا هەواڵێکی ناخۆشت دامێ.





هیوا: مامە دەزانم، باوکی پێی دەوت جەماعەتی خەسە سور، زۆر چاونەترس بوو.

ماکوان: سڵاوم بگەیەنە بە بێخاڵی خوشکم و سەرەخۆشی لێ بکە، ئەی منداڵتان هەیە؟

هیوا: سێ منداڵم هەیە.

ماکوان: خوای گەورە تەمەنیان درێژ بکات، ناویان چییە هیوا گیان؟

هیوا: مامە با ناوەکانیان نەڵێم ئەزانم خەفەت دەخۆیت.

ماکوان: بۆ ناویان چییە دەبڵێ برا خوا تەمەنیان درێژبکات.

هیوا: دالیا، دابان و دادوەر، بەخوا مامە حەزم ئەکرد کە ناوی کوڕەکەشم بەناوی تۆوە ناو بنێم بەڵام لەبەر ماڵی پوری نەبەز نەموێرا، مامە زۆر کاریگەر بوو ئەو خۆشەویستیەی تۆو دالیا خوا عەفوی بکات، ئەزانی مامە بۆ تۆم خۆش دەوێت و هەرگیز ڕقم لێت نەبووە، ڕاستە من تۆزێک ناپیاو بووم لەگەڵ تۆدا، بەڵام مامە تۆ هەمیشە لەسەر ناحەقی هەڵت ئەدایە و خۆت پێنەئەگیرا، باوکم زۆر تۆی خۆش دەویست کە دوکانەکەتم سووتاند باوکم زانی وتی بەخوا خەسە سور ئەگەر ماڵەکەمان نەسوتێنێت لۆریەکەم دەسوتێنێت، هات بۆلات تۆش یەکسەر پێت وتبوو من چۆن خەڵکی نانبڕاو دەکەم، زیاتر لەسەد مەجلیس باسی تۆی دەکرد پۆرتی منی شکاند.

ماکوان: خوای گەورە باوکت سەلامەت بکات ئەی چۆنە؟

هیوا: وەڵڵا ساڵی پار ئەویش عەمری خوای کرد، سەرەتانی هەبوو دوور بێت لە تۆ.

دەستم کرد بە پێکەنین وتم: خوا لێی خۆش بێت، ئەڵێی چی شومەکە لەنەبەز بکەمەوە و بینێم بە تۆوە، هەواڵی کەست لێ ناپرسم، هەرچیم وت وتت مردوە.



هەردووکمان دەستمان کرد بە پێکەنین و وتم: مامە هیوا وا هەست دەکەم منیش ئەچم بۆلایان، دیارە ئەوان بیرم دەکەن.

هیوا چاوی پڕ بوو لەگریان و دەستمان کردە ملم و چووینە ناو مزگەوت و نوێژی عیشامان کرد و گەڕاینەوە لای سەیارەکەی نەبەز و هەموو چووین بۆ کافتێریایەک دانیشتین.

هەرچەندە لە دانیشتنەکەماندا من خیاڵم پەرت و بڵاوبوو ئەم سەروسەری دنیام دەکرد، نەمدەزانی چۆن خۆم بهۆمەوە پەتی ژیانم هەموو مورووی ئاواتەکامی بڵاوی کردبوەوە لەبەر پچڕانی.

وریا: کاک ماکوان حەزدەکەم فێری زانستی ئیسلامی ببم، چۆن دەست پێبکەم زۆر تامەزرۆم چۆن شارەزا بم لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام، چی بکەم و چۆن فێر بم، بەڵام گاڵتەم پێ مەکە مەڵێ برۆ قۆریەکەی عەلادین بدۆزەرەوە با دێوەکە یارمەتیت بدات.

ماکوان: پێش هەموو شتێک خوات خۆش بوێت، هەمووی ئاسان دەبێت.

نەبەز: تورە نابیت پرسیارێک بکەم، بەخوا مەبەستم خراپ نییە، بەڵام ئەمەوێت تێبگەم.

ماکوان: نەوەڵڵا نەبەز تاقەتم نییە تورە بم، بەتایبەتیش لە پرسیارکردن من هەرگیز تورە نابم، لەسەرو هەموو ئەوەشەوە لەتۆ.

نەبەز: قوربانی بم، ڕاستی من ئەمەوێت خوام خۆش بوێت، بەڵام لێی ئەترسم، لەمەرگی خۆم دەترسم ئەڵێم نەوەک لێم خۆش نەبێت، خۆشەویستی شعورێکە لەبەرانبەریدا بەڕاستی بۆم دروست نابێت، خۆ تاوانبار نیم؟

هیوا: بەخوای تاک و تەنها منیش وام، جا بۆ نەیدرکێنم.

ماکوان: ئەمە چییە ئەڵێی ئەشکەوتە دەنگ ئەیاتەوە، پێم وانییە هەر ئێوە وابن زۆربەی خەڵکی وایە، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ناخی خۆت، تۆ وا هەست دەکەیت لەژیانتا لە تاقیکردنەوەیەکی چاکە دەکەیت سەربەرز دەکەیتەوە، دەڵێیت ئەها چەندە چاکە دەکەم، لەبەر ئەوەی پێشتر یان بەردەوام کە تاوان و کاری خراپە دای، بەڵام ئەگەر خۆت پڕکرد لە چاکە تەنها بۆ ماوەی ساڵێک لەژیانتا تاوانت نەکرد هەموو داواکارییەکانت کە لەسەرتە جێبەجێت کرد ئەوکات خۆشەویستییەکی بێوێنە لە ناختا دروست دەبێت، خوای موتەعال لەسەر بنەمای خۆشەویستی هەموومانی دروست کردووە، جارێک محمد خانی هندستانی لەباخی باڵەخانەیەکدا نوێژی دەکرد کچێ لە خزمەتکارەکانی لەنزیک محمد خانی هیندستانی سەمای دەکرد و گۆرانی دەوت کە لە نوێژەکەی بویەوە کچەکەی بانگ کرد وتی نەتبینی کەمن نوێژ دەکەم؟ من لەتاو دەنگی تۆ و سەماکەت ئاگام لە نوێژەکەم نەما.

کچەکە وتی: ببورە من گۆرانیم بۆ خۆشەویستەکەم دەوت و بەخەیاڵم دەستیم گرتبوو سەمامان دەکرد، من دەستگیرانەکەم زۆرم خۆش دەوێت، بەڵام لۆمەی من مەکە من بۆ خۆشەویستەکەم کە دەستگیرانمە ئاگام لە خۆم نەبوو تۆ چۆن لە حضوری خوایەکدا وەستاوی کە سەرچاوەی هەموو خۆشەویستییەکە و ئاگات لەو نییە؟

محمد خانی هیندستانی زۆر سەرسام بوو بە قسەی ئەو کچە خەڵاتی کرد، چونکە وانەیەکی گەورەی لێوە فێر بوو.

دروستبوونی خۆشەویستی بۆ خوای گەورە لەیەک ڕێگاوە دروست دەبێت ئەویش سیفاتە پیرۆزەکانیەتی، کە ناسیت نە خۆتت بیردەچێتەوە نە زاتی پاکیشی، کەواتە ئێوە لەناخی خۆتانەوە تەماشای خوای پەروەردگار دەکەن، هەموومان پڕ پڕین لەتاوان ئیتر خۆشەویستی چۆن دروست دەبێت، ڕوونە؟

نەبەز: ڕوونە قسەکەت زۆر تەواوە، من لەتاو تاوانەکانی خۆم بیری خۆشەویستیم نەماوە.

ماکوان: ئەگەر وەکو گوڵ بیربکەینەوە لەکاتی بەندایەتیماندا، مەبەستم ئەوەیە کە بۆنی خۆشیش بدەین بەو کەسەی کە لە دارەکە یاخود لەباخەکەمان جیادەکاتەوە، بۆ دوژمن و دۆست وەکو یەک بین کە ئەم پرینسیپە دروست بوو خوامان خۆش دەوێت، بۆ زانیاری هەموتان خۆشەویستی خوا لەدڵی هەموو کەسدایە بەکافر و باوەڕدارەوە، تەماشایان بکە ڕۆژێک ناتوانن باسی خوا نەکەن، بەڵام ئەوەی کە خۆشت ناوێت و ڕقت لێیەتی زوو لەبیری دەکەیت، دڵنیابن هەموو کەس خوای خۆش دەوێت مادام لەسەر زمانمانە باس و یادی، بێخەمبن لەوەی بڵێن خۆشمان ناوێت، بەڵام لە کەسێکەوە کە حەزی بە خۆشەوسیتیەو لێی دەزانێت جیاوازترە لەگەڵ کەسێک کە خۆشەویستی نازانێت، بۆیە لەخوا دەترسێت.

هیوا: مامە خۆ من خۆشەویستیم کردووە و خۆشەویستیش دەزانم، بەڵام زیاتر لە خوا دەترسم تا خۆشم بوێت.

ماکوان: ئاخر هیوای برام خۆشەویستی شەهوانی ناڵێم، خۆشەویستی پڕەنسیپ وەکو وتم، دەبێت هەموو شتێکی جوان و پاکت خۆش بوێت، لەبەر ئەوەی خوای گەورە دروستی کردوە، خۆ کاتێك کەنارییە، چۆلەکەیەک یان بولبولێک لە جێگایەکدا دەخوێنێت، تۆ خۆشت دەوێت و لات جوانە و بەدەنگەکەی خۆشحاڵ دەبیت، ئەمە خۆشەویستی سادەیە و لە ژینگەیەکی جواندایت، بەڵام ئەگەر گەورەتر لە خۆشەویستییەکە بڕوانیت دەڵێیت چریکە و چەهچەهەی چەندە خۆشە، بەڵام خوێندنەوە دەکەیت بۆ ناخی ئەو باڵندەیە دەڵێیت داخۆ بەچکەکەی ون بووە یان بۆ ئازادی هاوار دەکات یاخود بێکەسە! لانەی نییە یان دەبێت چی ون کردبێت، وە یان برسییەتی..هتد.

وریا: توزاتی خوا قسە بکە با زیاتر فێر بم.

ماکوان: وریا گیان تۆ حەزت لە مۆسیقایە وایە؟

وریا: بەڵێ؛ زۆریش حەزی لێ دەکەم، توخوا مەڵێ حەرامە، چونکە زۆریک لە ئیسلامییەکان وا دەڵێن.

ماکوان: نا؛ من چیم تا حەڵاڵ و حەرام بکەم، منیش وەکو تۆ حەزم بە مۆسیقایە، لێرەدا باسی جیاوازی ڕاکان ناکەم، بەڵام مەبەستم خۆشەویستییە کە چۆن دروست دەبێت.

بۆ نموونە تۆ گوێ لە کەمانچەیەک دەگریت یان پیانۆیەک یاخود دەفێک وە یان هەر ئامێرێکی تر بێت، ئەو کەسەی دەیژەنێت خۆی کارەکەی خۆی خۆش دەوێت، چونکە لە تۆ زیاتر چێژی لێ دەبینێت، تۆ لەوانەیە تەنها چێژ لە دەنگەکە ببینیت وایە؟

وریا: دەی وایە من چێژ لەدەنگەکە دەبینم.

ماکوان: ئاخر بۆیە فێری خۆشەویستی تەواوی نابیت، چونکە دروست بوونی ئەو ئاوازە خۆشە لە دەنگ و بێدەنگییە و لە جووڵەشە ئەم سێ حاڵەتە چێژ لە دەنگ و بێ دەنگی و جووڵە و خۆشەویستی هەستەکانیش دەبینم لەسەروو هەموویەوە نیعمەتی هەستەکانیش هەست پێ دەکەم، خۆشەویستی من زیاتر دەجولێت تاوەکو تۆ، کەواتە تۆ ئاوازت لا خۆشە بەڵام لای من مۆسیقا خۆشەویستە، لەبەر ئەوەی خوێندنەوەم بۆی هەیە و لێی تێدەگەم دەزانم چ نۆطەیەک ئەمباتە لای دالیا، چ نۆطەیەک دەمبات بۆلای ئانای کچم، چ نۆتەیەک دەمبات بۆ لای خاک و نیشتمان، لەسەروو هەموویانەوە خالقی ئەم هەمووە دەناسم برایانی خۆم خۆشەویستی مەبدەئە، ئەگەر لە مەبدەئەکە شارەزا نەبوویت خۆشەویستی نازانیت، بەڵکو حەزت لێ دەبێت بە خۆشەویستی، چێژت لێ دەبێت بە خۆشەویستی، سۆزت لێ دەبێت بە خۆشەویستی، بەڵام خۆشەویستی زۆر سەربەخۆیە. من نیشتمانم خۆش دەوێت نەک لەبەر ئەوەی ئەفسەرم، نەک لەبەر ئەوەی کوردم، خۆشم دەوێت لەبەر ئەوەی

یادگاریم تێیدا هەیە، خاکی ئەوروپا زۆر جوانترە لە کوردستان بەڵام دانیشتن لەگەڵ ئێوە هەموو سەروەتی جیهان دەهێنێت، بۆ یەکترمان خۆش دەوێت چونکە پرەنسیپی هاوڕێیەتی و خۆشەویستی دەپارێزین، بە وەفاین، خیانەت لەیەکتر ناکەین، درۆ ناکەین، دزی ناکەین، لەسەروو هەموویەوە خاوەنی یەک خواین و یەک دینمان هەیە، خۆشەویستی زیاتر و زیاتر دەکات ئەو پرنسیپانەی باسم کرد.

کەواتە خۆشەوسیتی خواش هەمان پرەنسیپە، درۆی لەگەڵ مەکە، خیانەت مەکە، دزی لێ مەکە، نە لە زاتی بەرزی نەلە دروستکراوەکانی، بزانە چ خۆشەویستییەک دروست دەبێت.

خۆشەویستی خوا بە داگیرساندنی مۆم نابێت وەکو نەسرانی و ئایینەکانی تر دەیکەن، بە خواردنەوەی شەراب خۆشەویستی بۆ خوا دروست نابێت، بەڵکو بە چاکەکردن خوات خۆش دەوێت و خوای پەروەردگاریش تۆی خۆش دەوێت، دانانی بەهاو نرخ بۆ نەفسی خۆت، واتا بێ بەهایی و بێنرخییە تۆ کێیت کەوا نرخ بۆ کەرەستەی خوا دابنێیت، بەهای تۆ تەنها بە خۆشەویستییە.

بەخوای موتەعال قەسەم خوات لەبیر کرد خۆتت لەبیرچۆتەوە، جا خوات لەیاد بێت بەزیکری بەفیکری، بە قورئانی، بە نوێژکردن بۆی بە ڕۆژوو گرتن بە زەکات و صەدەقە...هتد. چەندە گوڵمان بۆ ئازیزان دەبەین، چەند دیاریمان کڕیوە بۆیان لەبەرئەوەی خۆشمان دەوێن، پێویستە خۆشەویستییەکە زۆر گەورە تر بکەین، ئاخر ئێوە وا دەزانن ژیان خۆشی لەوەدایە کە تەنها چاکە بکەین و کەمردین بڕۆینە بەهەشت، بەڵام بیرناکەینەوە لەوەی کە لەبەهەشت تەنها نەبیت لە نزیک خوا و پێغەمبەر و پێغەمبەران و پیاوچاکان بیت، ئێ بە خۆشەویستی دەستت دەکەوێت.

جارێک پیاوێک دەڕوات بۆ ئەوەی ببێتە موریدی پیاوچاکێک زانا و عارفێک کە دەچێتە لای، پیاڵە چای بۆ تێدەکات، عارفەکە بە زەردەخەنەوە تەماشای موریدەکە دەکات و بە قۆریەکەی پیاڵەکە پڕ دەکات لە چاو



پاشان لێی دەڕژێت تا موریدەکە دەڵێت ئەو پیاڵە ناخی تۆیە خاڵییە دەبێت پڕی بکەیت تا لێی دەڕژێت کە پڕ بوویت لە ناسینی خوا بزانە تێدەگەیت لە خۆشەویستی بۆ خواو دەست پێدەکەیت، خۆ دروست بووغان لەم دنیایە بۆ ئەوەیە کە وازی لێ بهێنین نەک گیرۆدەبین، ئیبنو عەطای ئەسکەندەری دەڵێت: پیاوی غافڵ و نەزان و جاهیل ئەو کەسەیە کە بەیانی هەڵدەسێت لەخەو بیر لەوە دەکاتەوە کەچی بکات، بەڵام پیاوی ئاقڵ و خواناس ئەوەیە کە بەیانی لەخەو هەڵدەسێت دەڵێت داخۆ خوای گەورە چیم لەگەڵ دەکات.

ئێمە زۆر جار خۆمان واز لێ دەهێنین و دەڕۆین بۆ دنیای خەڵکی تر، وەکو ئەوە وایە من لەسەر ئەو شەقامە لەبەردەم گڵۆپی ئەو دوکانە بەدوای کلیلدا بگەڕێم، ئێوەش بێن بۆ هاوکاریم و بڵێن ماکوان چیت لێ ون بووە، منیش بڵێم لە ماڵەوە کلیلەکانم ون کردوە لێرە بۆی دەگەڕێم چونکە ڕۆشنایی هەیە، ئێوە هەموو دەڵێن ماکوان شێتە چۆن کلیلی لە ماڵەوە ون کردووە لێرە بۆی دەگەڕێت، منیش پێتان دەڵێم ئاخر ئێرە ڕۆشنە!

ئێمە ناو ماڵی خۆمان وێران و تاریکە هەرچی کلیلی دەرگاکانە وغان کردووە کەچی لەبەردەرگای خەڵکی تردا لە هاوار و ناڵەیان دەپرسین.

خۆمان وێرانین وێران براکانم.

کۆتا قسە دەکەم و ئیتر بمبەنەوە ماندوو بووم، جارێک ئافرەتێک خۆی بە سۆفی دەزانی بۆ خۆشەویستی خوا و ناسینی خوای گەورە دەیوت خوایە گیان من هیچ نیم لەئاستی نوری خۆشەویستی زاتی بەرزو پیرۆزت، یەکێک لە کچەکان لەگەڵیدا بوو واتا موریدی بوو وتی: ئاخر راضیە خانم تۆ چیت و خۆت بە چی ئەزانیت لەئاستی نوری خۆشەوسیتی خوا دەڵییت من هیچ نیم؟






تەنانەت قوتابییەکانی ڕاضیە خانم هیچیان لا گەورەتر بووە، مەبەستم لوتبەرزی مرۆڤ خۆشویستنی خوا دەمرێنێت.

هیوا: برا جارێ زووە تازە کاتژمێر ٩ی شەوە، هیچ نەبێت با تا ١٢ی شەو بەیەکەوە بین، یان کاکە دەچین بۆ ماڵی خۆمان.

نەبەز: برا ماکوان ماندووە با بڕوات.

ماکوان: برایان بەڕاستی ماندووم لە بەیانییەوە هەستاوم پشووم نەداوە، ئیجازەم بەن بڕۆمەوە.

وەکو ڕۆژانی ڕابردوو ئاسایی ژیانم بەسەر دەبرد، بەیانی دەچووم بۆ نووسینگە و کاری گۆڤاری بزاڤمان دەکرد، چاوەڕێی گەنم بووم بێت بۆلام.

سەرەتای کردنەوەی دەرگایەک لە دەرگا داخراوەکان:

بەیانی کاتژمێر ١٠ چووم بۆ نووسینگە کاروان ڕەحمان بەڕێوەبەری نووسینگە لەوێ بوو، وتی کچێک هەواڵی پرسیویت، بەڵام نەماوەتەوە هەرچەندە وتم کاک ماکوان کەمێکی تر دێت، تەلەفۆنم کرد بۆ گەنم زانیم خۆیەتی، تەلەفۆنەکەی هەڵگرت وتی کاکە لە نووسینگەیت؟

ماکوان: وەرە گەنم گیان چاوەڕێتم و زۆر ئیشم پێتە، زۆری پێنەچوو هات، ماشاءالله سەرپۆشی یابوو بەسەریا، بەڵام بە پانتۆڵێکی درێژ، باوەشم پیاکرد وتم وەلا گەنمی خوشکم سەرەوەت موسڵمانانەیە و خوارەوەشت ئەوروپی، زۆر دەستخۆشیم لێکرد.

ئەوکاتەی کە ئەو هات کاک کاروان بەکارێک لە نووسینگە دەرچووبوو.

ئادەی گەنم باسی جەمال و دایکتم بۆ بکە چی ڕوویداوە؟

گەنم: وەڵلا کاکە نازانم چی ڕوویداوە، تۆ بۆم باس بکە، ئەوەی من دیومە ئەوەبوو کە ئێوارە هاتە سەرەوە ڕەش داگیرسابوو، بە دایکمی وت



گەنم لەکوێیە؟ منیش لەگەڵ سایەی خوشکم بووم، بەڵام گوێم لە قسەکانی ئەوان بوو، دایکیشم وتی لەسەرەوەیە لە ژورەکەی خۆی، بابە جەمال وتی شیرین ئەو ماکوانە کەسێکی سادە نییە، لە دەزگایەکی گرنگی ئیستخباراتی ئیش دەکات، ئەمڕۆ کۆمەڵێک لە ئەفسەرەکان هاتن بۆلام بۆ سەیارە کڕین، سوتفە مەوعیدم یابو بە ماکوان ئەوکاتە هات، کەسێکی لەگەڵ بوو دیاربوو پاسەوانی بوو یان ڕۆژنامەنووس بوو لەگەڵی، کچێ شیرین ئەو ئەفسەرانە کە ماکوانیان بینی هەموو چوون بۆلای ئەو منیان بیرچووەوە، هەموو سەلامی سەربازییان لێ کرد ئەویش هەر دەیوت ئاسایی بن ئێرە شوێنی کار و فەرماندەیی نییە، دوای من و دوو فەمانبەری تر لە ئۆفیسەکە بووین کردینیانە دەرەوە، دوای دە خولەک هەمو ئەفسەرەکان ڕۆشتن، منیش قسەیەکم کرد وا بزانم بۆ ماکوانیان گێڕاوەتەوە، بەڵام ماکوان نەیدا لەڕووم، بەڵام شیرین کەوتوینەتە ناو کۆمێکی زۆر مەنگ و قوڵ نازانم چی بکەین.

ئەمە قسەکانیان بوو بەگشتی، ئیتر دوایی منی بانگ کرد وتی کەی دەچی بۆلای ماکوان، منیش وتم ئەمڕۆ، ئیتر هەر ئەوەندەی وت و وتی سڵاوی منی پێبگەیەنە.

ماکوان: یاخوا تۆ بەخێر بێت گەنم گیان، جەمالیش با بۆخۆی بیخولێنێتەوە.

گەنم: چی ڕوویداوە، ئەوە چییە بابە جەمال باسی دەکات؟

ماکوان: گرنگە تۆ سەلامەت بیت، ئەوەی کە روویداوە هەر ئەوەیە، بەڵام بۆ تەمێ کردنی بوو، خۆ ترسا وایە؟

گەنم: ئەرێ وەڵڵا هەرگیز بەو شێوەیە نەمدیوە.

ماکوان: گەنم گیان پێشتر کێشەی خۆم و ئەو ئافرەتەم بۆ باسکردیت، کە وتم کوڕێکم لێی هەیە، ئەمڕۆ دەمەوێت تۆ بڕۆیت شێرکۆی کوڕم بهێنیت، من و تۆ و شێرکۆ بەیەکەوە بین باشە؟

گەنم: بەسەرچاو ناونیشانم بەرێ ئێستا دەڕۆم دەیهێنم.

ماکوان: با تەلەفۆنێکی بۆ بکەم، تەلەفۆنم بۆ شیرکۆ کرد و وتم وەرە بۆلام کارم پێتە.

شێرکۆ: با بەدایکم بڵێم.

ماکوان: ڕۆڵە کە من وتم وەرە بۆلام پێویست ناکات ئیزن لە دایکت وەربگریت، چونکە من باوکتم، مامۆستایەک دێت بۆلات ناوی مامۆستا گەنمە، وەکو خوشکی منەو پوری تۆشە لەگەڵ ئەو دێیت بۆلام باشە؟

شێرکۆ: باشە بەسەرچاو.

ماکوان: گەنم بڕۆ بیهێنە، بەڵام بەهیچ شێوەیەک قسە لەگەڵ دایکی نەکەیت، زۆر پڕ قسەیە بیهێنە و دایکی ئیهمال بکە، باشە.

گەنم ڕۆشت من چاوەڕێم کردن تا بێتەوە، تۆزێک لەگەڵ شێرکۆ و گەنم کات بەسەر بەرم، هاتنەوە لەگەڵ شێرکۆ کەوتمە قسەکردن و بە گەنمم وت شوێنێکی خۆش شک دەبەیت بڕۆین بۆی.

گەنم: کاکە بۆ شتێک هاتم بۆلات، لەگەڵ شێرکۆ سەرقاڵت کردم، با خێرا پێت بڵێم، بەخوا دایکیشم دەزانێت و بابە جەمالیش دەزانێت چونکە ئەوان بینیویانە، بەڵام دەبێت بە تۆش بڵێم. من و کوڕێک بە نیازی زەواجین، دەیەوێت بێتە داوام، دوو ساڵە یەکترمان ناسیوە، ویستم تۆ بیبینی بزانم ڕازی دەبیت، ئەگەر تۆ ڕازی نەبیت من لە قسەت دەرناچم.

ماکوان: سوپاس کە بە ڕاستگۆیی پێت وتم، بۆ من گرنگە کەسێکی دیندار بێت و نوێژ بکات و خاوەنی سومعە بێت و تۆش ڕازی بیت پێی.

گەنم: وەڵڵا نوێژ ناکات.

ماکوان: ئەی گەنم گیان خۆت نوێژ دەکەیت؟

گەنم: بەخوا نایکەم، لەبەر ئەوەی نایزانم.

شێرکۆ: بابە بەخوا منیش نایزانم.

ماکوان: ئەی خوا گیان فریام کەوە چۆن فریای ئەمانە بکەوم، داخۆ چەندە کاتم پێویستە لەگەڵتاندا، بابڕۆین بۆ جێگایەک شوێنی خێزانی هەبێت.

گەنم: بەخوا هیچ جێگایەک نەکراوەتەوە جارێ زۆر زووە.

ماکوان: باشە جارێ لێرە دەبین، باسی ئەو کەسەم بۆ بکە کێیە و چۆن یەکتان ناسیوە و کوڕی کێیە، زانیاریم بدەرێ لەسەری.

گەنم: لە زانکۆ لە بەشی کۆمەڵناسی لەگەڵ خۆمدایە، کوڕی پیاوێکی دەوڵەمەندە، باوکی ناوی کاک عەلی-یە کوڕەکە خۆی ناوی (زێوەر)ە.

ئەمانە و هەندێک زانیاری تری دامێ لەسەری.

ماکوان: خۆشت دەوێت؟

گەنم بە شەرمەوە: بەڵێ.

ماکوان: دڵنیایت ئەویش تۆی خۆش دەوێت؟

گەنم: بە دڵنیاییەوە، دەیەوێت بێتە داوام، حەز دەکەیت دەچین بۆلای.

ماکوان: توڕە بووم من بچم بۆلای؟ کچم ئەبێت شتێک هەیە بیزانیت، من کەسێکی عەشایەرم بە واتای پاراستنی کلتوری ڕەسەنی کوردەواری لەسەرو ئەوەشەوە من چۆن دەچم بۆلای کەسێک کە داوای خوشکەکەم بکات، ئەبێت ئەو بێت بۆلای من داوا بکات لێم تا منیش خوشکەکەمی پێشکەش بکەم تا هاوسەرگیری لەگەڵ بکات، پێویستە بێت بە ئەدەبەوە داوا بکات و دەستیشم ماچ بکات، ڕوونە؟

گەنم: بەخوا مەبەستم خراپ نەبوو، قسەکە هەروا هات بەدەمما. تۆ چی دەڵێیت با وابێت.

ماکوان: من عەقڵم باوکی ناگرێت، باوکی وەکو بابە جەماڵت دزە، حەتمەن پێ ناچێت کوڕەکەشی باش بێت، مەبدەئیەن لەسەر ناسینی باوکی کە دەزانم دەوڵەمەندە لەبەر ئەوەی زۆر دزە، کوڕەکەشی دزە، بۆیە جارێ پەلە مەکەو بەهەموو شێوەیەک لێی دوور بکەوە، بڵێ برایەکم هەیە ڕازی نییە.

گەنم: ئاساییە بڵێم برام هەیە؟

ماکوان: ئاساییە، بەڵام ئەوەندە بڵێ جارێ ئەو ڕازی نییە. خۆ هیچ لە نێوانتانا ڕووی نەداوە، ماچێ، دەستگرتنێک؟

گەنم: نەبەخوا، شتی وا چۆن ئەبێت.

ماکوان: باشە چوزانم.

هەستم کرد شێرکۆ پێم پێدەکەنێت، وتم شێرکۆ باوکت زۆر عەشایەرە وایە؟

شێرکۆ بە پێکەنینەوە وتی: زۆر ڕەقی بابە.

ماکوان: تۆش ئەبێت ئاگات لە حەیاو حورمەتت بێت، ئەزانی گەنم چی منە؟

شێرکۆ: خوشکتە و پوری منە وایە؟

ماکوان: وایە، دەبێت ئاگاتان لەیەکتر بێت.

ئاگام لێبوو گەنم زۆر بێدەنگ بوو، زۆر ناڕەحەت بوو کە وتم لەو کوڕە دوور بکەوە، هەرچەندە من تەنها ڕقم لەباوکی زێوەر بوو، باوکی خراپە مەرج نییە کوڕەکەی وابێت، بەڵام بە گەنمم وت: دڵی ماکوان گەنم گیان، ئەزانم قورسە ئەوەی کە من پێم وتیت، تۆ دەتوانیت بە قسەم نەکەیت، مانای وانییە ئیتر من وازت لێ بهێنم، بەڵام حەز ناکەم بڕۆیتە ناو ئەو خانەوادەیە کە نەزانن حەڵاڵ و حەرام چییە.

که نغرۆ بویت لەناو خۆشی ژیان و حەرام خواردن، بەخوا دنیاو قیامەتت لەدەست دەرئەچێت. سوێند بە خوا دڵسۆزم بۆت، بەڵام بە قۆزی و جوانخاسی پیاو تێمەکەوە، تۆ خۆت کچێکی تا بڵێیت جوانیت، لەم دنیایەدا تەنها وەرزێر نییە، بەڵکو وەرزێر ئاسا زۆرە، خۆ ئەگەر گەیشتۆتە ئاستی ئەوەی زۆر یەکترتان خۆش ئەوێت و لە پلەی عیشقدان لەبەر تۆ دەچم بۆلایی و قسەی لەگەڵ دەکەم، یەکجار ئەوەندەش ڕەق نیم وەکو شیرکۆ دەڵێت، ئیتر بڕیار لای تۆیە.

گەنم: بەخوا کوڕێکی زۆر باشە، ئێمە لەسەر بنەمای زەواج یەکترمان قبوڵ کردووە، دوو ساڵە لە زانکۆم کەس نەیتوانیووە هەڵەم لێ بگرێت، بڕیاری کۆتایش لای تۆیە و لەقسەشت دەرناچم.

زۆر بەزییم پیاهاتەوە، باشە بڕۆ قسەی لەگەڵدا بکە با ببینم و منیش قسەی لەگەڵ بکەم، باشە؟

گەنم دەموچاوی کەوتەوە پێکەنینی و وتی: باشە بەسەرچاو.

ماکوان: ئەی تۆ بەتەمای کەی ژن بهێنیت شێرکۆ؟

شێرکۆ: جارێ تۆم لە پێشەوەی، با تۆ بیهێنیت، ئەوکاتە سەرەی منە.

زۆر پێکەنیم بە قسەکەی، باشە ئێستا فێرتان دەکەم چۆن نوێژ بکەن، ماوەیەک بۆم باس کردن کە نوێژ کردن واتای چییە، نوێژم بۆ نووسینەوە لە سەرەتا تا کۆتایی و بە زمانی کوردی و عەرەبی بۆم ئاسان کردن کە بتوانن بیکەن، دوای ئەوە وتم گەنم گیان، کوڕم شێرکۆ ئەگەر پەیوەندیتان بە خوای گەورەوە بەهێز بوو هەرچی هاتە سەرزمانتان بۆ داواکردن بزانن کە خوای گەورە دەیەوێت پێتان ببەخشێت.

نوێژکردن خۆشەویستی نێوان تۆو زاتی پەروەردگار زیاد دەکات، کە خوات خۆشویست هەموو کەس خۆشی دەوێت، ئەگەر خوای گەورە لەبیر بکەیت خوای گەورە خۆشت لەبیردەباتەوە، ئەوانەشی کە خۆشەویستیت بۆ دەردەبڕن لەدڵەوە ڕقیان لێتە.

هەرچیتان کردووە بەردەوام بن لە نوێژکردن و خواناسی و ئاگاتان لە داوێن و دەم ودەست و قاج و چاوو گوێتان بێت، هەمووی ئەدەواتی تاوانەو لەهەمان کاتدا کەرەستەی عیبادەتن.

گەنم: کاکە پرسیارێک بکەم؟ توخوا تووڕە مەبە.

ماکوان: فەرموو.

گەنم: باشە تۆ کێیت؟ تۆ ڕۆژنامەنووسی، ئەفسەری، مەلای، تۆ چیت؟ لە سعودییە دەژی یان لە ئەوروپا، تۆ خوێندنەوەت بۆ ناکرێت، ناتوانم بتناسم چ کەسایەتییەکی، کە تووڕە دەبیت لێت دەترسم، کە لێت دوورم وەکو باوک و برای گەورە و هەرچی کەسمە بیرت دەکەم، کە دێمە لات ژیانم بە تەواوی گۆڕانکاری بەسەردا دێت، بەتەنها دەمەویت لەدەمی خۆت خۆت بناسم، ناتوانم بتخوێنمەوە کە ڕۆژنامەنووسەکان دێن فێریان دەکەیت چۆن بنووسن و چۆن کاربکەن، هاوڕێکانت وەکو پادشا و برای گەورەی خۆیان ڕێز و خۆشەویستیت بۆ دەردەبڕن، پێم بڵێ تۆ کێیت؟

ماکوان: گەنم گیان من تەنها خەسرەوم برای تۆ، بەڵام زۆر حەزم بە دین و خواناسییە، ئەم خوا ناسی و دینداریيە کەسایەتییەکی بەهێزی بە من بەخشیوە، جا لەبەر ئەوە تۆ دەزانی من زۆر کەسایەتیم تایبەتە، بەڵام زۆر سادە و سانام، بۆیە هاوڕێکانم منیان خۆش دەوێت، ئەوەی دەیزانم فێریان دەکەم، ئەوەی پێمە پێیان دەبەخشم، خیانەتیان لێناکەم، ئیتر ئەوە منم گەنم گیان، هەزارەهای تر هەیە لەمن باشترەو منیش لەوانەوە فێربووم.

گەنم: باشە باوابێت، بەڵام تۆ ئاستی ڕۆشنبیریت یەکجار گەورەو بەرز و فراوانە، هەست دەکەم لە زانکۆیەکی تایبەت خوێندوتە، یان شتێکی زۆر سیحری و ئەفسوناویت پێیە.

ماکوان: یەکجار واش نییە، ئەوە من و تۆ خوشک و براین، لەو چاوەوە تەماشام دەکەیت.

لەم قسانەدا بووین میوانم هات بۆ نووسینگەو کاروانیش گەڕایەوە، منیش بەسەر کارواندا بەجێم هێشتن و لەگەڵ شێرکۆ و گەنم چووین بۆ کەباب خواردن، زۆر خۆشحاڵ بووم گەنم و شێرکۆ زۆر نێوانیان خۆش بوو.

ئەو ڕۆژە زۆر خۆش بوو، چووین بۆ کتێب کڕین و گەڕان و بازاڕ و نانخواردن، تا ئێوارە کاتژمێر ٥ بەیەکەوە بووین و داوام کرد لەگەنم و شێرکۆم بۆ بەرێتەوە، منیش بەپێ لە شەقامی پیرەمێردەوە سەرکەوتم بەرەو ماڵەوە، لە ڕێگا (محمد عومەر عوسمان) هاوڕێیەتی کردم تا نزیکی ماڵەوە، ئێوارەیەکی زۆر خۆش بوو، گەیشتمەوە ماڵەوە، ئەو تەلەفۆنەی کە ژمارەی ئاسیا سێڵی تیابوو کە دایکم خاوەنی بوو منیش بەکارم دەهێنا ئەو ژمارەیەم دابوو بە هاوڕێ و پاشان گەنم و شێرکۆ زیاتر کۆڕەکەکەی پێشڕەوی برام پێبوو ئەوەم بەکار دەهێنا.

گەیشتمەوە ماڵەوە دایکم پێی وتم کە چەند کەس تەلەفۆنی بۆ کردووم لەناو ئەو کەسانەدا کچێک تەلەفۆنی بۆ کردوویت ناوی سروە بوو.

منیش هیچ ئافرەتێکم بەو ناوە نەدەناسی لە شاری دەربەندیخان، وتم ژمارەکەی کامەیە؟ نیشانی دام و چەند جارێک تەلەفۆنم بۆ ژمارەکە کردەوە داخرابوو، ئیتر زۆر گوێم پێنەدا، نزیک کاتژمیر ٩ی شەو وریا تەلەفۆنی بۆکردم، وتی نەبەزم لایە، بەیانی بێین بەشوێنتا بۆ نوێژی جومعە؟ دەچین بۆ مزگەوتی خانەقا، دێیت؟

ماکوان: ئەی بۆ نا، بەڵام بە نەبەز بڵێ بزانە دەتوانێت بەیانی بمبات بۆ زڕگوێز؟ تەلەفۆنەکەی وەرگرت لە وریا و وتی لەڕاستیدا هەر بۆ ئەوە تەلەفۆنم کرد، حەزم نەکرد ڕاستەوخۆ پێت بڵێم، دەتبەم و ئەگەر کەسیش نەبوو بتهێنیتەوە هەر خۆم دێم بە شوێنتا.

ماکوان: زۆرباشە، بەیانی ڕەشەمۆڵ چۆڵە ناچم بۆ نووسینگە هەر لەماڵەوە دەبم وەرن بۆ ئێرە.



وریا: ئەی بۆ نەیەم بە شوێنتا ئێستا تەلەفۆن بۆ هیوا ڕەشیش دەکەین و دەڵێین خەسرەوە سور دێت، ئەم شەو سورو ڕەشیش تێکەڵ دەکەین، بێم؟

ماکوان: من لە خزمەتاندام بزانن هیوا دێت، ئەگەر ئەو هات منیش دێم.

وریا: وەڵڵاهی تۆ زۆر پاکیت.

ماکوان بە پێکەنینەوە: بۆ ئاخر هینی ئەوەیە تازە خۆم شتووە.

وریا: هیوا لێرەیە ئاشکرامان نەکرد، وتمان نەوەک حەز نەکەیت بێیت، با ئیحراجت نەکەین، کەوتمان تەلەفۆن بۆ هیواش دەکەین ئەگەر بتوتایە هیوا بێت من نایەم ئەوا هیوا پێشتر وتی ئەگەر وا بڵێیت واتا دڵی لێم پاک نەبۆتەوە، دەیویست بزانێت دڵت چۆنە لەئاستیدا، ئەو تۆی زۆر خۆش دەوێت.

ماکوان: کوا هیوام بەرێ.

هیوا: مامە خەجاڵەتم بەخوا تەنها بۆ ئەوەبوو کە بزانم دڵت لێم پاکبۆتەوە، هەرچەندە مامە نەبەز وتی ماکوان دووڕووی نییە، هەریەک ڕووە، بەس من بۆ دڵنیایی خۆم بوو.

ماکوان: کوڕی باوکم تاقیم دەکەیتەوە، ئەوە گلەیی بێت لێت.

هیوا: تۆ وەرە با ئەم شەو تێر قسە بکەین چیم پێ دەڵێیت تۆ حەقتە، گرنگ ئەوەیە من زانیم دڵت پاکە و پیاویت، بەخوا خۆشم نەویستیتایە ئەوەم نەدەکرد.

نەبەز: لەئێوارەوە باسی تۆ دەکات، خۆت بگۆڕە واهاتم بە شوێنتا.

چووم بۆ ماڵی وریا، ئەوان لەوێ بوون دەستکرا بە قسە و باس و مەجلیس گەرم بوو تا نوێژی بەیانی.

سەرەتای باسەکانمان بەباسی مردنی من دەستی پێکرد.

وریا: ماکوان چ هەستێکت هەیە کە ئێستا هەست بە نزیکی مەرگ دەکەیت، هەڵبەت دەمەوێت لە خودی واقعی کارەکەوە لە خۆت بپرسم، زۆر ببورە هەرچەندە دەزانم پرسیارەکەم بۆ تۆ نەشیاوە.

هیوا: کورە مامە تۆ دەڵێی چی مامە ماکوان چاکیش دەبێتەوە و زیاتر لە هەمووومان دەژی، ئەرێوەڵڵا پرسیارەکەت زۆر نامەعقولە وریای حاجی حەسەن.

ماکوان: نا ئاساییە مامە هیوا دەستی وریای براشـم خۆش بێت، وریاش دەیەوێت خۆی بۆ ئامادە بکات، خۆ مردن باشە کە خەڵک لە خەیاڵیدا بێت و بۆی بژی.

وریا: بەخوا تەنها دەمەوێت خۆم ئامادە بکەم بۆی، باشە هیوا ڕەش ماکوانی برام چۆن لە پرسیارەکە گەیشت.

ماکوان: بەهەرحاڵ ئەو کاتەی کە شۆڕشگێڕێک دەچێتە جەنگ بەتەمای مردن نییە، یان هەر سەربازێک بەنیازی سەرکەوتن جەنگ دەکات یان بەنیازی زرەرو زیان لە مردن، ئەم مردنەی من تێکەڵاو بوونە بە قەزاو قەدەر، هەرچەندە زۆر نەشیاوە بڵێم لە کاتەکەی کەمێک خەفەتم هەیە، هەرچەندە کات بۆ خوای پەروەردگار بەهای نییە و ئێمەین کاتمان پێویستە، مردن هاوسەرگیریەکی زۆر جوان و شایستەیە لەگەڵ خلود، مرۆڤ ئەگەر خواناس و ئیماندار بێت دەزانێت بەمردنی خلود دەست پی دەکات، واتا منیش بەوچاوەوە ئێستا تەماشای مردن دەکەم.

وریا: من لەئاگری دۆزەخ دەترسم ماکوانی برام لەمردن ناترسم.

هیوا: مامە ئەوەندە ئیشی قۆڕی کردوە بۆیە دەترسێت وریا.

ماکوان: کەسمان نییە بێ تاوان بین، مامە هیوا هەموو تاوانمان کردووە، مرۆڤی موسڵمان دەبێت لە کڵپەو ئاگری خۆی بترسێت، نەک دۆزەخ.

وریا: لەو قسەیەت تێناگەم مەبەستت چییە لە ئاگرو کڵپەی لاشەت بترسیت، مەگەر دۆزەخ خۆی ئاگر و کڵپە و گڕ نییە؟

ماکوان: یەکێک لە پیاوچاکان دەڵێت لە خەونمدا بردمیانە بەردەرگای دۆزەخ دەرگاوانی دۆزەخ وتی تۆ لێرە لاچۆ خەڵکی دۆزەخ نیت، دەڵێت لە خەونەکەمدا بە دەرگاوانەکەم وت دەمەوێت دۆزەخ ببینم و بزانم چۆنە و خەڵکەکەی چۆنن؟ دەڵێت کە دەرگاکەی بۆ کردمەوە زۆر ئاسایی بوو ئاگری تێدا نەبوو، وتم کوا ئاگرەکەی؟ وتی: هەر مرۆڤەو بە ئاگر و کڵپەو تاوانی خۆی دەسووتێت، جا پێویستە خۆمان لەو تەوقی ئاگر و کڵپەی تاوانە بپارێزین. دەبێت خۆمان بپارێزین لە دۆزەخ و هەوڵبدەین بۆ بەهەشت، واهەست نەکەین لە داهاتوودا بەهەشت و جەهەنەم دروست دەبێت، بەڵکو ئێستا هەردوکیان وجودیان هەیە، کە گەیشتین بە خۆشەویستی خوای گەورە و کارمان کرد بۆ بەدەستهێنانی و ڕازی بوونی دڵنیابە لە ئێستاوە لەبەهەشتین خۆ ئەگەر پێچەوانەکەیمان گرتە بەر دۆزەخ جێگامانە.

بەرزبوونەوە بۆ بەهەشت ئاسانە، چونکە لەناخی خۆمانەوە دەست پێ دەکات بەو مەرجەی باڵی خۆشەویستی بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی بجوڵێنین، ئەو باڵانە دەمانگەیەننە جێگای مەبەست بێ پەیژە، خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ * وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾ خۆشەویستی خوا بەوە دروست دەبێت چۆن دایکمان دەناسین و دەزانین چەندە دڵسۆزە بۆمان (ولله مثل الأعلي) دەبێت بەهەمان شێوە زیاتر خوا بناسین، ئینجا خۆشەویستیەکەی کە دروست دەبێت ئەویش لەفەرمودەیەکی قودسیدا خوای گەورە دەفەرموێت: { يا عِبَادِي، إِنَّكُمْ تُخْطِئُونَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ، وَأَنَا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا، فَاسْتَغْفِرُونِي أَغْفِرْ لَكُمْ}رواه مسلم



واتە: ئەی بەندەکانم ئێوە بە شەو و ڕۆژ تاوان دەکەن، دەبگەڕێنەوە بۆلام و داوای لێخۆش بوون بکەن تا لێتان خۆش بم.

برا ئێمە شەوو ڕۆژ تاوان دەکەین، خوای گەورە چاوەڕێی ئەوەمان لێ دەکات کە داوای لێخۆش بوون بکەین، کەچی نایکەین، بەڕاستی هەندێک زۆر موستەحەقە بە ئاگری دۆزەخ، لوت بەرزە نەخۆشەویستی دەزانێت چییە، نەحورمەتی هەژار و بێوەژن و بێدەرەتان دەزانێت، نەدەزانێت نەخۆشی چییە، ڕۆژێک لە ڕۆژان سوپاسی نیعمەتەکانی خوای گەورە ناکات ئێوە بڕیار بدەن ئەم جۆرە کەسانە بۆ کوێ باشن، بە دڵنیاییەوە دۆزەخ.

وریا: ماکوانی برام با پرسیارێکی تر بکەم زۆر کەس هەیە بێ دینە و خوا ناناسێت، بەڵام خەڵکی باشن ئایا ئەوانەش دەچنە دۆزەخ؟

ماکوان: یەک کەسی خوانەناسم پێ بڵێ کە باش بێت لەم جیهانەدا؟ خوانەناس زۆرن بەڵام پێم بڵێ فلانە کەس خوانەناسە و باشە.

وریا: ئێستا لە یادم نییە، بەڵام تۆ بڵێی نەبێت؟

ماکوان: کەی بیرت کەوتەوە یان دەستت کەوت بۆمان بهێنە، لەڕاستیدا لەوانەیە هەبێت هاوکاری هەژاران بکات، بەڵام دەیان قومارخانەو کلوپی ئافرەتانی لەش فرۆشی بڵاوکردۆتەوە، خەستەخانە دروست دەکات، بەڵام پیاوکوژە و کارخانەی چەکی هەیە، بڕوابکە خوانەناسێک نادۆزیتەوە باش بێت، لە سویسرا کەسێکی زۆر باش و نموونەیی ناسراو بوو بێ دین بوو کە مرد، خەڵک زۆر بەباشە باسیان دەکرد، دوایی کچەکەی ئاشکرای کرد کە بەزۆر لەگەڵیدا خەوتووە و دوو منداڵی لەباوکی هەیە.

سەدان و هەزاران نموونەی تر زۆرن، جا دڵنیابە خوای گەورە هەرگیز زوڵم و زۆر لەکەس ناکات، خەڵکی ئازاد کردووە لە نێوانی بەهەشت و دۆزەخ دا خۆت ئازادی هەڵیبژێرە.



هیوا: مامە کە گوێ لە تۆ دەگرم قسەکانت لە قسەی کەسی تر ناچێت نابینم خەڵکی ترو مامۆستاو کەسە ئیسلامییەکان بەم شێوەیەی تۆ قسە بۆ خەڵکی بکەن، شتەکانیان دووبارەیە.

ماکوان: ئاخر ئەوانەی وەکو منن و لەمن زۆر باشتر مەجالیان بۆ نارەخسێت، ئەوانەشی کە دەچنە جێگا گرنگەکان بەهۆکاری حیزبایەتی یان دەسەڵات نایەوێت، خەڵکی ئاقڵ و زیرەکەکان دەربکەون، کە دەرکەوتن جێگای دەسەڵاتەکەیان لێژ دەبێت، بۆیە مامە هیوا لەگەڵ ڕێزم بۆ هەندێک لە مامۆستا باشەکان و زانایان ئەم کوردستانە لێکۆڵینەوە و شیکاری نوێ پێشکەش ناکەن، خەڵکی وا دەزانێت، ئیسلام تەنها کۆمەڵێک باسو خواسە کەلای ئەوان کۆبۆتەوە، لەمڕۆدا لەناو کورد دا تەنانەت چواردەوریشماندا لێکۆڵینەوەیەک کراوە لەسەر (نێرەموک) کە زۆر زەرورە، بزانە ئەو هەموو خەڵکە زیندانە مامۆستایەک ئەحکامی زیندانیان نووسیوە یان دۆکتۆرایەک یان ماستەرێک لەسەری هاتووە لەسەرەتای قورئان تا کۆتایی سورەتی مەریەم وشەی (کلا)ی تێدا نییە. ئەو مامۆستاو زانایانەمان بزانە شیکارییەکیان کرد بۆ ئەو باسە کە زۆر گرنگە، بزانە جیاوازی کراوە لە سورەتی البقرة دا ناوی حەزرەتی ابراهیم بێ (ی) نووسراوە، بەڵام لەهەموو سورەتەکانی تردا بە پیتی (ی) نووسراوە، هەزارەها شتی نوێی تر کە چاوەڕێیە موسڵمانان لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن، بەڵام بەداخەوە زۆر کەمن ئەوانەی کە بیریان لای نوێ کردنەوەیە، بۆ ئەوەی حەزی خەڵکی زیاتر بێت بۆ دین، بەڕێزان سوێند بەخوا خەڵک کە زۆر نایەتەوە بۆ دین لەبەر ئەوەیە زانا و بانگخواز و دانشمەندەکانمان شتی نوێ یان پێ نییە، خەڵکی بەسروشتی خۆی حەزی بە نوێگەرییە.

بزانە فکری ڕۆژاوایی هەمیشە خۆی نوێ دەکاتەوە، خۆ بنەڕەتی ڕۆژاوا لە یۆنانەوە تەماشا بکەین ناوی لێناوە سەردەمی کلاسیک، دوای سەردەمی هەستانەوە، پاشان سەردەمی نوێ بوونەوە، دوای ئەوە سەردەمی نوێگەری، دوای ئەو پۆست مۆدێرنە ...هتد.

بەڵام ئەوانەی لای ئێمەش تازە بە تازە لە سەر ئیختیلافی زانایان جنێو بەیەکتری دەدەن.

لەسەر مینبەری سەلەفی گوێم لێبووە، قسەی ناشرین واتا جنێودراوە بە سەید قوطب (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەسەر مینبەری سۆفی جنێو بە شیخ ئیسلام ئیبن تەیمییە دراوە، ئیتر بەم شێوەیە، خەڵک زۆر ناڕەحەتە لەدەستی زانایان و بیرمەندانی موسڵمان، بەڵام دەزانم خەڵکی زۆر موشتاقی دینداریە و کەسێک نییە بەباشی دەستیان بگرێت بۆ ئەم دینە تا پێوەی پابەند بن.

هیوا: بەزاتی خوا مامە قسەکانت تەواوە و زۆر ڕاستە، دوایی گلەیی دەکەن لە ئاسایشیش دەڵێن بۆ ئەمان گرن و ڕێگەمان پێ نادەن.

ماکوان: هیوای برام ئەمە هەنجەت نییە بۆ ئاسایش و دەزگانی یەکێتی و پارتی زیندانەکانیان پڕ بکەن لە موسڵمانان، بەدڵنیاییەوە ئەوان باش نین، قسەکانی من بۆ ئەوە نییە دەزگاکانی ئێوە سوودی لێ وەربگرن و دوای تۆ بڕۆیت گەنجی موسڵمان بخەیتە زیندان لەسەر ئەوەی ئیختیلافی هەیە، ئەوە کاری ئاسایش نییە، بەڵکو کاری ئاسایش ئەوەیە کە بیانپارێزێت و نەهێڵێت شەڕ و دەمەدەمێ دروست ببێت، نەک زیندانیان بکات، چونکە دەزگاکان خۆیان پێویستیان بە چاکسازی و ڕاستگۆیی و دەستپاکی هەیە، ئەوەندە ئاسایشەکانیش شەریف نین.

هیوا: مامە خەسرەوی برام بەخوا وابزانم توڕەم کردی، بەخوا خۆت باش دەزانیت من سەربازم و ئاسایش نیم، قسەکە هەروا کردم تۆچی دەڵێیت تەواوە.

دەستم کرد بە پێکەنین و وتم: ئەزانم لە دڵسۆزیت وات وت، بەڵام ئەوە ناکاتە ئەوەی ئاسایش بێتە ناو خەڵکی لەسەر زیندان بکات، کاتی نوێژی بەیانییە، با نوێژەکانمان بکەین و بخەوین.



بەیانی کاتژمێر ١١ی نیوەڕۆ دایکم بە تەلەفۆن بە ئاگای هێنام، هێشتا ئەوان خەوتبوون، دایکم وتی ڕۆڵە ئەو کچە لە دەربەنیخانەوە تەلەفۆنی کرد وتی من ناتوانم بێم بۆ سلێمانی، یان ئەگەر هاتم دەبێت پارەی سەیارەکەم بۆ بگێڕێتەوە، تەلەفۆنەکەی داخستەوە و هیچی تری نەوت و منیش هیچی لێ تێنەگەیشتم.

ماکوان: ئەی تەلەفۆنت بۆ نەکردەوە؟

دایکم: نا؛ وتم با بە خۆت بڵێم.

ماکوان: ژمارەکەیم بەرێ با تەلەفۆنی بۆ بکەم.

دایکم دایبخەوە با بۆت دەربهێنم.

پاش کەمێک دایکم تەلەفۆنی کردەوە ژمارەکەی دامێ، تەلەفۆنم بۆ ئەو ژمارەیە کرد پیاوێک هەڵیگرت وتم قوربان کەسێک بەم مۆبایلەی جەنابت تەلەفۆنی بۆ من کردووە ناوی سروە خانە دەکرێ قسەی لەگەڵ بکەم، با بزانم ئیشی چییە؟

کەسەکە هەر زۆر بێڕێز بوو، وتی سروە کێیە، بابە عەرەبانەکەت ڕابکێشە، دایخستەوە بەسەرما منیش بەدەم خۆمەوە وتم بەخوا ڕۆڵە بێ ئەدەبی.

وریا: ژمارەکەیم بدەرێ.

تەلەفۆنی بۆ کرد قسەی لەگەڵ کرد وتی کەسێک بەم ژمارەی تۆ ژمارەی نەقیبێکی ئاسایشی لێداوە و ویستویەتی قسەی لەگەڵدا بکات، کە وای وت کابرا زمانی لاڵ بوو، من کە بەجوانی قسەم لەگەڵ کرد دایخستەوە بەسەرما، بەڵام وریا بەو شێوەیە قسەی لەگەڵ کرد وەڵامی دایەوە و وتی من مۆبایل و شت چاک دەکەمەوە لە شاری دەربەندیخان، خەڵکی دێنە لام ئەو ئافرەتەش هاتۆتە لام ١٠٠٠ دیناری دامێ و منیش تەلەفۆنەکەم دایە قسەی پێ کرد، ئیتر نازانم کێیە، کەوای وت وتم حەمەن

کەسێکە داوای خێر و زەکات و پارە دەکات، دیسان گوێم پێنەدا و خۆم شۆرد لەماڵی وریا و سورەتی الكهف-م خوێند، ئەوانیش هەموویان خۆیان ئامادە کرد چووین بۆ نوێژی جومعە.

لە نوێژی جومعە دابوو دوکتۆر چالاک تەلەفۆنی کردبوو دووجار، نەمدەتوانی وەڵامی بدەمەوە، دوایی تەلەفۆنم بۆ کردەوە وتی کاک ماکوان ئەگەر کەس نییە بتهێنێت خۆم دێم بە شوێنتا، یان ئازار خان هێشتا دەرنەچووە ئەو سەیارەی پێیە دێت بە شوێنتا؟

ماکوان: زۆر سوپاس دوکتۆر گیان کێشەمان نییە لەم سەر پێناچێت لەو سەریش هەر کێشەمان هەبێت سوپاس بۆ خوا، هاوڕێیەکم دەمهێنێت بە پشتیوانی خوای گەورە دێینە خزمەتان.

د. چالاک: تکایە کاک ماکوان بیرت نەچێت سەرقاڵیت لەبیرت نەچێتەوە دانیشتنەکەی ئەمڕۆ بخەرە پێش هەموو شتێک، دەبێت ئەمڕۆ قسەت لەگەڵ بکەم سەبارەت بە نەخۆشییەکە دەبێت کات دابنێین بۆ پشکنینی نوێ.

ماکوان: دوکتۆر گیان لەگەڵ هاوڕێکانم هیچ کارێکمان نییە، دوای نان خواردنێک دەکەوینە ڕێ و دێمە خزمەتان، لەگەڵ ئەو ماڵئاواییم کرد و بە نەبەزم وت برا بمبە بۆ زڕگوێز، وریا و هیواش وتیان ئێمەش دێین ئیشمان نییە، هەموو بەیەکەوە کەوتینە ڕێ بەرەو باخەکەی دوکتۆر چالاک و لەناو سەیارەکەدا وتم برایان ئێوە دەزانم لەگەڵم دا هاتوون و دەڵێن با ماکوان بە تەنها نەبێت و بیرکردنەوەی زۆر نەبێت لەمردن، من ئەم برایەتی و کارەتان زۆر گەورە دەنرخێنم، هەرگیز لەبیری ناکەم، بەو تەمەنەی کە ماومە لەناوتاندا، بەڵام وا ئەزانن من لە خەمی مردندام، سوێند بەخوا لەخەمی ئەوەدام کە لەکوێ بمرم، چونکە کامتان کە دەچنەوە ناو ماڵومنداڵی خۆتان ئارام نین؟ گومانم نییە کە هەموتان وان، نەبەز کە ژنی نییە کە دەچێتەوە لای دایکی و سەیرانی خوشکی ئارامە، سوێند بەخوا من دەچم بۆلای خوایەک لەدایکو باوک و لە خێزان و منداڵ و لەهەرچی

کەس هەیە بەڕەحم ترە، من خەمی مردنم نییە. حەز دەکەم دڵنیا بن، بەڵام هاوکاریم بکەن تا بتوانم بڕیار بدەم لەکوێ بمرم باشە.

هیوا: مامە سور بەخوا دەمی خۆم و ئەوانەش لەگەڵماندان دەشکێنم باسی جێگای مردنت بکەن، تۆ دەڕۆی مامە من دەزانم دڵم لێیداوە، تۆ بۆ وابیر دەکەیتەوە؟

وریا: بەدڵنیاییەوە مردن و ژیان بەدەست خوایە، مامە خەسرەو گیان هیوات بە خوای خۆت بێت هەرگیز هیوا بڕاوت ناکات.

نەبەز سەیارەکەی وەستاند و وتی: تەماشاکەن ئەو پیاوە چی دروست دەکات بە بەرد کەڵەک دروست دەکات.

هیوا: دەی جا چییە، خۆ شتێکی عەجیب نییە؟

نەبەز: ماکوان تەماشا بکە، ئەمە ئەو پیاوەیە پیرە نییە کە ناوی شێخ صاڵحە ئەوەی کەبابەکە؟ نا ناوی عەبدوڕەحمان بوو، چییە ناوەکەیم بیر نەماوە، ئەوە خۆیەتی؟

ماکوان: وەڵڵا خۆیەتی، دابەزیم چووم بۆلای خێرا عەرزم کرد جەنابی شێخ ئەوە چی دەکەیت لێرە؟ هاوکاریت ناوێت؟

شێخ: مەیە بۆلام بگەڕێرەوە با دوا نەکەویت، بەڵام ئەوەی کە ژیانت ڕزگار دەکات و دەردو بەڵای تۆی بۆ خۆی برد ئاگات لێی بێت و بەجێی نەهێڵیت، تا لێت ون نەبێت قەدری نازانیت، کەس نییە وەک تۆ قەدری بزانێت.

ماکوان: چییە قەدری دەزانم؟

شێخ: جارێکی تر یەکتری دەبینینەوە، من زۆر سەرقاڵم دەبێت بەرد زۆر بخەمە سەریەک تا دیوارێکی بەهێز دروست بێت، ئەم ناوەش بەردی باشی لێ نییە، بڕۆ با دوا نەکەویت.



خواحافیزیم لێ کرد و گەڕامەوە ناو سەیارەکە باسەکەم بۆ گێڕانەوە، تۆزێ نەبەز گرنگی پێدا ئەوانی تر هەر تەقەی مێشکیان دەهات، منیش ۱۰۰۱ تەفسیرم بۆ دەکرد هیچی لێ تێنەدەگەیشتم و بۆم حەل نەدەکرا، وەکو گرێ کوێرە وابوو بۆم نەدەکرایەوە.

منیان گەیاندە لای باخەکەی دوکتۆر چالاک و نەبەز وتی بێمەوە بە شوێنتا؟

د. چالاک بەخێرهاتنی کردم و خوا حافیزی لەنەبەز و هیوا و وریا کرد وتی پێویست ناکات بێیتەوە بە شوێنیدا سەیارە زۆرە دێتەوە بۆناو شار لەهاتنەوەی بێخەم بن.

لەگەڵ دوکتۆر چالاک پێش ئەوەی بڕۆینە شوێنی دانیشتنەکەمان لەگەڵ نەخۆشەکانی تر بینیم سەیارەی زۆر وەستا بوون، وتم دوکتۆر دیارە نەخۆشەکانت زۆر بوون، ئەم نەخۆشییە وەکو هەڵامەت وایە زوو بڵاو دەبێتەوە.

د. چالاک: ئەمڕۆ زۆربەی نەخۆشەکانم هاتوون، هەرچەندە هەندێک لەو نەخۆشانەم بڕیاریان دابوو کەچیتر نەیەن، بەڵام ئەگەر بڵێم لەبەر تۆ هاتوون بڕوا بکە.

ماکوان: بۆ سەرەی منە بۆ مردن خوا حافیزی دەکەن لێم؟

د. چالاک: نا؛ موفاجەیەک ئامادەیە بۆ تۆ، بابڕۆین خۆت دەزانیت چییە.

## ئەوەی کە هەرگیز چاوەڕێی نەبووم و بەتەمای نەبووم

لەگەڵ دوکتۆر چالاک چووینە ناو مەجلیسەکە منیان بینی هەموو لەبەرم هەستانەوە، کچەکان سەرو گوڵیان دامێ و سڵاوم کرد لەهەموویان و وتم چییە بەتەمان بمرم یان مردوم و ئاگام لەخۆم نییە، بەڕاست چی بووە؟ هەموو پێدەکەنین منیش خۆم تەقەی مێشکم دەهات.

د. چالاک: کاک ماکوان من لەجیاتی ئەوان قسە دەکەم، بەڵام تکایە هەمووان مۆبایلەکانتان بکوژێننەوە بادەست پێبکەین.

هەموو مۆبایلەکانمان کوژاندەوە و دوکتۆر چالاک وتی: دوێنێ کاک دلاوەر و گەڵا خان لەیەکتری مارە کران بەفەرمی!

کەوای وت منیش هەستام باوەشم کرد بە دلاوەر دا وتم یاخوا پیرۆزت بێت، پاشان ڕوومکردە گەڵا و وتم: گەڵای خوشکم پیرو عاشق بن بەیەکەوە، کورد دەڵێت پیرو خەڕۆ بن، یاخوا هەرگیز خەڕۆ نەبن بەیەکەوە بەڵکو ڕۆژ بەڕۆژ خۆشەویستیتان زیاد بکات و دوعای خێرتان بۆ دەکەم، بەڵام دوکتۆر ئەو دوو بەڕێزە هاوسەرگیریان کردووە ئێوە گوڵتان بۆ بۆ من هێناوە؟ گوڵەکانم کرد بە دووبەش و یامە دەست دلاوەر و گەڵا، دوعام بۆ کردن و من چوومە جێگای خۆم دانیشتم.

د. چالاک: هەموو لایەک تکایە بێ دەنگ بن، ئەوەی ئەم دوو خۆشەویستەی گەیاندە یەک کاک ماکوان بوو، جا بۆیە لێرەوە هەموو سوپاست دەکەین و دەست خۆشی ئەو کارە نایابەت لێ دەکەین.

هەموو چەپڵەیان بۆ لێدام، منیش سەرم داخست زۆرم پێ ناخۆش بوو، دیار بوو هەموویان بە ڕووداوەکەیان زانیبوو، دوکتۆر چالاک بۆی باس کردبوون و دلاوەر و گەڵایش هەموو شتێکیان گێڕابویەوە، بەڕاستی من

پێم ناخۆش بوو کە شکۆی دلاوەر و گەڵا بشکێت، بەڵام دیاربوو لای ئەوان زۆر ئاسایی بوو.

ماکوان: سەرەتا من سوپاسی هەموتان دەکەم، بەخوای گەورە پێم خۆش نەبووە باسکراوە، هیوادارم گەڵا و دلاوەر خۆشحاڵ بن و ژیانێکی زۆر بەختەوەر بەرنە سەر، من بەدوای ئەوەوە نەبووم کە ئەم باسە لەناو خەڵکدا بڵاوبێتەوە، پاشان دوو هۆکار هەبووە بۆیە ئەم کارەم کردووە، هۆکاری یەکەم نێوانی خۆمم و خوایە، پاشان هاوکاری دوکتۆر چالاکم کردووە، ئەویش خۆی باش دەزانێت کە مەبەست چییە لەکارەکە، پێویست بە باسکردنی ناکات.

ئەنوەر: کاک ماکوان تۆ ڕۆمیۆ و جولێتت بەیەک گەیاند چیرۆکی ئەوانت تەواو کرد.

د. چالاک: لەوانەیە تۆ خۆشحاڵ نەبیت بەباسەکە بەڵام بۆ ئێمە زۆر گرنگە کە باسی بکەین و هەست بکەین جارێ ژیان بەتەواوەتی ئەهریمەن دەستی بەسەردا نەگرتووە، ئاهورا مازدا زۆرن کە ڕزگار کەرەکانیان بنێرن!

دەبوو وەڵامی هەردووکیان بدەمەوە چونکە دوو شتیان باسکرد کەهیچی بنەڕەتی ڕاستی نەبوو.

ماکوان: برایان سوپاس بۆ کاک ئەنوەری بەڕێز بۆ کۆمێنتەکەی گرنگی عیشق لەوەدایە کە عاشق هەرگیز بۆ مەعشوقەکەی کۆڵ نەدات، شیرین و فەرهاد زۆرە، ڕۆمیۆ و ژولییێت زۆرە کە ناوە ئەسڵیەکەی بەو شێوازەیە و کاک ئەنوەر بە جولیێت ناوی برد، هەرچەندە هەردوکی ڕاستە بەڵام خۆ شکسپیر باسی ئەو دوو خۆشەویستە دەکات لە چیرۆکەکەیدا لە وڵاتی ئیتاڵیا هەزارەها عاشقی وەکو ئەو دوانە هەبوون، بەڵام ڕۆمیۆ لە عەشیرەتی مۆنتیاگۆی ئیتاڵی بوو، ژولییێتیش لە عەشیرەتی کەپۆریتی ئیتاڵی بوو، ئەم دوو عەشیرەتە بەدەیان کەسیان لەیەک کوشتبوو، گرنگی

خۆشەویستیەکەی ڕۆمیۆ و ژولییێت لەوەدا بوو کە کۆڵیان نەدا بۆیە شکسپیر سەرکەوتوو بوو.

لە نووسینی چیرۆکەکەی و کرا بە شانۆگەری و فیلم، شیرین و فەرهاد گرنگیەکەی لە خۆشەویستییەکەیاندا نییە، زۆری تر هەبووە کە خۆشەویستییان کردووە گرنگی فەرهاد کوهکەن لەودا بووە کە شاخی هەڵکەند بۆ خۆشەویستەکەی، کەواتە مرۆڤ نابێت لەپێناوی خۆشەویستییەکەیدا ترسی هەبێت و دەبێت شاخ وردو خاش بکات، ئەوە مانای پرنسیپی عیشقە.

بۆ ئەوەی کە ئەهریمەن و ئاهورامازدا باس کران، من بڕوام پێی نییە بەڵکو بە میتالۆجیاو زۆر خورافی دەزانم بەڵام لە واقیعدا خوای گەورە فێری کردم لەڕێگای پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ کە چۆن دەستگیرۆیی خەڵکی بەگشتی و موسڵمان بەتایبەتی بکەم تاکو خوای گەورە کار ئاسانی بۆ خۆم بکات، لەناو تیمەی کورد دا هەزاران و بگرە سەدان هەزار پیاوچاکی وەکو جەنابی دوکتۆر چالاکی تێدایە کەکاتی خۆی و تەنانەت باخەکەی بۆ نەخۆشەکانی تەرخان کردووە، جا بۆیە من دەڵێم ئەو چەپڵەیە بۆ دوکتۆر چالاک شیاوترە تاکو من، من دەستم کرد بە چەپڵە لێدان بۆ دوکتۆر چالاک و جەماعەتیش بەدوامدا هەموو چەپڵەیان لێدا و سوپاسی دوکتۆر چالاکمان کرد.

حاجی سەمیر لەهەمووومان بەتەمەن تر بوو، پیاوێکی مەعقول بوو وتی: منیش بڕیارم داوە هەر بەڕێزێک لە گروپەکەی خۆماندا زەواج بکات ئامادەم هەموو خەرجیەکەی بگرمە ئەستۆ.

هەموومان سوپاسمان کرد و دەست خۆشیمان لێکرد.

دوکتۆر چالاک سوپاسی کرد و وتی: کاک ماکوان باسکردنی ئەم جۆرە کارانە زۆر گرنگە بۆ ئەوەی خەڵکی تر چاوی لێ بکەن.



کردم بە قسەی خۆش و وتم: ئەم ئۆڤەرەی کاک حاجی سەمیر بەس شمولی ناو گروپەکە دەکات یان دەرەوەش، واتا ئەگەر کچێک لەگەڵ کوڕێکی تر هاوسەرگیری کرد مەرجە یەکێکیان لێرە بێت یان دەبێت هەردووکیان لێرە بن؟

حاجی سەمیر: کاک ماکوانی بەڕێز تۆ بڕیاری لەسەر بدە.

ماکوان: من دەمەوێت جارێکی تر لەگەڵ دایکی ئانا زەواج بکەمەوە کە ئێستا خێزانمە و بۆم بهێنەرەوە بۆ ئێرە. لێرە جلی بوکێنی بکەمە بەری و ئاهەنگێکی خۆش بگێڕم پێش مردنم.

حاجی سەمیر: تەمەن درێژ بیت و دایکی ئاناش تەمەن درێژ بێت ان شاء الله بەیەک دەگەنەوە و ناشمریت.

ماکوان: برا خوای گەورە پاداشتت باتەوە، سوپاسی قسەکانت دەکەم.

بەردەوام بووین لە قسەکردن هەرکەسەو لەگەڵ ئەوەی تەنیشتی قسەی دەکرد، من حاجی سەمیر لای ڕاستم و کاک ئەنوەریش لای چەپم دانیشتبوون، بەبازنەیی دانیشتبووین نزیکەی ١٦ کەس دەبووین.

د. چالاک: بەڕێزان تکایە بادەست پێ بکەین دوو هەفتە بەر لەئێستا کاک ماکوان باسی خۆشەویستی کرد، تاڕادەیەک لەوتەکانماندا ئەنجامێکی باشی بەدەست هێنا، هەفتەی ڕابردوو باسەکەمان لەسەر جۆری ئەو دەرمانانە بوو کە ئێستا دروست کراوە بۆ چارەسەر یاخود ڕێگا گرتن لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە لە جەستەدا، ئەم هەفتەیە باسی جۆری نەشتەرگەرییەکان دەکەین.

کامەران یەکێک بوو لە نەخۆشەکان داوای کرد کەباسی ئاسوودەیی دەروون و ئارامیی دەروون بکەین و هەرکەسە و ئەزموونی خۆی باس بکات کەبەچی دەگات بە ئارامی دەروون.






د. چالاک: ئایا مەبەستت لە ئارامی دەڕوونە لەم ڕەوشەی کە تێیدان و لەڕووی نەخۆشییەکەتانەوە؟

کامەران: نازانم بە شێوەیەکی گشتی و ئەگەر تایبەتیش بێت بە نەخۆشییەکە ئەوا باشترە، چونکە من هەمیشە لە دڵەڕاوکێدا دەژیم و ئارام نابمەوە وەکو ئەوە وایە لە زیندانی حیزبی بەعسدا بم و چاوەڕوانی لەسێدارەدان بکەم، هەمیشە پێویستم بە ئارامییەک هەیە چەند ساتە وەختێک تێیدا بژیم پێش مردنم.

ئازار: منیش ئەو هەستەم هەیە.

زۆرینەی نەخۆشەکان لەهەمان حاڵەتی کامەراندا دەژیان کە بەدوای ڕێگە چارەی دەروونیدا دەگەڕان پێویستە هەریەکە باسی ئەزموونێک بکات لەژیانی خۆی کە بەچی ئاسوودە دەبێت، هەمووومان لەسەری ڕازی بووین، هەرکەس پێشنیاری باسێکی کرد، دەبێت خۆی یەکەم کەس دەست پێ بکات بە قسەکردن، جا باسی ڕەوشی خۆی دەکات لە ڕووی دەروونی و ئازاری ناو کۆمەڵگەکەوە، کامەرانیش لەتەنیشت حاجی سەمیر دانیشتبوو واتا ئەگەر بهاتایەتە سەرەی من بۆ قسە کردن ئەوا پێش کۆتا کەس دەبووم.

کامەران دەستی کرد بە قسەکردن و وتی: ڕاستە من نەخۆشم بەڵام زۆرجار حەز دەکەم زوو بمرم و کۆتایی بە ژیانم بێت لەو حاڵەتەی تێیدا دەژیم، کەخۆم دەبینم لاوازم و تەماشای منداڵەکانم دەکەم بێ باوک گەورە دەبن و دڵسۆزێکی وا شک نابەم هاوکارییان بێت، ئەوەندەی تر دەردم گران دەبێت، نازانم چۆن لە بیری خۆمی بەرمەوە؟

یان کە بیر لە چارەنووسی ماڵومنداڵم دەکەمەوە ڕاستە من فەرمانبەری حکومەتم تاڕادەیەک باری دارایم باشە، بەڵام ئاسوودە نیم، بڕوا بکەن نەک لەبەر ئەوەی دەمرم، بەڵکو لەبەر ئەوەی لەدوای خۆم سێ منداڵ و خێزانم بەجێ دەهێڵم، من و خێزانم یەکتریمان زۆر خۆش دەوێت، دوای من نازانم



چی دەکات، زۆرجار دەڵێم بۆ ئەوەی بەجوانی بژی تەڵاقی بدەم و شوبکاتەوە، بەڵام دوایی هەرخۆم وەڵامی خۆم دەدەمەوە کە ئاخر تازە کێ ئافرەتێکی دەوێت بە سێ منداڵەوە، لەناو ئەم هەموو خەمو خەفەت و نەخۆشییە دەمەوێت ئاسوودە بم، بەڵام ئاسوودە بوون بۆتە ئاوات و لەئێستادا بە شوێنیدا دەگەڕێم.

خەجیج یەکێک بوو لەو ئافرەتانەی کە تووشی سەرەتانی سنگ بوبوو هەردوو مەمکی بڕابوەوە هیچ هیوایەک نەبوو بۆ چارەسەر، دەستی کرد بە گریان و وتی: من منداڵم نییە، بەڵام ئەوەندە بێزارم لەخۆم و لەنەخۆشی کاتێک کاک کامەران باسی خۆی کرد ئەوەندەی تر بێزام دووجار داوام کردووە لە دوکتۆر چالاک کە دەرزییەکم لێ بدات و بمرم و ڕزگارم بێت لەم ژیانە.

سازان کچێکی تری توش بوو بە نەخۆشی سەرەتانی خوێن بوو، کە دوکتۆر چالاک نەشتەرگەری چاندنی مۆخی بۆ کردبوو، لەدوای سەرکەوتن دیسان نەخۆشییەکەی سەری هەڵدابوەوە وتی: من زۆر لەمردن دەترسم، حەز بەژیان دەکەم، هەر ئەوەش وای لێکردووم کە ئارام بوون نازانم چییە و هەمیشە توڕەم و لەچواردەورم بێزارم.

گەڵا: منیش دەچمە ئەو حاڵەتەی ئەو بەڕێزانە باسیان کرد، بەڵام من خۆم سەرقاڵ دەکەم بە زیکر و قورئان خوێندنەوە، هەست بە ئارامی دەکەم، دایکیشم هاوکاریم زۆر دەکات کە بێزار بم بەیەکەوە کێک و کولیچەو شت دروست دەکەین بەهەرحاڵ خۆم سەرقاڵ دەکەم تا زۆر بیر لە نەخۆشییەکەم نەکەمەوە.

ئازار: پێشتر خۆم بە میکیاجەوە سەرقاڵ دەکرد، تا ڕادەیەک باشبووم ئارام دەبوومەوە، بەڵام ئێستا زۆر سترێسم و هیچ ئارامم ناکاتەوە، هەرچەندە من چووم بۆ کڵێسا تا دان بە تاوانەکانمدا بنێم و ئاسوودە بم و خاچم هەڵگرت، بەڵام هیچ چارەسەر نەبوو، بەردەوامم لەنائارامی و زۆرجار وێنە دەکێشم و دەخوێنمەوە، ئەوە تۆزێک هاندەرە بۆ ئارامیم.

نامیق: ببورن هیچ کۆمێنتێکم نییە بەڕێزان، ڕێگای زۆریان باسکرد من شتێکی زیاترم لانییە، لە باری دەروونی نائارامدام.

دلاوەر: هیچم نییە بۆ وتن.

لەسەرەی دلاوەردا کاتی پشوو هات هەموو هەڵساین، منیش چوم بۆ دەستنوێژ گرتن بۆ کاتی نوێژی عەسر، لەوکاتەدا کە دەست نوێژم دەگرت دوکتۆر چالاک هات بۆلام و وتی: هەفتەی داهاتوو واتا ڕۆژی دووشەمەی داهاتوو بەیەکەوە دەچین پشکنینی نوێ بکە، لەبیرت نەچێت؟

ماکوان: بە پشتیوانی خوا ئامادە دەبم، حاجی سەمیر و دلاوەر هاتن تەعاروفمان کرد لەگەڵ حاجی سەمیری کاشی فرۆش، کارگەی کاشی هەبوو، لەدوایدا وتم دلاوەر ئیشت پێمە وا وەستاویت، لەخزمەتام؟

دلاوەر: نا کێشەم هیچ نییە، بەڵام کاک ماکوان یەک پرسیار توخوا بەڕاستی بڵێ تۆ چیت؟

ماکوان: وەڵلا دلاوەر گیان وەکو تۆ بەشەرم، نازانم مەبەستت چییە؟

دلاوەر: کاک ماکوان ئەزانم مرۆڤی، بەڵام ئەو ڕۆژە یەک بەتالیۆن سەلامیان لێ دەکردیت، ئێ تۆ کەسێکی ئاسایی نیت.

دەستم کرد بە پێکەنین و وتم: دلاوەر گیان داوات لێ دەکەم ئەم نهێنییە بپارێزە ئەوانەی ئەو کارەیان ئەنجام دا هەموویان هاوڕێ و برادەری خۆم بوون تەمسیلییەک بوو کردمان بەرانبەر بە خاوەنی ئەو پێشانگایە، هیچی تر نەبوو. من نەسەربازم نە هیچ، خۆشت باش دەزانیت تاقەتی ئەو جۆرە کارانەم نییە.

دلاوەر: دەبەخوا لەو ڕۆژەوە لێت دەترسام وتم ئەمە سەرۆکی وڵاتە و خۆی ئاشکرا ناکات.

ماکوان: کورە دلاوەر گیان من سەرکردایەتی خۆمم پێ ناکرێت، بڕۆ بابڕۆین نوێژەکانمان بکەین.



ئەمجارە باش بوو بوین بەچوار پیاو و کچێک بۆ نویژ، کوڕێکی تر هات لەگەڵمان نوێژی کرد ناوی کاک ڕەفیق بوو، کەسێکی هێمن و لەسەرخۆ بوو، حاجی سەمیرمان پێشخست بۆ پێشنوێژی و من قامەتم خوێند کە تەواو بووین تەعاروفمان کرد لەگەڵ کاک ڕەفیق، ئەویش سەرەتانی مێشکی هەبوو، دەستم کرد بە قسەی خۆش لەگەڵیا وتم منو تۆ بۆ مردن دوانەین.

ڕەفیق: خوای گەورە لێمان خۆش بێت، مردن ئەوەندە گرنگ نییە، کۆڵم پێوە نەگرتووە، ئایەتێکی بۆ خوێندمەوە و فەرمووی: ﴿قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا ...﴿٥١﴾﴾ التوبة.

ماکوان: دەم خۆش خوای گەورە لێمان خۆش بێت.

چووم بۆلای دوکتۆر چالاک داوای ئیزنم لێ کرد تەلەفۆنێک بکەم بۆ دایکم بادڵی لام نەبێت، ئەویش وتی ئاساییە، بەڵام دوایی تەلەفۆنەکەت دابخە.

تەلەفۆنم کرد بۆ دایکم پێم وت کەوا لەگەڵ هەندێک هاوڕێمدام ئەو شوێنەی لێیم شەبەکەی تەلەفۆنی باش نییە، ئەگەر تەلەفۆنەکەم داخرابوو ئاسایی وەریبگرە.

دایکم: ئەو کچە لەدەربەندیخانەوە هاتووە هەواڵی تۆ دەپرسێت، دەڵێت چاوەڕوانی دەکەم تا دێتەوە، پێناچێت ئافرەتێکی تەواو بێت لەڕووی ئەقڵییەوە، هەندێک قسەی کرد لێی تێناگەم دەڵێت وەرەقەی فەحسەکەم بۆ هێناوەتەوە، قسەکانی تێکەڵ و پێکەڵە.

ماکوان: ئەگەر دەزانی بۆ پارە هاتووە، پارەی بەرێ بابڕوات، ئیشی چی هەیە بەمن، من درەنگ دێمەوە ناتوانم هاوڕێکانم بەجێ بهێڵم.

دایکم: خۆت قسەی لەگەڵ بکە بەڵکو قەناعەتی پێ بکەیت.

ویستم بڵێم باشە لەوکاتەدا دوکتۆر چالاک بانگی کردم وتی کاک ماکوان تەلەفۆن تەواو بوو وەرە دەست پێ دەکەینەوە، کە وای وت بە دایکمم وت خۆت چارەسەری بکە، من ناچارم دایبخەمەوە لەکۆبونەوەیەکدام ناتوانم قسە بکەم، ئاگام لێبوو دایکم توڕە بوو، بەڵام من ناچار بووم دایبخەمەوە.

هاتمەوە بۆ ناو مەجلیسەکەو دەست کرایەوە بە قسەکردن، هەریەک لەو بەڕێزانەی تر وتەکانی ئەوانەی پێش خۆیان دووبارە دەکردەوە، هاتە سەر دوکتۆر چالاک کە ئەو قسە بکات هەرچەندە ئەو خەریکی تێبینی نووسین بوو، وتی پێشنیار دەکەم کاک ماکوان قسە بکات بزانین ئەو دەڵێت چی و ئەزموونی خۆیمان بۆ باس بکات، بفەرموون کاک ماکوان.

ماکوان: بەڕاستی باری دەروونی من هیچی کەمتر نییە لە کاک کامەرانو ئەو خوشکە موحتەرەمانەم، بەڵام چارەسەری کاتی زۆر زۆرە کە دەتوانیت وەکو دەرمانی ئازار شکێن بەکاری بهێنین تا خۆمانی پێ بخلافێنین و لانی کەم بە ئیجابی بیربکەینەوە، سەرەتا لە حاڵەتی خۆمەوە دەست پێ دەکەم کە سەخترین حاڵەتی ژیانم ئەوەیە من نازانم لەکوێدا بمرم، خێزان و کچەکەم لە نەرویجن و وا منداڵێکی تر بەڕێگاوەیە نازانم دەیبینم یاخود نا، کەسوکار و دایک و خوشک و براکانم هەموو لەسلێمانین لە ئێستادا نازانم چۆن پێیان بڵێم و چۆن باسی بکەم، من زۆر خەمم هەڵنەگرتووە بە مردنەوە چونکە دەبوو زوتر بمردمایە لە ساڵی ١٩٩١ دەبوو لە ڕاپەڕینەکە بکوژرامایە، ئەوەندە گەمژانەو هەرزەکارانە هەڵمەتم دەبرد، خوای گەورە هێشتمییەوە، دیسان چەند جار هەوڵی خۆکوشتنم داوە بەڵام سەرینەگرتووە، سوپاس بۆ خوا کە بەدەستی خۆم لەناو نەچووم، پاشان ڕێگای چوون بۆ هەندەران، هەمان ئەزموون بوو بۆ مردنم لەوەش دەرباز بووم هاتمە ئەو بڕوایەی کە مردنی من نەبەدەستی نەخۆشی نەبەدەستی هیچ مەخلوقێکە، تاکە بڕیاردەرێک کە دەتوانێت بڕیاری لەسەر بدات خوای میهرەبانە، ئەمەش شتێک نییە من دۆزیبێتمەوە هەموتان کەم و



زۆر ئەوە باش دەزانن تیۆری ماکوان نییە بەڵکو واقیعی ئیسلام و بیروباوەڕمە بە دینی ئیسلام.

ئینجا زانیم مەجلیسەکە هەموو جۆرێکە دەبوو بە گوێرەی ئەقڵی هەمووان قسە بەکەم بۆیە نموونەی فەیلەسوفی گەورەی یۆنانم هێنایەوە (سوقراط) کە سزای مردنی بەسەردادرا هەموو حەزیان دەکرد ڕابکات بواری ڕاکردنیان بۆ ئاسان کرد، بەڵام ئەو وتی من هەر دەمرم بۆچی لێی ڕابکەم بە فەیلەسوفی ژیاو بە فەیلەسوفی مرد، مەبەستم لەوتەکەی سوقراط ئەوەیە کەس نییە لەئێمە نەمرێت، ئیتر بۆچی لێی بترسین، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ...٥٧﴾ العنكبوت کەواتە نەخۆش، ساغ، حەکیم، فەیلەسوف هەموو چین و توێژێک لەناو مرۆڤدا بگرە و هەرچی هەیە لەم بوونەدا دەبێت کۆتایی بێت، حەزرەتی عیسا سەلامی خوای لێ بێت ئەو پێغەمبەرە ئازیزەمان لە ئینجیلی یوحەنا دا دەفەرموێت: ئەو دەنکە گەنمەی کە دەمرێت و دەچێتە ژێر خاک و باش دادەپۆشرێت و سەرلەنوێ زیندوودەبێتەوە، دەیان گەنمی تر بەرهەم دێت، لێرەدا تەفسیری بەندە بۆ ئەم دەقەی ئینجیلی یوحەنا ئەوەیە مادام دەمرین تۆ پێش مردنت چیت هەیە بیبەخشیت بە خەڵکی تا بەرهەمی نوێ بۆ ئەم ژیانە دوای خۆت دروست بکەیت، هەر ناوێکیت و دێیت و دەڕۆیت وەکو ئاژەڵ.

لێرەدا ئەگەر قسەکەی برای بەڕێزم کاک کامەران وەربگرم نابێت ئەو بیرکردنەوەیەی هەبێت بەڵکو ئەو ئەگەر بمرێت کەوتمان مردن و ژیان لای خوای موتەعالە بەرهەمی سێ منداڵە سوپاس بۆ خوا بۆ دڵی خۆش نییە بەوەی کە لە ژیانیدا سێ نەوەی خستۆتەوە بەرهەمیان بهێنێت بۆ کۆمەڵگەیەکی باشتر، چەندین منداڵ بێ باوک پەروەردە بوون، بەڵام دنیا لە ئاستیاندا زۆر قەرزارە، نموونەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێ دایک و باوک و باپیر گەورە بووە و مامی گەورەی کردووە، دەزانیت چ



سەروەرێکی مرۆڤایەتی لێ دەرچووو؟ سەدانی تری وەکو شافیعی و ئیمامی غەزالی ئەمانە کە هەموو ڕێگای مێژوویان گۆڕییوە.

ئەم نەخۆشییەی ئێمە نابێت بەچاوی ئەوە تەماشای بکەین کە بەڵاو موصیبەتی خواییە و دژی من و ئێوەیە، بگرە ڕەحمەتێکی زۆر گەورەیە بۆ مرۆڤایەتی، ئەگەر تەماشا بکەین لەسەر ژیان و نەخۆشی ئێمە وا دکتۆر چالاک لێکۆڵینەوەی زانستی دەچنێتەوە، ئێمە وەکو سەرباز خاوەن شکۆ شەرەفمەندەکانی نیشتمانین کە لە پێناوی خەڵکەکەیدا دەمرن و ناهێڵن دوژمن زەفەر بەرێت بە کۆمەڵگەکە، ڕێک ئێمە ئێستا ئەو سەربازە ونانەین ملیۆنەها سەرباز لە جەنگەکاندا تیاچوون، بەڵام خاوەنی مەبدەء و پرەنسیپ بوون، ئەوە کەی کێشەیە دەبێت بمرین، تۆ بتەوێت و نەتەوێت هەر دەمریت بەڵام گرنگە جێگا پەنجەت دیاری بکەیت، زۆرێک لە مەخلوقاتی خوا ژیانی چەند ڕۆژێکە یان ١ ڕۆژ، یاخود چەند کاتژمیرێکە، بگرە زۆرێک لە مەخلوقات ژیانی خولەکێکە یان کەمتر لە خولەکێک، بەڵام دێن و فەرمانەکەی خۆی جێبەجێ دەکات و دەڕوات، من و تۆش دەبێت بزانین ئەرکەکەمان بەجێهێناوە و دەڕۆین بۆ ژیانێکی تر، کە ژیانی هەتاهەتاییە کەواتە بەڕاستی ئەوە مردن نییە لێی دەترسین، بەڵکو شتێکی تر هەیە لەناخماندا یەکلانەبۆتەوە لێی دەترسین.

دوو جۆر مرۆڤ هەن جۆرێکیان لە مردن دەترسن چونکە هیچ لەبارەیەوە نازانێت، جۆری دووەمیان ئەوەیە کە دەزانێت مردن چییەو بۆچی هاتوەو بۆکوێ دەڕوات، ئەگەر جۆری یەکەم وەربگرین ترس هەموو سات و وەختێکیان داگیر دەکات، ڕاستی ترسە کە مرۆڤ نائارام دەکات، ترسە هەموو چرکە ساتێک دەتکوژێت، مەرگ یەکجارە بەڵام ئەگەر چارەسەری ترس نەکەیت ئەوا هەموو کاتەکانت لێ دەکات بە مەرگەسات.

خۆی لەڕاستیدا ترس عەیب نییە، ترس باشە بەڵام بە ئەندازەی خۆی ئەمەش پێویستی بە وەرزش هەیە، هەروەکو چۆن کەسێک لە تاریکی دەترسێت تا وردە وردە خۆی دەچێتە تاریکی و ترسەکەی دەشکێت، مەرگ



وایە ترس لێشکاندنی بە دڵنیایی بوونتە لەوەی کە دەڕۆیت بۆلای چییە، ئەمە خاڵی گرنگ و دەستپێکە، کەواتە چارەسەری ترس لەمەرگ ئەوەیە بزانیت بۆچی هاتویت، بۆ کوی دەڕۆیت، نێوانی هاتوچۆکەت زانی ئەوا ترس نامێنێت، خەفەت دەست پێ دەکات، قۆناغێکی زۆر گرنگە لە ژیان کە مرۆڤ پێی بکات شکاندنی تر بۆ خەمم وخەفەت.

ئەگەر نموونەی خوشکی ئازیزم گەڵا وەربگرین هەست دەکەین ئەو ترسی نییە، بەڵام خەم و خەفەتی هەیە، گەڵا لەمردن ناترسێت، بەگوێرەی قسەکانی کە من لێی تێگەیشتم بەڵکو خەمی هەیە، ئەم خەمەش زۆر زوو چارەسەری دەکات بەیادی خوای پەروەردگار دەزانێت هەموو شتێک بەدەستی زاتی موبارەکیەتی.

دێمەوە بۆلای ئازار خانمی خوشکم ئەو لەنێوانی کامەران و گەڵا دایە، نازانێت بەکام لادا بشکێتەوە، هەرچەندە من بۆم نییە بڕۆمە ناو وردەکاری، بەڵام بۆ ئەوەی لە کۆتایی ڕای خۆم بڵێم، کەواتە دوو ڕیانەکەی ئازار زۆر باشترە لە تاریکیەکەی کاک کامەرانی برام، گەڵا لەهەردوکیان باشترە.

کورت و پوخت دەبێت وابەستە بیت بە مەبدەئێکەوە، تابتوانیت هێز و وزەی زۆرت پێ ببەخشێت، لێرەدا خودی مەبدەئەکە قسەوباسی لەسەر دەکرێت کە چییە، جا من هەست دەکەم کاتم زۆر گرت بۆ ئەوەی ئەو بەڕێزانەی تریش ڕاوبۆچونی خۆیان بڵێن، من درێژدادڕی ناکەم و پاشان قسەوباسی زیاتر دەکەم.

بۆیە وام وت ترسام کە ئادەبوانم بێزار کردبێت ویستم بزانم تاچەند گوێگری قسەکانمن، هەمو وتیان بەردەوام بە، حاجی سەمیر سەرەی خۆی دامێ، هەموو ئافرەتەکان خۆشحاڵ بوون کامەرانیش زۆر خۆشحاڵ بوو، دوکتۆر چالاک فریای من نەدەکەوت بۆ نووسین، چیم دەوت دەینووسی، نازانم بۆچی بوو؟



د. چالاک: من زۆرم لا گرنگە ترس و خەم لێک جیاکرایەوە لەم دانیشتنەدا دوو شتی زۆر گرنگ بوو بۆم، تکایە بەڕێزان من زۆر حەز دەکەم کاک ماکوان زیاتر قسەمان بۆ بکات، بڕوا بکەن سوودی زۆری هەیە وتەکانی، من دەمەوێت بپرسم لە کاک ماکوان، ئەو لەکام حاڵەتدایە؟ حاڵەتی ترس یان خەم و خەفەت؟

ماکوان: ڕاستی بۆ نەخۆشییەکەم لە هیچ حاڵەتێکیاندا نیم، چونکە نە ترسم هەیە نە خەفەت، بەڵکو بڕیارم بۆ نادرێت لە نێوان ئەوروپا و ئێرەدا لە کامیان بمرم.

د. چالاک: واتا نە ترس نە خەم هیچیانت نییە؟

ماکوان: نا؛ مرۆڤ نیم ئەگەر بڵێم ترس و خەمم نییە، خۆ ڕۆبۆت نیم، بەڵام بەو ئەندازەیەی کە لە نەخۆشییەکەمدا ترس و خەفەت کۆت و زنجیری کردبم، ڕۆژی یەکەم زۆر ناڕەحەت بووم، بەڵام ڕۆژانی تر لێرەدا جێگای باس نییە بیکەم، تووشی کێشەی وابووم کە مەرگ بەپارە بوایە دەمکڕی، بەڵام نەدەهات. بەهەرحاڵ من کۆنتراکتێکم لەگەڵ خوای خۆم بەستووە، لەبەر ئەوەی خاوەنی ئەو کۆنتراکتەم نە ترسم لە مردن هەیە نەخەمیش دەخۆم بۆ مردن، ئەمە وەڵامی پرسیارەکە لەبەرئەوەی خاوەنی ئەم کۆنتراکتەم، خەم و ترسم نەما کێی تر دەیەوێت دەتوانێت وەکو منی لێبێت، من لە ئیسلامم وەرگرتووە شتێکە شاراوە نییە.

د. چالاک: کێ قسەی هەیە با بفەرمووێت.

کامەران: پرسیارێکم هەیە بۆ کاک ماکوان من چۆن بتوانم ئەو باوەڕەی تۆم بۆ دروست بێت؟

ماکوان: بەڕۆژێک و مانگێک نابێت، بەڵکو کاتی پێویستە، بەڵام ڕێگایەکی خێرا هەیە، نازانم تاچەند سەرکەوتوو دەبیت تێیدا، ئەویش ئەوەیە من دەپرسم تۆ ئەو بڕوایەی منت نییە، حەتمەن دەڵێت کۆمەڵێک پرسیار یاخود شتی تر لە مێشکمدا هەیە، نەگەیشتومەتە وەڵام یان

قەناعەت، ئەگەر ئەم گریمانە بوو لە بەهێزترین گریمانە، ئەوا دەبێت کەسێک هەبێت وەڵامەکانت بەخێرایی بداتەوە تا خێرایی بڕوات بۆ دروست بێت، یان دەبێت خۆت هەوڵ بدەیت بەخوێندنەوەو پرسیارکردنی زۆر لە زانا و دانشمەند و بیرمەندەکان.

خەجیج: ئەی کاک ماکوان تۆ بۆ هاوکارمان نابیت ئەوەی ئەزموونی خۆتە بۆ ئێمە بگوازرێتەوە.

ماکوان: دەی خۆ خەجیج خانی بەڕێز درێغیم نەکردووە لە هەموتان زیاتر قسەم کردوە هەموو دەستیان کرد بە پێکەنین.

ئازار: کاک ماکوان جەنابت باسی پرنسیپی خۆشەویستیت کرد.

یەکەم جار کە هاتیتە ناو گروپەکە، ئەمڕۆ بەلای وشەی خۆشەویستی دا نەڕۆشتی

ماکوان: باسەکە باسی نائارامی دەروونی بوو، بۆیە دەرفەت نەبوو باسی خۆشەویستی بکەم، دەنا هەرچی پرس هەیە بەم ژیانەوە پەیوەستە بە خۆشەویستی بۆ زانیاریت ئازار خان، هەر وشەی خۆشم دەوێت ئارامی دەبەخشێت مەگەر وانییە؟

ئازار خان: بەدڵنیاییەوە وایە، بەڵام نازانم خۆشەویستی تۆ چییە وا ئەو هەموو هێز و توانایەت پێ دەبەخشێت.

ماکوان: من حەز دەکەم پرسیارێک بکەم لە هەموتان تکایە هاوکارم بن بۆ وەڵام دانەوەی (وشەی خۆشم دەوێت) بۆ تەفسیر بکەن واتای چییە؟

زۆرێک لە بەڕێزان وتیان خۆشم دەوێت واتا خۆشم دەوێت، ئەمە وەڵامەکە بوو هەندێکی تریان بێ دەنگ بوون، هەندێکیان زۆریان کرد لە خۆم کە وەڵام بدەمەوە لەوانەیە دوکتۆر چالاک، ئەوەندە پەلەی بوو بۆ وەڵامی پرسیاری (خۆشم دەوێت) واتای چییە؟ بنێشتی لەدەم دابوو قاچی

دەلەرزی، جوینی بنێشتەکەی و لەرزینی قاچی بۆی دەرخستم کە سترێسە بۆ وەڵامەکە، منیش بۆ خۆشی وتم کات درەنگە دەبێت بڕۆم.

هەموو وتیان وەڵامەکەمان دەوێت...

ماکوان: وشەی (خۆشم دەوێیت) بە هەرکەسێک دەڵێیت ئەگەر ڕاستگۆ بیت لەگەڵ خۆت و وشەکەدا بەواتای (ئامادەم هەموو شتێکت پێ دەبەخشم بەڵام چاوەڕوانی هیچ نیم لە تۆ)

من کە دەڵێم خۆشەویستی واتاکەی خوای پەروەردگارە، هیچ کەس ناتوانێت ئاوی دەریا لەگەڵ خودی دەریا جیا بکاتەوە.

هیچ کەس ناتوانێت خۆشەویستی لەناوی خوای پەروەردگار جیا بکاتەوە، وشەکە ڕێک واتای خودی خۆی هەموو شتێک دەبەخشێت، چاوەڕوانی وەرگرتن نییە و هەموو شتێک سەرچاوەکەی خوای پەروەردگارە، کە دەڵێم شتێک واتا هەموو دروستکراوەکانی.

کەواتە باوەڕو هێز و وزەی من سەرچاوەکەی خوای پەروەردگارە.

ئەنوەر: ئەی ئەوە نییە خوا دەڵێت نوێژم بۆ بکەن، چۆن پێویستی پێنییە؟

ماکوان: لەڕاستی نوێژ بۆ پێداویستی خوا نییە، چونکە ئەگەر خوا پێویستی بە نوێژ و ڕۆژوو زەکات...هتد بوایە لەبەهەشت دەمانکرد، لە بەهەشت کە هەتا هەتاییە بەندایەتی ناکەین بەواتای نوێژ و ڕۆژ و زەکاتو حەج. بەڕاستی کاک ئەنوەر ئەو کردارانە کە داوامان لێ کراوە یان بەندایەتییەکان بەگشتی بۆ پەیوەندی ڕۆحییە لەگەڵ ئەو هێزەیە کە ئازار خان دەیەوێت بزانێت ماکوان چۆن بەدەستی دەهێنێت، من ئەو هێزەم لەنوێژ و بەخشین و یادی خوای پەروەردگارم وەرگرتووە، ڕوونە؟

وەڵام نەبوو...

بەردەوام بوومەوە لە قسەکردن و وتم: خوای گەورە دەبەخشێت، چاوەڕوانی ئەوەنییە ئەم گەردوونەی دروست کردووە بە هەموو زیندەوەرەکانی و پێویستی بە نوێژی من و کاک ئەنوەر بێت، هەر ئەو نوێژە پەیوەندی بە خۆشەویستی من وەکو مرۆڤ زیاد دەکات بەخوای پەروەردگارەوە.

کامەران: دەمەوێت بکەم بە خوا چونکە دەزانم هێزو توانای زۆرم پێ دەبەخشێت، بەڵام ڕێگاکەم بۆ نادۆزرێتەوە، پێویستە هاوکارم هەبێت.

ماکوان: زۆر گرنگە ناسینی خوا بڕوا بکە کە ناسیت و زانیت خوای پەروەردگار بەحەق ئەوەی لێت دەسێنێتەوە، ئەوە مانای بەخشینی تەواوە، چونکە خوای پەروەردگار دایکی دروست کردووە بۆ منداڵەکەی کە چەندە بە بەزەیی و بەڕەحمە پێمان دەڵێت من دروستکەری دایکەکە و منداڵەکە و خودی ڕواندنی ڕەحم و بەزەییەکە هەموو زاتی پەروەردگارە، داخۆ ئەو زاتە چ میهرەبان و خۆشویستیەک دەبەخشێت.

ئاراز: کاک ماکوان بەڕاستی قسەکانت ئارامم دەکاتەوە.

کامەران: زۆر ڕاستە منیش هەست بە ئارامی دەکەم.

ماکوان: سوپاس بۆ خوا، خوای پەروەردگار ڕەحمەت و بەزەیی بڕژێنێت بەسەر ئیمانداران و هیدایەت و ڕێنمونیمان بکات بە گشتی، آمین.

ئەگەر سەرنج بدەن زۆرینەی زانایان کە یەکەم پەرداخی زانستی هەڵئەدەن و دەیخۆنەوە، ڕاستەوخۆ بانگەشەی مولحید بوون دەکەن، بەڵام لەکۆتایی تێربوونیان لە پەرداخەکە خوای پەروەردگار چاوەڕوانیانە و هەموو ئیعتراف بەزاتی پاکی دەکەن، ئەو زانایانە دەگەنە ئەو ئەنجامە کە بە عیشقەوە کارەکەیان ئەنجام ئەدەن خۆشەویستیان بۆ کارەکەیان هەیە لەکۆتایی خوای موتەعال هاوکاریان دەکات.

ئەمە بگوازەرەوە بۆ کەسێکی سادە و دوور لەزانست، چاکبوو خۆشەویستی لەدڵ و دەروونداا هەبوو کۆتاییەکەی گەیشتنە بە وەصلی

خوای پەروەردگار و پتەوترین پەیوەندی دروست دەبێت بۆیان، ئەوەشی کە خوای نییە بڕوا بکەن خۆشەویستی لە دڵیدا نییە، هەموو خاک و شەرەف و مەبدەئی دەفرۆشێت بۆ پێکێکی شەوی.

خۆشەویستی خوا سەما دەکات و خۆی دەلەنگێنێت، ڕاستە من بڕوام پێی نییە، بەڵام هەموتان دیوتانە کە چۆن سەما دەکات تا خوای لێ ڕازی بێت، تەنانەت ئایینی نەصرانی خاوەنی هیچ شەریعەتێک نییە، لە جولەکە شەریعەت وەردەگرێت، بەڵام بۆ دینەکەیان لە جولەکە بەهێزترە. هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خۆشەویستی بە کورتی و پوختی خۆشەویستی ترس لادەبات و خەم لادەبات، ئەگەر بڵێم موعجیزە دروست دەکات زیادەڕۆیم نەکردووە، تەواو ئیتر من قسە ناکەم با سەرەی ئێوەش بێت، بەڵام پێشنیار دەکەم بۆ دوکتۆر چالاک کەوا لە دانیشتنەکانی داهاتوودا با کەسێکی دەروونناسیشمان لەگەڵ بێت کە زیاتر دەتوانێت هاوکار بێت لەلایەنی دەروونیەوە ڕێنمایی هەمووومان بکات و دەتوانێت زیاتر لێکۆڵینەوەکەی ئێوەش بەرەو پێش بەرێت و فراوانتری بکات، چونکە دانیشتنی لەم شێوازانە خۆتان ئاگادارن کە لە ئەوروپا ئەنجام دەدرێت هەمیشە دروونناس ئامادەیە، ڕاستە جەنابتان درێغیتان نەکردووە، بەڵام ئێوە تایبەتمەندیتان لایەنی دەروونی نییە و ناتوانن وەڵامی هەموو پرسیارە دەروونیەکان بدەنەوە، ئەوە پێشنیاری منە هیوادارم بەهەند وەربگیرێت.

کامەران: خۆزگە دەگەیشتم بەوەی کەتۆ پێیگەیشتوویت.

سازان: بەڕاستی من زۆر پێویستم بە کاک ماکوانە، دەبێت زیاتر هاوکاریمان بکات، کەسێک نییە فێرمان بکات من هێشا بەم وەزعەوە دەبوو مەزەی مەشروب بۆ هاوسەرەکەم دروست بکەم تاوەکو وازی لێ نەهێنابووم، پێشنیارەکەیشتم زۆر بە دڵە، هیوادارم دوکتۆر بیرێکی لێبکاتەوە.

کە سازان وای وت زۆرم پێناخۆش بوو.



ڕەفیق: کاک ماکوان من زۆر ئاسوودەم بە قسەکانت تکایە بەردەوام بە.

دلاوەر و گەڵا و حاجی سەمیر و خودی دوکتۆر داوایان کرد بەردەوام بم لە قسە کردن، هەروەها دوکتۆر چالاک وتی کە بیرێک لە پێشنیارەکەت دەکەمەوە و شتێکی باشە کە دەروونناسێک بتوانێت هاوکاریمان بکات.

ماکوان: سوپاسی هەموو لایەک دەکەم تکا دەکەم ئێوەش هاوکاریم بکەن ڕەخنەو پێشنیارتان هەبێت بۆ قسەکانم لەگەڵمدا ئاوێتە بن تکایە.

کامەران: کاک ماکوان ئەگەر پرسیارێک بکەم ئاسایی وەریبگرە، بۆ ئەو خوایە نابینین و کۆتایی بەهەموو کێشەیەک بێت؟

ماکوان: کاک کامەران بینینی خوا بۆ ئێمە ئاسانە ئەگەر بەچاوی ئەقڵ و لێبوردنەوە لێی بڕوانین خوای پەروەردگار ئەو تیشکەیە کە بەرچاومانی ڕووناک کردۆتەوە، واتا خوای گەورە نورە ئەو نورەیە کە دروستکراوەکانی دەبینن، واتا ئەسڵی نورەکەیە کە چاومان شتەکانی تر دەبینیت، نازانم ڕوونە؟

کامەران: زۆر نا.

ماکوان: ئیمان بوون بە خوا وەکو بڕوا بوون وایە بە ڕووناکی،خودی ڕووناکییەکە نابینین، بەڵام بەهاوکاری ڕووناکییەکە هەموو شتەکانی تر دەبینین، پاشان کە خوا بینرا ئیتر شتێک نامێنێت بەناوی ئیمان، ڕوون بوو؟

کامەران: زۆر ڕوونە دەست خۆش.

ماکوان: خوای پەروەردگار سەرچاوەی چارەسەری هەرچی دەردە لەدڵ و دروون و لاشەن هەر زاتی بەرزی شیفایە داوای لێ بکەین، زۆر ئاسانە بەخشین پێمان.

ئەنوەر: کاک ماکوان بۆ داوای لێ ناکەیت جەنابت کە چاکت بکاتەوە کە ئەوەندە پەیوەندیت لەگەڵیدا باشە.



ماکوان بەپێکەنینەوە: کاک ئەنوەر پێدەچێت کێشەت لەگەڵ خوادا هەبێت؟

من شەووڕۆژ و هەموو چرکەو ساتەکان لەخوای پەروەردگار دەپاڕێمەوە و داوای لێ دەکەم، داوا کردن لەغیری خوای گەورە سەرشۆڕییە، دەزانم خوای گەورە باشترینی بۆ داناوم کاک ئەنوەری بەڕێز، لەوانەیە ئەوەی من و تۆ پێمان خۆشە بەدەستی بهێنیت، بەڵام زیان و سەرشۆڕیمان تووش دەکات. پێچەوانەکەشی ئەوەیە کە ئەوەی حەزی پێناکەین باشترینە، زۆر جار خوای گەورە تووشی ئازارمان دەکات بۆ ئەوەی بانگی بکەین حەز دەکات گوێی لە دەنگمان بێت بەهانامانەوە بێت.

ئەنوەر: ئەی بۆ بەهانامانەوە نایەت؟

ماکوان: دە داوای لێبکە تۆ شەڕی لەگەڵ دەکەیت، هەوڵ بدە خۆت ئاشت بکەرەوە لەگەڵی بە یەک وشە بڵێ (استغفر الله) و تەوبە بکە، کێ ناڵێت لەهەموومان زیاتر نایەت بە دەم تۆوە، ئەو چاوەڕێمانە بەڵام ئێمە لوت بەرزین و نامانەوێت بگەڕێینەوە بۆ لای ئەوەی دروستی کردووین.

ئەنوەر: کاکە ببورن من دەڕۆم ئێرە بووە بە مزگەوت کاک ماکوان خوطبەی جومعە دەدات، من هاتووم چارەسەر وەربگرم نەهاتووم بۆ مزگەوت، مزگەوت زۆرە بۆی بڕۆم ئەگەر ئارەزووم لێی بێت پێویست ناکات ئەو هەموو ڕێگایە ببڕم بێم بۆ ئێرە.

هەڵسا بڕوات...

کامەران: کاک ئەنوەر گیان کاک ماکوان قسەی هەڵەی نەکردووە برا بۆ وا توڕە بوویت؟

ئازار: سەیرە کاک ئەنوەر قسەکانی کاک ماکوان بەشێکی گەورەیە لە چارەسەر، تۆ لەبیرتە من پێم وتی پەنام بۆ کڵێسام بردووە دەست خۆشیت لێکردم؟ کاک ماکوان باسی هێز و پاوەرێک دەکات کە هەموومان بە شوێنیدا دەگەڕێین.

ئەنوەر: لەگەڵ ڕێزم بۆ ئێوە بەڵام کاک ماکوان ئایدۆلۆژیای خۆی بڵاو دەکاتەوە، سو ئیستیفادە لەوەزعی ئێمە دەکات.

ڕەفیق: کاتێک جەنابت باسی یۆگات بۆ دەکردین ئێمە وتمان تۆ ئایدۆلژیای خۆت بڵاودەکەیتەوە؟ باسی بوزا و زەردەشتت بۆ دەکردین، ڕێزمان گرتیت، کاک ماکوان باسی ئەزموونی خۆی دەکات تۆ ئەگەر باشترت لایە فەرموو قسەمان بۆ بکە.

دلاوەر لێی تورەبوو وتی: تۆ خۆت بێدینی بۆ خەڵکی تریش وەکو خۆت سەرگەردان دەکەیت.

ئەنوەر: کاکە ئێوە هەموو جەماعەتی ماکوانن، دلاوەر تۆ دەمت باش چەور کراوە حەقی خۆتە دیفاعی لێ بکەیت.

سازان: وەڵڵا کاک ئەنوەر ناحەقی دەکەیت، هەست دەکەم لەم کاتەدا ئەوەی نەدەویست کە جەنابت دانیشتنەکەت لێ تێکداین.

ئەنوەر: باشە ئێوە دابنیشن من دەڕۆم، من ناتوانم گوێ بۆ باسی ئەفسانە بگرم، وا من دەڕۆم کاتێکی خۆش.

دانم بەخۆمدا گرت هیچم نەوت، هەرگیز ئەوەندە ئارامگر نەبووم، بانگم کرد کاک ئەنوەر منیش دەبێت بڕۆم سەیارەم پێ نییە دەکرێت بمگەیەنیت؟ خۆ تۆ لەقسەکانم عاجز بووی نەک خۆم، برا من ڕێزت دەگرم نەک لەبەر ئەوەی بڕوات بە قسەکانم نییە، لەبەر ئەوەی نەخۆشی، ئەزانم باری دەروونی کەسمان باش نییە، پەلە مەکە با منیش لەگەڵت بێم، لە ڕێگا دوو قۆڵی گۆرانی دەڵێین باشە؟

د. چالاک: کاک ئەنوەر تکایە دابنیشە تا ئێستا کەس دانیشتنی تێک نەداوە، هیواخوازم تۆ ئەو کەسە نەبیت، بۆیە تکایە فەرموو لە جێگای خۆت دابنیشە.






ئەنوەر هاتەوە ناو مەجلیسەکە وتی من داوای لێبوردن دەکەم فەرموون قسەکانتان تەواو بکەن، من تەنها گوێگر دەبم.

د. چالاک: ڕاستی تۆ کاک دلاوەرت بریندار کرد پێویستە داوای لێبووردنی لێبکەیت، خۆ ئەگەر نەیکەیت ئەوا من ئیعتیزاری بۆ دەهێنمەوە.

ئەنوەر: تۆ ئازادی کاک دوکتۆر، بەڵام داوای لێبوردن لە کەس ناکەم.

دلاوەر: کاک دوکتۆر سوپاس بۆ هەڵوێستی جەنابت، کاک ماکوان بۆ من برا و باوک و هەموو کەسمە، خەڵکی چی دەڵێن بۆ من گرنگ نییە قسەکانیان لەلام هیچ ئەرزشێکی نییە.

خەجیج: من زۆر ڕێزی کاک ئەنوەرم لابوو، بەڵام بەداخەوە نازانم بۆ وای کرد.

ئەنوەر: ئەوە نییە دانیشتووم لە لاتاندا قسەیەک بوو کرا، من ناتوانم لە مەجلیسی ئایینیدا بم چونکە بڕوام پێی نییە.

ماکوان: بەڕێزان نا حەقی کاک ئەنوەر مەگرن، من درکی پێ دەکەم چونکە خۆم لەو حاڵەتەدا ژیاوم، کە لە مەجلیسێکدا توانای قسە کردنم نەبوو ئیتر وەکو میکافیلی دەڵێت ئەگەر شۆڕشت پێ نەکرا دەوڵەتی بەرانبەر تێک بدە، ئێمە هەموو لەسەر باسێک ڕێکەوتووین بە مەبدەئی دیموکراسیش بێت دەبێت ڕێزی زۆرینە بگیرێت، کاک ئەنوەر وەکو مرۆڤ هیچ خەتایەکیی نییە، ساڵەهای ساڵە دژی دینە، ئێ تازە چۆن لە کۆتایی تەمەنی واز لە مەبدەئەکەی دێنێت، بەڵام وشەی (ببورە، هەڵەبووم، نەم زانی، توڕە بووم، حەق لای تێوەیە)...هتد ئەگەر ئەمە لەفەرهەنگماندا هەبێت دڵنیا بن چارەسەر دەبین، بۆ جەنابی دوکتۆر چالاک.

د. چالاک: فەرموو کاک ماکوان.



ماکوان: من شارەزا نیم لەبواری پزیشکی بەڵام پرسیارێکم هەیە بۆ بەڕێزت، وشە کاریگەری لە چارەسەری نەخۆشیدا هەیە؟

د. چالاک: باش تێنەگەیشتم ئەگەر پرسیارەکە ڕوونتر بکەیتەوە لەوانەیە بتوانم وەڵام بدەمەوە.

ماکوان: ببورە جەنابی دوکتۆر، پرسیارەکە بە شێوەیکی تر بکەم، من چیرۆکێک باس دەکەم خورافییە وەکو کاک ئەنوەر دەڵێت ئەفسانەیە.

جارێک بازرگانێکی زۆر دەوڵەمەند دوکتۆرێکی زۆر شارەزا بانگ دەکات، بۆ چارەسەری کچە تاقانەکەی کە تووشی نەخۆشی بووە، لەهەمان کاتدا پیاوێکی بەساڵاچووی خواناسی وەکو من لە مەجلیسەکەدا دەبێت، لەهەمان کاتدا حەکیمەکە خەریکی پشکنینی کچەکەیە، پیاوە خواناسە پیرە بەساڵاچووەکە بە بازرگانەکە دەڵێت ئەتوانم قورئان بخوێنم بەسەر کچەکەتدا تا شیفای بۆ بێت لەلایەن خواوە، داوا لەخوای پەروەردگار دەکەم کە چاکی بکاتەوە بە وشە پیرۆزەکانی.

پزیشکەکە توڕە دەبێت و دەڵێت ئەوە تۆ شێتی ئەوە کەی قسەی لۆژیکە، زانست پێشکەوتووە بە دەرمان و چارەسەری پزیشکی چارەسەری دەکەین.

پیاوە خواناسەکەش دەڵێت ئاخر گەمژەی نەزانی جاهیل و هیچ لەباردا نەبوو تۆ چی دەزانیت لەبارەی شیفای خوای گەورە و وشەکانییەوە.

پزیشەکەکە ئەوەندەی تر توڕە دەبێت و بەسەر پیاوە خواناسەکەی هاوار دەکات وەکو مندا و دەڵێت: ئەوە کەی شێوە و ئوسلوبی قسە کردنە دەیکەیت پڕ بەدەنگی هاواری بەسەردا دەکات.

پیاوە خواناسەکە هێمن دەبێتەوە و دەڵێت: ببورە لەوەی کە پێم وتی گەمژەی نەزانی جاهیل، بەم وشە سادانەی من تۆ توڕە بوویت و دەموچاوت یا بەیەکدا و سور هەڵگەڕایت و دڵت بە پەلە لێیدەدا کە هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ توڕە بوونەکەت، ئەو توڕە بوونەشت بووە

هۆکاری بەرزبوونەوەی ڕێژەی هۆرمۆنی ئەدرەنالین و فشاری خوێنت بەرز بویەوە بەهۆکاری زۆر لێدانی دڵ و خێرا کارکردنی ترومپای خوێن هێنەرو خوێنبەرەوە، بەو وشەیەی من ئەوەندە کاریگەری هەبوو لەسەرت دەبێت وشەی خوای پەروەردگار چ کاریگەرییەک دروست بکات. ئەمە پرسیارەکەیە و دووبارەی دەکەمەوە کە ئایا وشە کاریگەری هەیە لەسەر نەخۆشی و چارەسەری؟

د. چالاک: قسەکەت زۆر تەواوە بە دڵنیاییەوە کاریگەری هەیە.

ماکوان: برایانی خۆم بەتایبەت ئەنوەر بەهای مرۆڤ زۆر بەنرخە، نرخەکەی پارە نییە بەڵکو مەبدەئو پرەنسیپی ژیانی بەهاو نرخی دیاری دەکات، بۆیە مرۆڤ چی پێ بێت ئەوە خەرج دەکات، ئەمەش قسەی سەروەرمان پێغەمبەر عیسای کوڕی مەریەمە کە شاعیری گەورەی فارس عەطار دەڵێت: جارێک عیسا لەگەڵ قوتابیەکانی ڕێیدەکرد و حیکمەتی فێر دەکردن، لەپڕ لەسەر ڕێگاکەیاندا کۆمەڵێک لە جولەکە بە عیسایان وت: تۆ کەسێکی کە بێ باوک لەدایک بوویت بەواتای جنێوی زۆر ناشرین زۆر قسەی ناشرینی پێوترا، بەڵام لە وەڵامدا ئەو چووە لایان و پێی وتن ئێوە هەموو کەسی باش و بەڕێز و خانەدانن.

قوتابییەکانی وتیان مامۆستا (مەبەست عیسا)یە بۆ وا لەگەڵیان قسەت کرد خۆ ئەوان جنێو و تانەو تەشەریان دا، فەرمووی مرۆڤ هەرچی پێبوو ئەوە خەرج دەکات، منیش ئەوەم پێبوو بۆ ئەوانم خەرج کرد.

کاک ئەنوەری بەڕێز بۆ من گرنگ نییە، جەنابت لێرە دەڕۆیت یان دادەنیشیت، لەکۆتاییدا هەموومان لەیەک بەلەم داین یاخود کەشتی، گرنگە بۆ من کە ئەم بەڕێزانە لە دوای مردنیان سەرگەردان نەبن،. ئەرکی سەرشانمە تا دوا هەناسەم خەڵکی ئاشنا بکەم بە خواو پێغەمبەر و قیامەت، کاکی خۆم بۆ داوای لێبوردن لە کاک دلاوەر ناکەیت و دانیشتنەکەت تێک داو فشاری خوێنی خۆت و ئەو بەڕێزانەت بەرز کردەوە هیچ سوودی نەبوو من دەمتوانی وەڵامت بدەمەوە وەکو خۆت

باش ئەتناسم، تۆ ئەنوەری ڕابە منصوری، یەکێک بووی لە کەسە چالاکەکانی شوراکانی ناو شار دوایی بویتە کۆمەنیستی کاریگەری، چەند جار لەپاڵتاڵک قسەوباسمان کردووە من ئەتناسمەوە بە دیموکراسی قسەت دەست پێ دەکرد و بەخوشکو دایکمان کۆتاییت پێدەهێنا، خۆت باش دەزانی دەتوانم هەموو شتێکت لەگەڵ بکەم، بەڵام لەبەر ئەوەی نەخۆشی وەکو خۆم بەزەیم پیاتا دێتەوە.

ئەنوەر: جا چیت لەدەست دێت درێغی مەکە، بەڵێ من ئەنوەری ڕابەم و شاهین ٢٦ی پاڵتاڵکم، تۆش ماکوان ٣ی دەزانم، هەڵسا لەسەر کورسییەکەی بۆ شەڕ.

ماکوان: کە ئەو هەڵساوە منیش هەڵسام و دەستم پێی نەگەیشت، کاک ڕەفیق خستی بە زەویدا، هاتوو هاوار و قیژەی ئافرەتەکان دروست بوو، ئەنوەر کەوت خۆم چووم هەڵمساند و خستمە پشتی خۆم، دلاوەریش خۆی حازر کردبوو لێی بدات، ناچار وام لێهات من دەمپاراست ئەویش لەپشتی من نەدەبووەوە، تا بە حاجی سەمیرم وت ڕەفیق و دلاوەر بەرێتەوە بۆ سلێمانی.

ئەو سیانە ڕۆشتن باش بوو ڕەوشەکەمان هێور کردەوە من و کامەران و دوکتۆر چالاک، کە ئەوان ڕۆشتن ئەنوەر زۆر جنێوی دا، گەڵاش بۆ پارێزگاری لە دلاوەری دەستگیرانی وەڵامی داوە، ئەنوەر قسەیەکی زۆر ناشرینی بە گەڵا وت منیش پەلامارم دا دوکتۆر چالاک و کامەران منیان گرت، نەیانهێشت لێی بدەم.

جەخیج: کاک ئەنوەر زۆر بەداخەوەم خۆ تۆ باسی مافی ئافرەت و ڕێزی ئافرەتت بۆ من دەکرد، کوا ڕێز و حورمەتت بەڕاستی لای من هیچ ڕێزێکت نەما، تۆ زۆر لەوە بێ ئەرزش تری جارێکی تر قسەت لەگەڵ بکەم.

ماکوان: پێش ئەوەی بمری لێرەدا نا بەڵام لەم ساتەوە لە هەر جێگایەکدا بتگرم قاچ و دەستێکت دەشکێنم، ناڵێم دەتکوژم چونکە تۆ خۆت مردوویت، بڕۆیتە ناو گۆڕیش دەرت دەهێنم و قاچ و دەستێکت دەشکێنم، لەسەر خۆم نا لەسەر گەڵای خوشکم، ئەوە منو تۆو ڕۆژگار.

ئێوارەیەکی خۆش بۆ هەمو لایەک.

کەوام وت هاتمە دەرەوەی باخەکە بەپێ کەوتمە ڕێ تەلەفۆنەکەم دەرهێنا تەلەفۆن بۆ نەبەز بکەم بێت بە شوێنما خەریکی کردنەوەی تەلەفۆنەکە بووم لایتی سەیارەیەک لێیدام لەلامدا وەستا ئازار بوو.

ماکوان: ئازار گیان خوشکی خۆم ئەو کابرایە زۆر بێ ڕێزە توانام نییە، بەڵام تۆ گەڵا بەرەوە بۆ ماڵی باوکی تکایە.

ئازار: توخوا کاک ماکوان قسەم مەشکێنە با نەڵێن ماکوان بەقسەی ئافرەتێکی نەکرد وەرە لەگەڵمادا زۆر مەمنونت دەبم.

ماکوان: باشە دێمەوە، بەڵام دانابەزم گەڵا بهێنە با بڕۆین، لەم قسانەدا بووم دوکتۆر چالاک و کامەران هاتن داوایان زۆر کرد کە بگەڕێمەوە ئەنوەر زۆر پەشیمانە.

ماکوان: ئێوە بڕۆن من لەگەڵ ئازاردا دێمەوە.

هەرچەندە زۆر دوور نەکەوتبوومەوە لە باخەکە بەڵام ڕێگای سەیارە و ڕێگای پێ جیابوو لە ڕێگای پێوە من هاتمە دەرەوە و پاشان گەڕامەوە، دوکتۆر چالاک وتی: دابەزە!

ماکوان: بۆچی دابەزم من قسەی خۆمم کرد جا بزانم کێ دەتوانێت قسەی خۆی بەرێتە سەر.

دوکتۆر چالاک و کامەران: هەردووکیان وتیان زۆر مەمنون دەبین بێیتەوە ژورەوە لەوێ وەعد بێت، ئێمە بە ئەنوەر دەڵێن داوای لێبوردن بکات.

ماکوان: من پێویستم بەداواوی لێبووردن نییە، هەر نامەوێت ببینم تەواو، زۆریان کرد بەهەر سێکیان منیان بردەوە ژورەوە.

د. چالاک: کاک ماکوان تکایە کۆتایی بابێت بەم باسە، کاک ئەنوەر فەرموو داوای لێبوردن بکە باکۆتایی بێت.

ماکوان: ئەنوەر هەڵەی بەرانبەر من نەکردووە، بۆ داوای لێ بوردنم لێ بکات، ئەنوەر دەبێت داوای لێبوردن لەگەڵا بکات، پاشان لەهەموو خوشکەکان و لەجەنابی دوکتۆر چالاک، ئەو کات دڵم چاک دەبێت وەکو وایە هیچ ڕووی نەدابێت، بەڵام ئەگەر ئەو کارە نەکات و لوت بەرزە سوێند ناخۆم نەکو بمرم ئەتوانم قسەکە بەرمە سەر، بەڵام قاچو دەستی مسۆگەرە، جا بە هەڕەشەی وەردەگرێت یان بەجدی وەری دەگرێت یان دەڵێت ماکوان ئەو پیاوە نییە، ئەویش ڕۆژانی داهاتوو ئەیسەلمێنێت، منی ئامانج نەماو لە ژیاندا ئەو کارە دەکەمە ئامانج.

کامەران: کاک ئەنوەر کاک ماکوان داوای نییە بۆ خۆی، فەرموو داوای لێبوردن بکە.

ماکوان: ئەوەم قبوڵ نییە، دەبێت بڵێیت داوای لێبووردن لەگەڵا و ئازار و خەجیج و سازان بکات، نەک هەروا بەسادەیی، جا ئەگەر پیاویت و ترست نییە، داوای لێبووردن مەکە، ئەوە من دەڕۆمە دەرەوە تا ١٠ خولەک دەوەستم نوێژی مەغریب دەکەم کە تەواو بووم، ئەو کارەت ئەنجام دابێت من لێرە دەڕۆم و داوایی من و تۆ مەرحەبای یەکتر دەکەین.

چووم دەستنوێژم گرت و دەستم کرد بە نوێژ کردن، نوێژەکەم تەواو نەکردبوو د. چالاک چاوەڕێی دەکردم پێشتر د. چالاک و کامەران و کچەکان لەگەڵ نامیق زۆر فشاریان بۆ هێنابوو.

د. چالاک: کاک ماکوان تەواو بوویت فەرموو بابڕۆینە ژورە هەموو شتێک کۆتایی هات، چوومە ژورەوە کامەران وتی کاک ماکوان داوای لێ بوردنی لەو خوشکانە کرد تێوەش دەست بکەنە ملی یەکتری.

ماکوان: گەڵا داوای لێبوردنی لێ کردی؟

گەڵا: بەڵی کاک ماکوان.

ماکوان: ڕازی بوویت بە داوای لێبوردنەکەی؟

گەڵا: بەڵێ کاک ماکوان.

ماکوان ئازار خان داوای لێبوردنی لێ کردیت؟

ئازار: بەڵێ کاک ماکوان.

ماکوان: خەجیج و سازانی خوشکم داوای لێبوردنی لە ئێوەش کرد.

هەردووکیان وتیان: بەڵێ

منیش هیچ لەدڵما نەما و کۆتایی هات.

د. چالاک: تکایە ئاشت ببنەوە، دەست بکەنە ملی یەکتر، ئەنوەریان هێناو ئاشت بوینەوە.

ماکوان: تکایە ئازار خان من و گەڵا ببەرەوە بۆ سلێمانی.

ماڵئاوایم لێکردن و لەگەڵ ئازار و گەڵا خۆمان ئامادە کرد بێینەوە، من چوومە دواوە دانیشتم و گەڵا لە پێشەوە لەگەڵ ئازار دانیشت، هەرچەند دوکتۆر چالاک داوای کرد کە من بەرێتەوە، بەڵام ڕازی نەبووم هەر خۆم مەبەستم بوو لەگەڵ ئازاردا بگەڕێمەوە بزانم بۆچی بووە بە نەسرانی.

بە پێشی ئاوێنەی سەیارەکەیدا خاچێکی هەڵواسیبوو، منیش کە کەوتینە ڕێ وتم ئازار خان جەنابت ئاشوریت؟

ئازار: نا؛ کاک ماکوان کوردم، بەڵام ماوەیەکە پەیوەندیم بە کڵێساوە کردوە تا لەڕووی دەروونیەوە کەمێک ئارام بم.

ماکوان: ئەی ئارام بوویت؟

ئازار: بڵێم چی، خۆشم نازانم سەرم لێشێواوە، نەوەڵڵا خراپتر بووم.



ماکوان: ئەی پێشتر موسڵمان بوویت؟

ئازار: بەڵێ، هەموو خێزان و کەسوکارم موسڵمانن، بەڵام تەنها تەنها من بووم بە مەسیحی جاروبار دەڕۆم بۆ کلێسا دەڵیم بەڵکو باش بم.

ماکوان: ئەی ئیسلامت تاقی نەکردۆتەوە، مەبەستم پابەند بوونە، نەک هەر بڵێیت موسوڵمانم.

ئازار: ڕاستی نەخێر.

ماکوان: ئازار خوشکی بەڕێزم وا هەرچی زانا و دانشمەند و قەشەی نەسرانییە دەگەڕێتەوە بۆ ئیسلام، تۆش تازە بەتازە دەڵێت مەسیحیم، خوشکی ئازیز ئاگات لە قیامەتت بێت، ئێمە دنیامان وا خەریکە تەواو دەبێت، بۆچی قیامەتمان وێران بکەین، بەڕێز گیان ژیانی دنیا چەند ساڵێک دەژمێرین، بەڵام کە مردین خلودە هەتا هەتاییە تۆ کە ئەدرەسی ڕاستی و دروستی پێنەبوو لێرەوە مەبەستم لە قیامەتە ڕێک ون دەبیت و هاتنەوەت نییە، لێرە کاتت هەیە و بوارت بۆ ڕەخساوە کە چویتە ئەولاوە ئیتر لێپرسینەوە و ژیانی ئەبەدییە.

هەوڵ بە گوێ لە قورئان بگرە، تۆ نازانیت ئینجیل کێ نووسیویەتی، هەموو ئینجیل ٣٠ لاپەڕەیە کردوویانە بە ناوی چوار کەسی تر بەناوی یوحەنا، مارکوس، مەتا و لوقا بە هەموویان ناچێتە ١٢٠ لاپەڕە کە هەمووی دووبارەیە، تۆ بۆ خۆت سەرگەردان دەکەیت، بە قسەم بکە و لێرەوە تۆبە بکە، ئاخر ئەم خاچە چییە هەڵت گرتووە خۆت ئەدەی لەخاچ بۆکێ بۆ بە هەتا هەتایی لە دۆزەخدا بمێنیتەوە.

لە ئەوروپادا کە جێگای دینی نەسرانییە، تەنها وەکو ناسنامە ماوەتەوە کڵێساکانیان هەموویان فرۆشت موسڵمانان دەیکڕنەوە و دەیکەنە مزگەوت، تۆ شوێن کڵاوی بابردوو کەوتویت، ئەگەر حەز دەکەیت وەرە بۆ نووسینگە لەگەڵ گەلا و ئەو خوشکانەی ترم لەوێ دادەنیشین زیاتر قسەو باس دەکەین، لە پێشدا من بەرنەوە دوایی خۆتان بڕۆن.

ئازار: هەروا دەکەین کاک ماکوان

ماکوان: گەڵا ئەوە بۆ وا بێدەنگیت، خۆ کاریگەری قسەکانی کاک ئەنوەرت لەسەر نەماوە، گوێی پێنەدەیت باشە؟

گەڵا: نەوەڵڵا کاک ماکوان، حەز دەکەم گوێم لە جەنابت بێت، ئەنوەر زۆر گوناحە، ئەمڕۆ خۆی ناشرین کرد و هیچیشی پێنەکرا.

ماکوان: ڕاستە خۆشم بەزەیم پێدا دەهاتەوە، چاک خۆی سوک کرد.

ئازار: کاک ماکوان ئەو پیاوە ماسکی بەستوە، تۆ ئاشکرات کرد کەسێکی داخ لەدڵ وحاقد دیارە.

ماکوان: گوێی مەدەنێ کۆتایی هات سوپاس بۆ خوا، خوا هیدایەتی ئێمەش و ئەویش بدات، آمین.

ئازار: کاک ماکوان ژمارەی تەلەفۆنەکەت لە گەڵا وەردەگرم حەز دەکەم پەیوەندی زیاترمان هەبێت.

ماکوان: زۆر بە خۆشحاڵییەوە تۆ وەکو گەڵا و خوشکەکانی خۆم وایت، هەمیشە لە خزمەتدام، ئەکرێت پرسیارێک بکەم.

ئازار: بەدڵنیاییەوە کاک ماکوان فەرموو.

ماکوان: لەگەڵ کاک نامیق زۆر گونجاو دیار بوون، هەرچەندە هاتنە ناو ئەم بابەتە مافی من نییە، بەڵام تەنها لەڕووی فضوڵیەت و هاوکارییەوە و هیچی تر، بە ئاسایی لێم وەربگرە، ئەگەر وەڵامیش نەدەیتەوە زۆر ئاساییە.

ئازار: نا زۆر ئاساییە، هەر دۆستایەتیەکی ئاساییە، بەڵام زیاتر نامیق هۆگرە بەمنەوە، منیش ڕووم لێ وەرنەگێڕاوە و بیرم لە هیچی تر نەکردۆتەوە لەگەڵیدا، چونکە ئەزمونێکی شکست خواردوم هەبوو، ئەوەش زۆر کاریگەری لەسەر دروست کردووم، بۆ گەڵام باس کردووە.





ماکوان: دڵنیا بە من هیچم لە گەلاوە نەبیستووە، من یەکجار لەگەڵ گەلادا دانیشتووم.

ئازار: نەبەخوا مەبەستم ئەوە نەبوو تەنانەت باسی کردبێتیش ئاساییە، بەڵام دەزانم گەلا کچێکی زۆر بێدەنگە و حەزی بە قسەی زۆر نییە.

ماکوان: من زۆر سەرنجی کاک نامیقم دا پیاوێکی زۆر بیدەنگ و بەئەدەب دیارە، مادام هۆگری جەنابتە، هەوڵ بدە تۆش زیاتر لێی نزیک ببیتەوە، بەنسبەت ئەوەی کە دەڵێی ئەزموونێکی شکست خواردوت هەیە کێ ناڵێت لەمەیاندا سەرکەوتوو نابیت، ، بەڵام جارێ هەوڵ بدە بیروباوەری خۆت بدۆزەرەوە لەگەڵ خۆت ئاشت بەرەوە، ئینجا سەردانی نامیق بکە، بە دڵنیاییەوە ئێستا ئەویش لەبارێکی دەروونی نائارامدایە کە لە تۆدا ئارامی دەبینێت، هەوڵبدە بەڵکو هۆکاری شیفای هەردووکتان بێت، چونکە خۆشەویستی دەرمانی زۆرێک لە دەردەکانە.

ئازار: حەز دەکەم لەو بارەیەوە قسەت لەگەڵ بکەم لە دەرفەتێکدا چونکە پێشتر زەواجم کردووە بەهۆکاری ئەم نەخۆشییە هاوسەرەکەم جێی هێشتم ئیتر زۆر حەزم بە چارەی هاوسەرگیری نەماوە.

ماکوان: من پێشنیارت بۆ دەکەم پێش هاوسەرگیری و بیرکردنەوە لێی هەوڵبە واز لە کڵێسا و مەسیحیەت بهێنە، لەسەر ئیسلام بخوێنەرەوە بەتایبەت، چونکە خۆت مامۆستایت و شارەزایت لە زمانی ئینگلیزی و عەرەبی، گوێ بۆ احمد دیدات و د. راغب السرجانی و هەندێک ناوی ترم پێ وت لە زانایان کە گوێیان لێ بگرێت.

منیان لەبەردەم دەرگای ماڵەوە دابەزاند و پێشڕەوی برام سەیری دەکردن کەسیانی نەناسی و منیش ماڵئاوایم لێکردن.

پێشڕەو: لەگەڵ دوو کچدا هاتیتەوە دوانی تریش لەسەرەوە لای دایکم چاوەڕێتن!






## سرەو و هێنانی گەورەترین دیاری ژیانم

که چوومە ماڵەوە دوو ئافرەتی تەمەن (٢٠-٢٥) ساڵ دانیشتبوون دیار بوو ماندوو بوون، منیش بەخێرهاتنم کردن، خێرا چووم بۆلای دایکم وتم ئەمانە کێن؟

دایکم: ڕۆڵە بۆلای تۆ هاتوون، تۆ لە من دەپرسی کێن؟

ماکوان: من نانم نەخواردووە، زۆرم برسییە، ئێوە نانتان خواردووە؟

دایکم: جارێ ماویەتی نان پێبگات، لەبەر ئەم میوانانە درەنگ کەوتم نەمزانی ئەمێننەوە.

ماکوان: جا چۆن دوو کچی ئاوا گەنج لەماڵان دەمێننەوە بەشەودا؟

دایکم: جا ڕۆڵە خۆ دەریان ناکەم، ئەوە کەی پرسیارە لەمنی دەکەیت، وتیان تا کاک ماکوان نەگەڕێتەوە ناڕۆین و باسی هەندێک شتیان کرد بەخوا هیچیان لێ تێنەگەیشتم، گوایە فەحسەکانتان گۆڕاوە. چەند جار پەیوەندیان بە تۆوە کردەوە، تۆ وەڵامت نەبووە.

کە دایکم وای وت، بە پەلە ڕامکرد بۆلایان، وتم خێرە خوشکە بەڕێزەکانم.

سروە: کاک ماکوان وابزانم جەنابت ناوت خەسرەو عەبدولکەریمە، وایە؟

ماکوان: بەڵێ وایە، فەحسەکەی خۆی دایە دەستم لەپێش نزیکەی دوو هەفتە لە تاقیگە بووم، وتی گۆڕاوە لەگەڵ پشکنینی خوشکەکەم ناوی ئەو نزیکە لەناوی تۆوە خوشکەکەم ناوی (سرەو عەبدولکەریم)ە، ئەمەش سرەوی خوشکمە کە نەخۆشە.



ئەمهێشت قسەکەی تەواو بکات تەلەفۆنم کرد بۆ دوکتۆر چالاک تەلەفۆنی هەڵگرت و وتی: فەرموو کاک ماکوان.

ماکوان: دوکتۆر لەکوێیت؟

د. چالاک: لەناو شارم کاک نامیق دەگەیەنمەوە، پاش ئەوە دەگەڕێمەوە بۆماڵەوە.

ماکوان: نا جەنابی دوکتۆر ئەگەر ئەرک نییە خێرا بڕۆ بۆ عەیادەکەت، تەماشای پشکنینەکەم بکە بزانە ناوی منی لەسەرە؟ دڵنیا بەرەوە بزانە نووسراوە خەسرەو عەبدولکەریم یان سرەو عەبدولکەریم؟ پێدەچێت لەگەڵ خوشکێکی بەڕێز گۆڕابێت.

هەموو گیانم دەلەرزی، سروە زەردەخەنە لەسەر لێوی بوو، خوشکەکەی مات بوو، پرسیارم کرد وتم: ئەم خوشکەت ناوی سرەو-ە؟

سروە: بەڵێ؛ ناوی سرەو-ە و نەخۆشی سەرەتانی مێشکی هەیەو لە دەربەندیخان دادەنیشین بەڕاستی چەنێک بوو دەمانویست بۆت بهێنینەوە بەڵام دەرفەتمان نەبوو.

بێ ئەوەی هەست بەخۆم بکەم توڕە بووم و وتم: ئەی ئێوە نازانن چیتان بە من کرد، دەرفەتتان نەبوو ئاگادارم بکەنەوە؟

دایکم: ئەوە کوڕم بۆ لەو دووکچە توڕە بوویت، ئەی نازانی میوانن چی بووە؟ تۆزێ ئارام بە.

کە دایکم وای وت بە خۆمم زانی کە توڕە بووم.

سروە بەچاوی فرمێسکەوە: ئاخر پارەمان پێ نەبوو بێین بۆ سلێمانی، سرەوتی خوشکیشی دەستی کرد بە گریان و هەردووکیان دەگریان.

ماکوان: ببورن من زۆر شەرمەندەم کە توڕە بووم، بەخوا زۆر لائیرادی بوو توڕە بوونەکەم، من خەجاڵەتم و خزمەتکارتانم.






دایکم: ئەرێ چی بووە منیش تێبگەیەنن.

ماکوان: هیچ نەبووە من ناحەقیم کرد و هەڵە بووم کە تووڕە بووم.

ئەو دوانەش بێدەنگ بوون و هیچیان نەدەوت.

دایکم: بەخوا کەس لەتۆ تێناگات.

ماکوان: ئەوانە خوشکی منن، کەسوکاری منن، نووری چاوی منن، تووڕەبوونەکەم لەوان نەبوو لە کەسێکی تر بوو.

دایکم: باشە یاخوا وابێت.

دایکم چوو بەلای چێشت لێنانەکەیەو.

ماکوان: ببورن ئەم جارەش دایکم هیچ نازانێت، من ماوەی دوو هەفتەیە زۆر وێرانم کێشەی زۆرم توش بووە، لەڕووی دەروونییەوە هەمووی قوربانی نەعلەکانتان بێت، بەس با دڵنیا ببمەوە، ئیتر سرەو و تۆش وەکو کەنار و بناری خوشکم دەبن و بگرە زیاتریش.

سروە: کاک خەسرەو بەخوا زۆر بێ پارە بووین کە هاتین بۆ سلێمانی ٣٠ هەزار دینارمان پێ ماوە، سەیارەش نەمابوو بڕۆینەوە بۆ دەربەندیخان، جا تۆ وەزعی ماڵی ئێمە نازانیت، من و سرەوی خوشکم و باوکم و برایەکمان هەیە بەناوی سرەوت، دایکم پێش ١٢ ساڵ بەسەر سرەوت-ی برامەوە گیانی لەدەست دا، باوکم ناوی خەلیفە کەریمە و ناسراوە بە دەروێش عەبدولکەریم کرێکارە، ئیتر سرەوی خوشکم تووشی ئەم نەخۆشییە بووە و حاڵوگوزەرانیشمان باش نییە، هەر بۆیە دواکەوتین، دەبوو ئەمڕۆش بهاتینایە لە نەخۆشخانە بڕیاری داوە کە نەشتەرگەری بۆ سرەوی خوشکم بکەن، ئیتر بزانین چۆن دەبێت، و خوای گەورە چۆن چارەنووسمان دیاری دەکات.

ماکوان: بۆ نەخۆشییەکەی سرەوی خوشکمان بێخەم بن هەمو ئەرکێکی دەگرمە ئەستۆی خۆم، ئەو ژیانی منی گۆڕییەوە، تۆ بڵێیت من هەروا





بەئاسانی دەستان لێ هەڵبگرم، هەرگیز بیر لەوە مەکەنەوە بێکەسن، من براو پشت وپەناتانم.

سروە: ڕاستی کاک خەسرەو کەسێکی ناسراوی خۆمان لە بنەماڵەی هاروونیەکان بوو جەنابتی ناسی و وتی بڕۆن بۆلای دەست بە ڕوتانەوە نانێت.

ماکوان: خوا ئاسانی بکات، تازە ئێوە کەسوکاری منن.

لەم باسانەدا بووین دوکتۆر چالاک تەلەفۆنی بۆ کردم، وتی لە عەیادەکەم ئەو فەحسە لەسەری نووسراوە (سرەو عەبدولکەریم) لەوانەیە (خ) پەڕیبێت لەکاتی تایپی ناوەکەدا یان لەبیریان چووە بینوسن، ئەوە لەناوی ئافرەت ناچێت بۆ چی بووە؟

ماکوان: جەنابی دوکتۆر ئەو ناوە تەواوە، خوشکێکە ئێستا لام دانیشتووە ناوی (سرەو عەبدولکەریم)ە دیارە ناوەکەمان لێکچوونی هەیە، ئەو پشکنینە هینی ئەوە نەک من، پشکنینەکەی من بەناوی (خەسرەو عبدولکەریم) لای ئەوانە ئەکرێت بێیت بۆ ئێرە، زۆر مەمنون دەبم و هەرگیز ئەو چاکەیەت لەبیر ناکەم.

د. چالاک: بەسەرچاو هەر ئێستا دەکەومە ڕێ.

چاوەڕوانی دوکتۆرم دەکرد دەستم کرد بە گیرفانمدا بەستەیەک پارەی عێراقی تیا بوو هەمووی ٢٥ دیناری بوو، زیاد لە ملیۆنێک، خێرا خستمە دەستی سروە و وتم با ئەوەتان پێبێت.

سروە: نەبەخوا ئەوە زۆر زۆرە، من چی لەو هەموو پارەیە بکەم.

ماکوان: خوشکی من خوای گەورە دەرفەتم بدات لەوەش زۆر زیاترتان ئەدەمێ.

چوومە ئەودیو خێرا سوجدەی شوکرم برد بۆ خوای موتەعال، چەند جار سوجدەکەم دووبارە کردەوە و زۆر سوپاسی خوام کرد.






دوکتۆر چالاک تەلەفۆنی کرد وتی نزیک ماڵی باوکتم وەرە دەرەوە، چووم بەدەمیەوە فەحسەکەم لێ سەند و دڵنیا بوومەوە کە نووسراوە (سرەو عەبدولکەریم) فەحسەکەی ئەوانیش کە هێنابوویان بەدەستەوە بوو کە لەسەری نوسرابوو (خەسرەو عەبدولکەریم) نیشانی دوکتۆر چالاکم دا وتی ئەو فەحسە پاکە و هیچی تیا نییە.

د. چالاک: سەیربکە ئەو هەموو کاتە لە چی ناڕەحەتییەکدا بوویت زۆر بەئاسانی لێی دەرچوویت.

ماکوان: بەڕاستی دەبێت بڵێین کە قەزاو قەدەری خوای گەورەیە، وانەی ژیانە زۆر شتی لێوە فێر بووم، بابڕۆین نانێکی دەستی ئامینە خانی دایکم بخۆین و لە ئێستاوە ئەو کچە بخەرە جێگای من و هەموو پێداویستی و تێچوونی لەسەر منە تا چاک دەبێتەوە بە پشتیوانی خوای گەورە.

د. چالاک: هیوات زۆرە بە چاک بوونەوەی چۆن دەزانیت چاک دەبێتەوە؟

بە پێکەنینەوە وتی: ئەی بۆ خۆت هەمیشە بیرت لای مردن بوو؟

ماکوان: بابڕۆینە لایان، تکا دەکەم زۆر دڵنەواییان بکەو توانا و هێز و و ئێنەرجییەکی زۆریان پێ ببەخشە، چونکە تۆ دوکتۆری لەتۆی وەردەگرن.

د. چالاک: بەسەرچاو، بێخەمبە!

چووینە ماڵەوە دوکتۆر چالاکم بە دایکم و ئەو دوو خوشکە ناساند، دایکم وتی نان ئامادەیە خەسرەو وەرە هاوکاریم بکە با سفرەکە دابخەین، چووم لەگەڵ دایکم سفرەم داخست بۆیان.

دایکم: پێم بڵێ چی بووە؟

باسەکەم بۆ گێڕایەوە بەڵام زۆر بەسادەیی هەر ئەوەندە وتی: دیارە خەمت زۆر خواردووە کوڕم (دایکت بمرێت).





ماکوان: خوا نەکات تۆ بمریت، یاخوا من هەرگیز مەرگت نەبینم ئامینە خان.

هەندێک موجامەلەی دایکم کرد و دەست کرا بە نان خواردن، ئەو شەوە منو پێشڕەوی برام لەماڵەوە نەخەوتین لەبەر ئەو دوو ئافرەتە، من چوم بۆ ماڵی وریای حاجی حەسەن و پێشڕەویش چوو بۆ ماڵی ئارامی بلە بەهاری زاوامان.

لەگەڵ دوکتۆریشدا وتوێژم کردبوو کە بەیانی دەیانهێنم بۆ لات و بەیەکەوە دەچین بۆ تاقیگە و سەرلەنوێ پشکنینی نوێ دەکەینەوە.

شەو کە چووم بۆ ماڵی وریا، حاجی حەسەنی باوکی لەوێ بوو، زۆر بەگەرمی بەخێر هاتنی کردم، لەکاتێکدا حاجی حەسەن منی خۆش نەدەویست. جارێکیان زەرەرێکی زۆری کرد بە هۆکاری منەوە لەوکاتەوە منی نەدەچووە دڵەوە و بەینمان خۆش نەبوو، بەڵام من هەر ڕێزم دەگرت. هۆکارەکەی ئەوە بوو هەردوولامان برنجمان دەفرۆشت بە جوملە، لەسەر من هەرزان کەتبوو لەسەر ئەویش گران، ئەو نەیفرۆشت تا من هەمووی بفرۆشم، ویستی دوایی گرانی بکات، خوای گەورە ویستی وابوو دۆلار بەرز بوەوە و حاجی دوو ئەوەندەی تر زەرەری کرد، ئەمە هەموو چیرۆکی ڕق لێهەڵگرتنەکەی حاجی حەسەن بوو لە من.

ئەو شەوە زۆر گەرم و گوڕ بوو لەگەڵما، وریاش مۆڕەی لەباوکی دەکرد، دانیشتین من باسی هیچم نەکرد حاجی زوو زوو دەیوت لەوەتەی ڕێحان مردووە (ڕێحان خان، خێزانی بوو، چوار ساڵ بوو عەمری خوای کردبوو) نانێکی خۆشم نەخواردووە، ڕێحان بۆ من زۆر باش بوو پیاو کە بێ ژن بوو لە پیاو ناچێت، لەم جۆرە قسانەی زۆر کرد، لەکاتێکدا هەمیشە لەگەڵ ڕێحان خان شەڕیان بوو.








منیش لەدڵی خۆمدا وتم ئەم سەگ بابە خوازبێنی دایکم نەکات، قسەکانی بۆنی ئەوەی لێدەهات، زۆر بە شان و باڵمدا هات، وتی: هەر دەبێت تۆ ژنێکم بۆ بهێنیت.

ماکوان: حاجی گیان کەس شک دەبەیت برۆینە داوای بۆت؟

حاجی حەسەن: ئەرێوەڵڵا زۆرە باوکم، بەڵام چیبکەم لە کوڕی خۆم کە بە فریام نایەت.

وریا: کوڕە باوکە عەیبە، بۆ خاترت خوا حەیامان مەبە.

لەدڵی خۆمدا وتم بەخوا دیارە کەرێتیەکەی باش سەری لێیداوە.

پیاوێکی بێئەقڵە، ئەگەر باسی دایکم بکات کەرامەتی دەشکێنم لەبەرچاوی وریادا، وتم حاجی کێیە من دەیناسم؟

حاجی حەسەن: ئەرێوەڵڵا باشێ دەناسیت و مەمنون دەبم ئەگەر هاوکاریم بکەیت، ئەو ماڵە تۆیان خۆش دەوێت، ئەویش نەسرینە ژنەکەی عەتای پەرەمێز.

دامە قاقای پێکەنین وتم: دایکی نەبەزی خۆمان؟

حاجی حەسەن: بەڵێ، دایکی نەبەز، ئەو تەنهایە و منیش تەنهام.

ماکوان: جا حاجی گیان من برۆم بە نەبەز بڵێم دایکت بدە بە شو بە حاجی حەسەن، وەڵڵاهی نە قسە لەگەڵ من دەکات نە لەگەڵ وریای کوڕت.

وریا: کورە بۆ خاتری خوا خەسرەو با بۆخۆی بڵێت حەیامان دەبات، خڵەفاوە باوکم.

حاجی حەسەن تۆزێ جنێوی یا بە وریا وتی تۆ قسە مەکە.

منیش خوای گەورە بۆی دام دڵم خۆش بوو ئەوەندەی تر پێکەنیم و وتم: باشە تۆ پیاوێکی ئاقڵی من چی بە نەبەز بڵێم؟ تۆ ڕێگایەکم بۆ دابنێ.





حاجی حەسەن: وەڵڵا تۆ ئاقڵی خەسرەو گیان خۆت ڕێگایەک دابنێ و چی دەڵێیت لە قسەت دەرناچم.

ماکوان: بەسەرچاو ئێستا تەلەفۆنی بۆ دەکەم پێی دەڵێم، ئەی چی بۆ من دەکەیت حاجی؟

وریا: بەخوا قسەت لەگەڵ ناکەم، بابە من نانی ماڵی نەبەزم خواردوە، تەلەفۆنی چی بۆ دەکەیت. با باوکم هەر بۆخۆی بڵێت.

ماکوان: حاجی گیان، ئێستا نازانم بە قسەی کامتان بکەم، تۆ وریای کوڕت ڕازی بکە نەبەز ئاسانە (ئەو قسانەم دەکرد دەمویست قسە بە وریای کوڕی بڵێت) ئەو شەوە بوو بەشەڕ لەگەڵ وریا، حاجی حەسەن ڕۆشت، لەڕاستی منیش ئەوەم دەویست کە بڕوات.

وریا کە باوکی ڕۆشت وتی: کاکە بیکە بەخاتری خوا هیچ بە نەبەز نەڵێیت، کەرە باوکم دەکوژێت، تۆ چۆن لە ڕوت دێت وا بە نەبەز بڵێیت.

ماکوان بە پێکەنینەوە: بڕوا ناکەم نەبەز وا بکات، دەزانێت من دەمرم قسەم ناشکێنێت.

وریا: دەتوخوا واز بێنە قسەم بۆ بکە خێرە چی ڕوویداوە، زەوقت هەیە بۆم باس بکە.

ماکوان: نەخۆشییەکەم کامێرای شاراوەی خوایی بوو، هەموو باسەکەم بۆ گێڕایەوە، وریا چوو سیدیەکی عەزیز وەیسی خستە سەر و بە تەنها هەڵدەپەڕی، ژنەکەشی دەیوت وریا بۆ وا دەکەیت؟

ماکوان: براژن بەتەمایە ژن بۆ باوکی بهێنێت.

سیدیەکەی لابرد و دەستمان کرد بە قسە، تەلەفۆنی کرد بۆ هیوا ڕەش ئەویش هات، وەک پیشەی شەوانی تر تا نوێژی بەیانی نەخەوتین و قسەی خۆش و پێکەنین بوو، بەڵام بە نەبەزمان نەوت لەبەر ئەوەی وریا دەترسا






لەوەی نەوەک باسی خوازبێنی دایکی بکەین بۆ باوکی وریا، زوو زووش بە هیوای دەوت، باشە من نەمدەوت جارێ نامرێت دڵم لێی داوە.

بەیانی نزیک کاتژمێر ١٠ گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، بە سروە و سرەوم وت، ئێوە دەتوانن تا کاتژمێر ٣ی دوانیوەڕۆ بڕۆن بۆ بازاڕ یان لەماڵەوە بن، ئەوکات دەڕۆین بۆلای دوکتۆر چالاک بزانین چیمان پێ دەڵێت.

سروە: زۆرباشە، بەڵام ئەگەر دەکرێت هەواڵ بدەین بە باوکم، چونکە تەلەفۆنمان پارەی تیا نییە.

ماکوان: ئێ خوا عافوتان بکات بە دایکمتان بوتایە.

تەلەفۆنەکەی خۆمم دایەو چوومە خوارەوە بۆلای پێشڕەو و کارتم هێنا بۆ تەلەفۆنەکانیان و من چووم بۆ بازاڕ، بەڵام چوونم بۆ بازاڕ وەکو ڕۆژەکانی هەفتەی ڕابردوو نەبوو، هەرچی گۆڤار و ڕۆژنامە هەبوو تازە لە بازاڕ کڕیم و دەستم کرد بە خوێندنەوەی، ئێنەرجییەکی زۆرم هەبوو بە شەوق و زەوقێکی خۆشەوە پێشوازیم لەخەڵکی دەکرد و هەموو گیانم پێ دەکەنی، تەلەفۆنم کرد بۆ گەنمی خوشکم، دوای هەواڵپرسین وتم ئەمڕۆ ناتوانم ببینم، چونکە سەرقاڵم، بەڵام مژدەیەکی خۆشت با بدەمێ، من نەخۆش نیم. باسەکەم بۆ گێڕایەوە، زۆر خۆشحاڵ بوو، چونکە بڕیارمدابوو کە وەرزێر و گەنم بەیەکەوە ببینم، بەڵام داوای لێ بوردنم لەگەنم کرد و وتم بیخەرە بەیانی لە خزمەتاندا دەبم.

لەگەڵ دوکتۆر چالاک یەکترمان بینی پێش ئەوەی سروە و سرەو بێن، چوین بۆ تاقیگە داوای لە من کرد کە خۆم توڕە نەکەم، هەڵەی لەو جۆرە ڕوو دەدات.

ماکوان: نا، دوکتۆر گیان پێویستە توڕە بم، چونکە ئەوە هەروا کارێکی سادە نییە، من لە تاوا ئەو هەواڵانەی کە پێدام توانام نەما تەماشای ناوەکەش بکەم، پێویستە توڕە بم، بەڵام نایگەیەنمە ئاستی زۆر بەرز بگاتە جەنگ و دەمەدەمێ ئەگەر دانیان بە هەڵەکەی خۆیا نا.





تەلەفۆنم کرد بۆ پێشڕەو کە ئەو دوو خوشکەمان بنێرێت بۆ جێگاو ناونیشانی تاقیگەکەم دایە کە چووینە ناو تاقیگەکە هاتن بە دەممانە، بەتایبەت لەبەرخاتری دوکتۆر چالاک بوو، دانیشتین و باسەکەی کردەوە، زۆر شەرمەندە بوون، کە زانیم وەرزعەکە بەو شێوەیە بوو، منیش هیچم نەوت، دوکتۆر لەجیاتی من سەرزەنشتی کردن، ئیتر وتم ئەوەندە بەسەو کۆتایی بێت و پشکنینیان بۆ من کرد، سروە و سرەو گەیشتن و پشکنینیان بۆ سرەو کرد، پاشان هەموویانم دەعوەت کرد بۆ نووسینگە، کچەکان وتیان ئێمە دەبێت بڕۆین کاک ماکوان، چونکە دوو ڕۆژە نەچووینەتەوە باوکم دڵی لامانە و ئەویش و براکەشمان بەتەنهان، بەیانی تۆ فەحسەکەمان بۆ وەربگرەوە ، کەی دوکتۆر فەرمووی دێینەوە بۆ سلێمانی.

د. چالاک: سرەو کچی خۆم نەشتەرگەریت بۆ بکەم؟

سرەو: ئاخر پارەمان نییە.

ماکوان: سرەو گیان باسی پارە مەکە، من نەموت تۆ خوشکی منیت، تا برا گەورەش وەستابێت تۆ پێویست ناکات باسی پارە بکەیت، تۆ باسی ئەوە بکە کە نسبەی سەرکەوتن چۆنە و چۆن دەبێت، کچە جوانەکەی خۆم ئیتر باسی پارە مەکە، د. چالاک بیر لە پارە ناکاتەوە.

سرەو: باشە خوا لە برایەتیتان کەم نەکات.

د. چالاک: لەشاری دەربەندیخان باوکتان کاری چییە؟

سروە وەڵامی داوە چونکە لە سرەو گەورەتر بوو، وتی: دوکتۆر خەریکی کرێکاریە، منیش جاروبار نان بۆ خەڵکی دەکەم و براکەشم هەرچەندە زۆر منداڵە بەڵام دەستگێڕە و شت دەفرۆشێت، جا ئەگەر ئیزنمان بەن نەوەکو پاس و سەیارە نەمێنێت بۆ دەربەندیخان با زوو بگەڕێینەوە ماڵمان لە دووری شاری دەربەندیخانە.

د. چالاک: زۆر باشە فەرموو بڕۆن منیش دەڕۆم بۆ عەیادەکەم خەڵک چاوەڕێمە لەوێ و کاک ماکوان جەنابت وەرە لەگەڵما کارم پێت دەبێت.






ماکوان: با لەگەڵ ئەمان بڕۆم بۆ گەراجی دەربەندیخان پاشان دێمە خزمەتت.

هەرچەندە کچەکان وتیان پێویست ناکات، بەڵام حەزم نەکرد بە پاس بڕۆن، ویستم تەکسیەکیان بە تایبەت بۆ بگرم، لەگەڵیان چووم بە تەکسی ناردمنەوە بۆ دەربەندیخان و پێم وتن کە گەیشتن تەلەفۆنم بۆ بکەن، ماڵئاوایم لەوان کرد و چووم بۆ عەیادەکەی دوکتۆر چالاک، دوای ئەوەی چەند نەخۆشێکی بینی من چوومە ژورەوە بۆلای وتی کاک ماکوان پێت چۆنە مام عەبدولکەریمی دەربەندیخانی بکەمە باخەوانی باخەکەم؟

چارەسەری سرەو بکەین و جاروباریش سروەو براکەی خزمەتی نەخۆشەکان بکەن کە دێن بۆ ئەوێ، پارەیان ئەدەینێ و کرێشیان لێ ناسێنم مانگانەش ٣٠٠ هەزاری ئەیەمێ و هەموو کاری چارەسەری سرەوی کچیشی لەسەر من بێت؟

ماکوان: بەخوا دوکتۆر ئەمەی دەیکەیت شتێکی زۆر گەورەیە، من مەمنونت دەبم و چی بە من دەکرێت چیت دەوێت من لە خزمەتام.

د. چالاک: بەیانی دەڕۆم بۆ تاقیگە پشکنینەکەی تۆش و ئەویش وەردەگرمەوە، هەرچەندە خۆم کاری تایبەتم هەیە لەوێ بە تایبەت بۆ وەرگرتنەوەی جوابەکان ناڕۆم، کە لەوێ تەواو بووم دێم سەردانت دەکەم لە ڕەشەمۆڵ.

ماکوان: یاخوا بەخێر بێیت دوکتۆر گیان، زۆر مەمنونی تۆم، بەڕاستی کارێکی زۆر گەورە دەکەیت و سوپاسی ئەو هەڵوێستە جوانەت دەکەم، گوناح نییە تۆ خواناس و دیندار نیت کە خاوەنی ئەو دڵە باش و جوانەی.

د. چالاک بە پێکەنینەوە: کاکە تۆ وا دەزانیت تەنها موسڵمان خێر دەکات، منیش خێر دەکەم، بەڵام هەست دەکەم کە تۆ سوپاسم دەکەیت من بۆ تۆی دەکەم.

ماکوان: باشە دوکتۆر گیان قسە دەکەینەوە.



ماڵئاوایم لێ کرد، بیرم چوو کە تەلەفۆنەکەم بێدەنگ کردبوو، کە تەماشمام کرد تەلەفۆنێکی زۆرم بۆ هاتبوو، نەبەز ٦ جار تەلەفۆنی کردبووم کە تەلەفۆنم بۆ کردەوە داوای لێبوردنم لێکرد.

نەبەز: هیوا بۆی باسکردم شوکر نەخۆشییەکەت ڕاست نەبووە، ئێستا من و هیوا لە بەردەرکی سەراین، چووینە ڕەشەمۆڵ لەوێ نەبویت وەرە بۆ ئەم ناوە لەهەر کوێیت.

ماکوان: لە شەقامی قەناتم ١٠ خولەکی تر دەگەمە لاتان، تەلەفۆنم داخستەوە و بەپەلە کەوتمە ڕێ بۆلای ئەوان، گەیشتمە لایان و نەبەز باوەشی پێداکردم، دەستی کرد بە گریان، وتم نەبەز من بەتەمای مردن بووم نەگریایت ئێستا کە هیچم نییە بۆ دەگری؟

نەبەز: وەڵڵا لە خۆشیا دەگریم، پاشان دڵنیا بوومەوە کە شووم نیم.

من و هیوا دامانە قاقای پێکەنین.

نەبەز: دایکم و سەیران لە ماڵی پورمن، ئەم شەو ئەیکەین بە ئاهەنگ و خۆشی، هەرچی خۆشمان دەوێت بانگی دەکەین.

ماکوان: هەمووومان بەیەکەوە دادەنیشین، بەڵام ئاهەنگی چی و شتی چی، ئیستا کەی ئەو شتانە بۆ ئێمە شیاوە.

هیوا: وەڵڵا دەیکەین بە ئاهەنگ و دەفەکەی وریاش دەهێنین خۆشت دەفمان بۆ لێبە و دەروێش عەبدوڵاکەشمان بۆ دەڵێیت، لەم شەوە خۆشتر نییە.

نەبەز: تەلەفۆنی کرد بۆ وریا و پێی وت.

وریا: نایەم بەڵام وەرن دەفەکە بەرن.

نەبەز: وریا نایەت، گوایە ماڵی خەزورانی هاتوون.

چپاندم بەگوێی هیوادا وتم: درۆ دەکات ئەوە لەترسی من نایەت، بە نەبەزم وت: من دەچم دەیهێنم لەگەڵ هیوای برام تۆ ئیشی خۆت بکە، چیمان پێویستە لەگەڵ خۆمان بیهێنین؟

نەبەز: لەبازاڕ نان دەخۆین، دوای چەرەس و چا دەبەینەوە ماڵی ئێمە، دەچم بە دوای تالە پێنجوێنی خزمت و سەنگەری شێخ عەبدوڵا، خۆ ئاساییە؟

ماکوان: بۆ من ئاساییە، نازانم بۆ مامە هیوا.

هیوا: جا تایەر و سەنگەرمان لەگەڵ بن شەوەکەمان زیاتر خۆشتر دەبێت.

ماکوان: نەبەز پێیان بڵێ نابێت بخۆنەوە ئەگینا من لەگەڵیان دانانیشم.

نەبەز: تۆ بڵێی من بەوە ڕازی بم.

ماکوان: وتم با لەسەرەوە قسە بکەین، دوایی دانیشتنەکەمان لێ تێک نەچێت، من و هیوا دەچین بۆلای وریا و دەیهێنێن.

چووینە ماڵی وریاو بە خێزانیم وت: براژن ئەمشەو ماڵی باوکت دێن بۆ ئێرە.

خێزانی وریا: نەوەڵڵا کاک خەسرەو بۆ خێرە؟

ماکوان: براژن گیان ئەم شەو وریا لە جەنابت قەرز دەکەین، لەگەڵ دەفەکەیدا پێمان دەبەخشی؟

خێزانی وریا: بفەرموون هەر بۆ خۆتان.

وریا: نایەم شەو ئیسراحەتم لێ تێک ئەدەن، دڵی نەبەزم لێ دەیەشێت، لەبەر ئەوە نایەم.

سوێندم بۆ خوارد کە من باسی شتی واناکەم و دڵنیابە، هیواش هەرگیز باسی ناکات، هەستە بابڕۆین.



وریا: سوێندم بۆ بخۆن.

من و هیوا سوێندمان خورد کە باسی ناکەین، هات لەگەڵمان و دەفەکەی هێنا و وتی: دەڵێن چی تەلەفۆن بۆ ڕێبواری مەلا برایم بکەم بزانین دێت شەو گۆرانیمان بۆ بڵێت؟

ماکوان: من کێشەم نییە، ڕێبوار دەنگی خۆشە و نوێژکەرە، هەرچەندە من و ئەو باش یەکتر ناناسین و تەنها دوور بە دوور یەکتر دەناسین، بۆ من ئاساییە.

هیوا: ڕێبواری مەلا برایم بێت بەخوا من دەبێت تەلەفۆن بۆ ڕەزا جولەکانی بکەم.

ماکوان: نا ئیتر یەکجار واش نا، ڕێبوار ئاساییە بەس ڕەزا جولەکانی تۆزێک زیادە.

وریا تەلەفۆنی کرد بۆ ڕێبوار بۆی نەکرا بێت، چووین بۆلای نەبەز و نانخواردنی ئێوارە و نانمان لە دەرەوەو چووینەوە بۆ ماڵی نەبەز و ئاهەنگێکی بچووکمان گێڕا و بەقسەی خۆش ئەو شەوەمان بردە سەر.

بۆ بەیانی ڕۆشتم بۆ نووسینگە و کاتژمێر ١١ بوو گەنم هات بۆلام تەنها بوو، لێم پرسی ئەی کوا وەرزێر؟

گەنم: پێم وتووە کە خۆی بێت، خۆ من هیچی ئەو نیم تا لەگەڵ ئەو بێم بۆلات.

ماکوان: ئەی ئافەرین، ئەوەندەی تر گەورە بوویت لەبەرچاوم، گەنمی خوشکم دوو ڕۆژە بیر لەوە دەکەمەوە کەرامەتی منت پاراستووە، هەرچەندە ئەگەر لەگەڵ وەرزێریش بهاتیتایە من نەمدەتوانی هیچ بڵێم، بەڵام وەکو ئیستا خۆشحاڵت نەدەکردم و سەربەرزت نەدەکرم، ئەوەشت بیرنەچێت وەرزێریش کە نەمدیوە لەبەرچاوم شیرین بوو، کە نازانم هەڵویستی چۆن بووە کە وتوتە خۆت وەرە بۆلای کاکم؟



گەنم: وەڵڵا زۆر ئاسایی بوو، دوو ڕۆژ بەر لە ئێستا ئاگادارم کردەوە و پێم وت کاتم داناوە تا کاکم بتبینێت، ئیتر ئەوەندە پرسی لە کوێیە بە یەکەوە دەڕۆین یان خۆم بێم، منیش وتم هەر دەبێت خۆت بێیت، ئەویش وتی باشە، هەر ئەوەندە ئیتر دوایی تەلەفۆنم بۆ کرد وتم کاکم سەرقاڵە ئەمڕۆ ناتوانین بیبینین و ناونیشانەکەم داوەتێ کەبێت بۆ ئێرە.

ماکوان: زۆرباشە، چاوەڕێی ئەو دەکەین و دوایی دەچین بۆ کەبابخواردن وەرە باهەندێک وێنەی باوکمت نیشان بدەم، تۆش بۆ ئەوەی بزانیت پیاوێکی قارەمان و نووسەرێکی گەورە بووە، خەریکی ئەوە بووم وێنەکان بدۆزمەوە لەپڕ کوڕێکی گەنج خۆی کرا دبە ژوورا وتی: کاک ماکوان چۆنی باشی من وەرزێرم.

وازم لەگەڕان بەدوای ڕەسمەکاندا هێنا و بەخێرهاتنم کرد و لەجێگاکەی خۆم هەستام چوومە لای و کوڕێکی زۆر بەڕێز و ئارام و لەسەرخۆ و قۆزیش بوو، لەدوای کەمێک دانیشتن من باسەکەم کردەوە.

ماکوان: کاک وەرزێر بێجگە گەنم دوو خوشکی ترمان هەیە شویان کردووە، بۆیە باسی ئەوەم بۆ کرد بۆ ئەوەی بزانیت کە خۆشەویستی پڕەنسیپە و لای ئێمە گرنگە تەنها حەز لێکردن نییە، یان خۆشم دەوێت نییە بەتەنها، چونکە من سبەینێ دەبم بە خاڵی مناڵەکانت و خاڵی تریشیان هەیە و پورو باپیر و نەنکی دروست دەبێت، واتا زۆر نزیک دەبینەوە لە یەکتر. جا من ڕێگر نیم لە نێوانی تۆ و گەنم دا بەو مەرجەی ئەو پرنسیپانە جێبەجی بکەیت.

وەرزێر: من لەگەڵ کاک جەمالیش قسەم کردووە، ئێوە چی دەڵێن من وادەکەم.

ماکوان: دەموچاوم یا بەیەکدا و لەناخەوە دەکوڵام، بۆم نەشاراوە و پێم وت دیارە هێشتا لەمن نەگەیشتویت، من داوای شت ناکەم من ئاڵتون بۆ هەردوکتان دەکەم و ماڵیشتان بۆ دادەمەزرێنم، لەو جۆرە کەسانە نیم

وابزانی کە دەڵێم پڕەنسیپ واتا داواکردنی پارە و ئاڵتون بۆ گەنم، نا؛ ئەوە نییە باسەکە. پاشان جەمال هیچی گەنم نییە من تەنها ڕێزی دەگرم بەوەی وەکو باوکێک گەنمی لە منداڵییەوە گەورە کردووە، من باوک و براو گەورەی گەنمم، کاک جەمال ناتوانێت بڕیار بدات، بەڵکو من بڕیار دەدەم.

وەرزێر: ببورە کاک ماکوان، مەبەستی من خراپ نەبوو، تۆ چی دەفەرموویت باوابێت.

ماکوان: وەرزێر گیان و گەنمی خوشکم، خۆشەویستی سێ جۆرە: یەکەم: کەسێک حەز لە خۆشەویستەکەی دەکات و دوای تێر بوونی حەزەکەی واز لەیەکتری دێنن، جا لە تەڕەفی پیاوبێت یان ئافرەت.

دووەم: بریتییە لە خۆشەویستی ژن و مێردایەتی بێ پڕەنسیپ، یان سەرکەوتوو دەبن یان جیابوونەوە، ئەمەش زۆرینەی خانەوادەی کوردی لەسەر دامەزراوە.

سێیەم: خۆشەویستی بە پڕەنسیپ کە بنەماکەی دروست کردنی خێزانە لەسەر بنەڕەتی خۆشەویستی عیشق لە پێناوی ئەوەی کە ژیان بەردەوام بێت، عیشق بەردەوام بێت کە پەیوەندییە لەگەڵ دروستکەری ژن و پیاو کە خوای موتەعالە، پرسیارەکەی من ئەوەیە لە تۆش گەنم ئێوە لەم سێ جۆرە کامەیانن؟ بەڕاستگۆیی وەڵامم بدەنەوە بێ پێچوپەنا.

هەردووکیان تەماشای یەکتریان دەکرد، هەستم دەکرد نەیاندەوێرا قسە بکەن.

ماکوان: کاک وەرزێر فەرموو.

وەرزێر: ڕاستی و بێ درۆ کردن من جۆری دووەمیانم، دەمەوێت ژن بهێنم و ببمە خاوەنی خێزان و وەکو کەسێکی تر تووشی هەڵە نەبم.

ماکوان: سوپاس بۆ ڕاستگۆییەکەت، ئەی تۆ گەنم؟



گەنم: ڕاستی تا تۆم نەناسیبوو منیش وەک وەرزێر بیرم دەکردەوە، دەمویست شوبکەم و ببمە خاوەنی خێزان و منداڵی خۆم و ئاسایی بژیم.

ماکوان: واتا هەردووکتان وا بیرتان دەکردەوە، ماڵ دروست بکەن و هەموو کەرەستەیەکی بۆ بکڕن لە سەلاجە، تەلەفزیۆن، گسک، زۆپا و ...هتد لەگەڵ ئەوانەشدا گەنم تەماشای وەرزێر دەکات کە مادام ماڵی هەیە پێویستە پیاوێکی تێدا بێت، چونکە پێداویستی ماڵە. هەروەها وەرزێر مادام ماڵ دروست دەکات پێویستە چۆن تەلەفزیۆنی هەیە لەگەڵ سەتەلایت، پێویستە ژنێکیشی هەبێت، ئەمە بیرکردنەوە کلاسیکیەکەی کورد و کۆمەڵگەکەمانە، وایە؟

وەرزێر: نا؛ کاک ماکوان بەو شێوەیە نییە، بەڵکو ژنهێنان بۆ من دروست کردنی ژیانێکی نوێیەو بەچاوی کەرەستە تەماشای ژنەکەم ناکەم.

ماکوان: لەڕاستیدا دەزانم کە هەستێکی گەورەتر هەیە لەوەی کە ئێوە سەیری یەکتر بکەن لەشێوەی ئامێر و کەرەسەتدا، قسەکەتان تەواوە بڕوای پێدەکەم ١٠٠٪، بەڵام کە پرەنسیپ نەبوو لە کۆتاییدا وای لێدێت یەکتر وا سەیر بکەن و خۆشەویستی نەمێنێت، تۆ دەڵێیت پیاو دەبێت ژنی هەبێت، گەنمیش دەڵێت ژن هەر دەبێت شو بکات، نە بەناڕاستەوخۆی هەردووکتان دەبنە تەلەفزیۆن، هەموو ماڵێک پێویستە تەلەفزیۆن یان تەباخی تێدا بێت، بەڵام هەستت چۆنە بۆ ئامێرەکان، بۆ ژنومێردایەتیش هەروا دەبێت، کە تەلەفزیۆنەکە سوتا پێت خۆشە تەلەفزیۆنێکی تر دەکڕیت یاخود کۆن بوو دانەیەکی نوێ دەکڕیت، زیاتر دڵت بە تازەکە خۆشە بەڵام کە کۆنەکە لە بیر دەکەیت، چونکە بێ پرەنسیپە، یادگاری لەدوای خۆی جێ ناهێڵێت بەڵکو ناڕەحەتی جێهێشتووە پارەت تێدا سەرف کردووە، بردوتە بۆلای وەستای تەلەفزیۆن لە کۆتاییدا دەڵێت سوپاس بۆ خوا ڕزگار بووم لەدەستی، ئیتر گۆرانی بە باڵای تەلەفزیۆنە تازەکەدا هەڵئەدەیت، نازانم تێگەیشتن یان زیاتر ڕوونی کەمەوە؟

گەنم: من باش لێت تێگەیشتووم.

ماکوان: کاک وەرزێر بێدەنگە.

وەرزێر: هەموو ئەوانەی وتت ١٠٠٪ بڕوام پێیەتی، بەڵام دەمەوێت بڵێم من بڕوام بە خوا و بە دین نییە، گەنم باش دەزانێت بەڵام ڕۆژێک لە ڕۆژان داوایەکی خراپ یان بڕوام بە کاری دوور لە ڕەوشت نەبووە، جا ئەو پرەنسیپەی بەڕێزت باسی دەکەیت من بڕوام پێیەتی، بەڵام بە شێوەی خۆم.

ماکوان: زۆر خۆشحاڵ بووم کە خۆت ئەم قومبەلەیەت تەقاندەوە، کەواتە یان دەبێت کۆنتراکتمان هەبێت یان دەبێت من بەجێبهێڵن و خۆتان بڕیاری خۆتان بدەن، ئەو کات دەبێت بەرپرسیارێتی هەڵبگرن کەچی ڕوودەدات.

گەنم: کاکە خەسرەو تۆ چی دەڵێیت من سەرم لە قسەکانت دەرناچێت.

وەرزێر: کاک خەسرەو من نەهاتووم شەڕی فیکری و جەستەیی بکەم، من دەمەوێت خزمەیاتی بکەم، ئاخر بیروباوەڕ بە درۆکردن دروست نابێت.

ماکوان: بە پێچەوانەوە، لای من تۆ ئێستا ڕێزت لە جاران زیاترە، خۆ ئەگەر هەرچیم بوتایە و تۆ بتوتایە باشە ئەوکات گومانم لێ دەکردیت، ئێستا هیچ گومانێکم لا دروست نەبووە، بەڵام دەکرێت چارەسەر بکرێت، مانای وانییە من بڵێم هەڵسە بڕۆ دەرەوە و کۆتایی بە دانیشتنەکەمان هات، ئێستا من سوپاست دەکەم و پێت دەڵێم کاک وەرزێر دەکرێت من هاوکاریت بکەم بۆ دووبارە دامەزراندنەوەی بیروباوەڕت؟

وەرزێر: چۆن تێناگەم؟

ماکوان: ئاسانە چی وای لێ کردوویت کە بیروباوەڕت بەدین نەبێت باسی بکە یان ئێمەش بڕوا دەکەین و یان بۆ هەر قسەیەکت یان هەر بیروباوەڕێک کە جەنابتان هەتانە لای ئێمە باشتر هەیە و تۆش ئەگەر

بڕوات پێکرد باشەو بڕوات نەکرد ئازادی لە کۆتاییدا من بڕیاری خۆم دەدەم و تۆو گەنمیش بڕیاری خۆتان ئەدەن.

وەرزێر: ئەگەر بڕوام نەهێنا واتا گەنم لەدەست ئەدەم؟

بەدڵنیاییەوە لەدەستی دەدەیت چونکە من خوشکی خۆم نادەم بە کافرو بێباوەڕ، کۆتا بڕیاریش لای گەنم دەبێت.

گەنم: هەروەکو وتم کاکم هەرچی بڵێت لە قسەی دەرناچم.

وەرزێر: من چی بکەم کاک ماکوان، ئاخر خۆ بیروباوەڕ بە زۆر نییە.

ماکوان: وەرزێر گیان سەری دنیات لێ نەیەتەوە یەک، پێم بڵێ بۆ بڕوات نییە؟ ئاخر خۆ تۆ ئەوەندەی (ڕۆجیا گارودی) بێدین نیت کە سکرتێری حزبی کۆمەنیستی فەڕەنسی بوو، پاشان بوو بە موسڵمان یان هێندەی (ئیحسان طەبەری) کافر نەبوویت، ئەویش سەرۆکی حیزبی کۆمەنیستی تودەی ئێران بوو پاشان موسڵمان بوو، بڕوام نییە تۆ ئەوەندە فەیلەسوف بیت.

وەرزێر: جا نازانم کاک ماکوان لەکوێوە دەست پێ بکەم، من بە درێژایی دە ساڵ زیاترە کە بیروباوەڕی خۆم داڕشتووە، دەترسم هەرچی بڵێم یان تورە بیت یان جێگای قبوڵ کردن نەبێت.

ماکوان: من نامەویت ئێستا دەست پێ بکەیت، وەکو ئەوەیە کە بیروباوەڕی خۆت بە چ شێوەک دەرببڕیت لای منەوە ئازادی و تورە بوون لە من نابینیت، ئێستا کاتی نییە دەڕۆین هەرسێکمان کەباب دەخۆین و تا ماوەیەک کات وەربگرە، دوای ئەوە قسە دەکەین و دانیشتنمان دەبێت.

چووین بۆ کەباب خواردن لەدواییدا ماڵاوایم لە وەرزێر کرد و بڕیاری پێکەوە دانیشتنمان داو کات و جێگامان دەست نیشان کرد کە لە میوانخانەی سلێمانی پالاس دانبنیشین و باسەکانمان بکەین.

گەنم ناردەوە بۆ ماڵەوە خۆشم گەڕامەوە بۆ نووسینگە و چاوەڕێی دوکتۆر چالاک بووم کە تەلەفۆنم بۆ بکات، تا کاتژمێر چواری ئێوارە تەلەفۆنی نەکرد، ناچار من پەیوەندیم پێوە کرد، دوای هەواڵپرسین وتم جەنابی دوکتۆر وا بڕیار نەبوو بەیەکەوە بڕۆین بۆ وەڵامی پشکنینەکان؟ جەنابت دیار نەبوویت.

د. چالاک: ببورە کاک ماکوان من بیرم نەکردەوە، بەڵام ئاگاداریان کردمەوە کە ئەوەی جەنابت هیچی تێدا نییە، ئەوەی سرەو خانم نەخۆشییەکەی تا ڕادەیەک ترسناکە و دەبێت نەشتەرگەری بۆ بکەین و گرێیەی لە مێشکیدا دروست بووە دەبێ لاببرێت، نیازم بوو کاتژمێر ١٦:٣٠ تەلەفۆنت بۆ بکەم تا کاتژمێر پێنج بڕۆین بەدوای ماڵی سرەو دا کە لەگەڵ باوک و براو سروەی خوشکی دێن بۆ ئێرە و بەیەکەوە بیانبەین بۆ باخەکە لە زرگوێز.

ماکوان: خێرا ڕازی بوون؟ وەڵڵا پێم خۆشە، جا من لەخزمەتام بەڵام خۆ جێگای من نابێتەوە لە سەیارەکە، من ئیتر بۆ کوی بێم هەر جێگای ئەوان دەبێتەوە.

د. چالاک: ویستم بە هاوڕێکەت بڵێیت هاوکاریمان بکات، من بەیانی زوو قسەم لەگەڵ کردن، کەلوپەلیان زۆر پێیە، سەیارەی تایبەت لە دەربەندیخانەوە هێناونی، هەرچەندە بە شۆفێرەکەم وت بڕوات بۆ زرگوێز بەڵام ڕازی نەبوو، نەمزانی هۆکار چییە ئەگەر هاوکاریم بکەیت زۆر باش دەبێت، خۆ ئەگەر هەر نەبوو سەیارەیەکی تر دەگرم بەکرێ، بەڵام پێم خۆشە لەگەڵما بیت.

ماکوان: بەسەرچاو ئێستا تەلەفۆن بۆ نەبەز دەکەم یان پێشڕەو بزانم کامیان دەستیان بەتاڵە و لەوێ یەکتر ببینین؟

د. چالاک: وەرە بۆ گەراجی دەربەندیخان منیش دەڕۆم بۆ ئەوێ.

ماکوان: باشە!

تەلەفۆنم کرد بۆ نەبەز خێرا بە دەممەوە هات و چوین بۆ گەراج و لەوێ چاوەڕێمان کردن تا هاتن و لەدواییدا ئەوانمان برد بۆ باخەکەی زڕگوێز و بەرەو سلێمانی گەڕاینەوە. لەگەڕانەوەدا لەگەڵ نەبەز لە هەمان جێگای پێشوو مامە پیرەکەمان بینییەوە، بەردی کەڵەکە دەکرد، نەبەز وتی بڕۆ بۆلای ئەو پیاوە (خەیری زینەیە) منیش دەستم کرد بە پێکەنین، چوومە خزمەتی وتم یا شیخ السلام علیکم!

شێخ عەبدولڕەحمان: وعلیکم السلام، من ماندوو بووم ئەزانم تۆ ماندوت حەساوەتەوە، کارێکی باشت کرد، ئەو کچەت پشت گوێ نەخست، مادام قەدەری تۆی هەڵگرتووە، هاوکاری تەواوی بکە، پاشان ئاگادار بە کارێکی زۆر گەورەت لەبەردەمدایە، هەوڵ بدە جوان ئەنجامی بدە، پەلەی لێ مەکەو بەوردی لەگەڵیدا بڕۆ، نەبەزی هاوڕێشت خەریکە ڕێزی پیاوچاکان دەگرێت، پێی بڵێ شێخ عەبدولڕەحمان سڵاوی لێت دەکرد، بڕۆ پرسیار مەکە ماندوو بووم.

ماکوان: باشە شێخ خوات لەگەڵ، هیچت پێویست نییە؟

شێخ عەبدولڕەحمان: دوعای خێرم بۆ بکە، منیش دوعای خێرت بۆ دەکەم.

ماکوان: خوای پەروەردگار لێمان خۆش بێت.

ماڵاوایم لێکرد لەنزیک چوونە ناو شار ئازار خان تەلەفۆنی بۆ کردم، داوای کرد کە بەیانی سەردانم بکات لە نووسینگە، منیش خۆشحاڵی خۆمم دەربڕی و لەگەڵ ئەویش ماڵاوایم کرد.

لەناو شاردا نەبەز دەگەڕا بۆ جێگایەک کە پشوو بدەین، هیوا ڕەش تەلەفۆنی کرد وتی سورەی برام سەردارم دۆزیوەتەوە و قسەم لەگەڵ کردووە، بەڵام باسی هیچم نەکردووە، هەر وتم خەسرەو لە ئەوروپا هاتۆتەوە و حەزی کردووە بتبینێت و سەردانی هەموومانی کردووە.

ماکوان: لە سلێمانییە یان لە هەولێر؟



هیوا: له هەولێره و لەوێ دەوام دەکات، ناونیشان و هەموو شتێکم لێوەرگرتووه بێخەم به.

ماکوان: دەست خۆش ئەی تۆ لەکوێیت؟ ئێمە لەبازاڕین من ونەبەز.

هیوا ڕەش: ئێوه ئیسراحەتی خۆتان وەربگرن من نانم خواردووه، قسه دەکەینەوه.

ماڵاوایم له هیوا کرد و بیرم لەوه دەکردەوه بڕۆم بۆ هەولێر بۆلای سەردار، شەو لەگەڵ نەبەز جیا بوومەوه و هاتمەوه بۆ ماڵەوه، سەرقاڵی خوێندنەوه بووم به کتێبی ڕەخنه ئامیز لەسەر ئایینی مەسیحی، وتم حەمەن شێخ عەبدولڕەحمان ئاماژەی به کاره گرنگەکه کردووه مەبەستی ئازار خانه که بووه به مەسیحی، شەو پێش نوستن تەلەفۆنم کرد بۆ شێرکۆ و هەواڵم پرسی، وەعدم دایه که بیبەم بۆ جێگایەکی خۆش، کەچی وتی باوکه منیش لەگەڵ خۆت بەره بۆ ئەوروپا.

ماکوان: ئاخر کوڕم خۆ ناتوانم بتخەمه ناو جانتاکەم، ئەمه هەمووی ڕۆتیناتی دەوێت و دەبێت موعامەلەت بۆ بکەم.

لەگەڵ ئەویش کۆتایم پێهێنا و پاشان تەلەفۆنم کرد بۆ گەنم، دوای هەواڵ پرسین ئەویش دایخستەوه و تەلەفۆنم کرد بۆ خێزانم و لەگەڵ ئانای کچم قسەم کرد، له بیری ئەوەدا بووم که چۆن به خێزانم بڵێم کوڕێکم هەیه، بەڵام نەمدرکاند، هەرچەند دەمزانی وتنی زۆر سەختە، بەڵام دەشموت خۆ هەر دەبێت بۆی باس بکەم، باشتر وایه بگەڕێمەوه و ڕووبەڕوو بۆی باس بکەم به تەلەفۆن نابێت، ناشکرێت من کوڕێکم هەبێت و سەروەری بەلوعه بەخێوی بکات و بەپێی ڕەوشتی خۆی فێری ڕەوشتی بکات و تاڤانه ڕەشیش دایکی بێت! ئینجا لەخەمی ئەوەدا بووم هەر بیرم له شێرکۆ دەکردەوه.

وەکو ڕۆژانی ئاسایی چووم بۆ نووسینگە و لەکاتژمێر ٢ی دوا نیوەڕۆ ئازار تەلەفۆنی کرد کە گوایە لە نووسینگەم، وەڵامم دایەوە کە لەوێم و چاوەڕێی ئەو دەکەم.

ئازار: کاک ماکوان، خەجیج و سازانم لەگەڵدایە خۆ ئاساییە ئەوانیش بێن؟

ماکوان: ئەی کوا گەلا ئەویشتان بهێنایە لەگەڵ خۆتان.

هەر بۆ خۆشی وام وت دەزانم گەلا سەرقاڵی شوکردنە، نوخشە بێت لە جەنابت، خۆت و خەجیج خان و سازان خانیش بەخێر بێن، بفەرموون چاوەڕێتان دەکەم، یەک دوو کەسی لێ بوو لە نووسینگە داوام لێکردن کە کێشەیەک هەیە سێ ئافرەت دێن بۆ ئێرە بەجێمان بهێڵن. ئەوانیش کاتێک کە ئافرەتەکان هاتن ماڵاواییان کرد و ڕۆشتن، بە گەرمی بەخێرهاتنم کردن و چام بانگ کرد و ئاوم بۆ دانان، هەستم دەکرد لایان سەیر بوو نەمدەزانی بۆچی لایان سەیرە، ئایا لەبەر کەسایەتی من لایان سەیر بوو یان لەمنیان ڕانەدەبینی کە بەو شێوەیە خزمەتیان بکەم.

ئازار: کاک ماکوان ئەمڕۆ بە شەوق و خۆشحاڵییەوە دەتبینم، چی ڕوویداوە؟ ڕۆژانی ڕابردوو زۆر خەمبار بوویت، ئەمڕۆ لەو ڕۆژانە ناچێت کە تۆم ناسیوە؟

ماکوان: بڵێم چی ئازاری خوشکم، پێدەچێت خۆشحاڵی گەلا و دلاوەر بێت بە ڕوومەوە دیار بێت.

نەمویست پێیان بڵێم کە من نەخۆش نیم، لەبەر دڵی ئەوان و ئیحتیرامی ئەو سێ ئافرەتەم زۆر لابوو، هەرسێکیان نەخۆش بوون زۆر زیاتر لە پێویست ڕێزم لێیان گرت.

خەجیج: کاک ماکوان بە قسەکانت زۆر خۆشحاڵ بووم ئەو شەوە، بەڵام هەرچەندە لێیان تێکداین، نازانم کاک ئەنوەر لە ئێرەیدا بوو یان پەیوەندی بە بیروباوەڕەوە بوو، جا هەمووومان دەزانین کە هەڵە لە جەنابت نەبوو



لە کاک ئەنوەر بوو، ئێستا ئەو بڕیاری داوە نەیەتەوە بۆ ناو کۆبونەوەکان، من دەزانم جەنابت پیاوێکی بەڕێزی و قسەی ئەم خوشکانەی خۆت ناشکێنیت و داوات لێدەکەین تۆ خۆت بڕۆیت بە شوێنیادا ڕۆژی سێ شەممە بیهێنیت، کوڕێکی باشە بەڵام ڕاستی دەردی زۆرە.

ماکوان: خەجیج خانی بەڕێز هەموو پیاوێک لەم دنیایە ٤ ئافرەتی پێویستە (ئاگام لێیان بوو هەموویان مۆڕەیان لێ دەکردم).

ئافرەتی یەکەم: دایکە کە ئەوەی دەبێت بە پیاو لەباوەشی ئەو دایکەوە پیاوەتی بۆ دروست ببێت.

ئافرەتی دووەم: خوشکە کە سەنەدی گەورە و پاڵپشتی پیاوە یاخود برایە، دوعای خوشک هیچی کەمتر نییە لە لە دوعای دایک.

ئافرەتی سێیەم: هاوسەرە، کە خۆشەویستی و جێگای ئارامی پیاوە کە فێری بەرپرسیارێتی و ژیانی دەکات.

ئافرەتی چوارەم: ئەو کچەیە کە منداڵتە و دیاریەکی خواییە و کلیلی دەرگای بەهەشتە.

ئەم چوار ئافرەتە لە مەبدەئی مندا زۆر گرنگە، ئەگەر مرۆڤ لەم چوارە لە هەریەکێکیان بێبەش بێت کەواتە نوقسانە و تەواو نییە و کامڵ نابێت، بەڵام لەوەتەی ئێوەی بەڕێزم ناسیوە ئێوە بوونەتە کە پێنجەم لە ئافرەتان کە دەبێت پیاو هاوڕێی وەکو ئێوەو مانانی هەبێت تا پیاوەتی و شکۆمەندی تەواو بێت، نەک قسەتان ناشکێنم بەڵکو من وەک سەربازێک بۆ فەرماندەکەی گوێرایەڵتان دەبم و خوشکایەتیتان لەسەر چاوو لەسەر سەرم، ئێوە چی دەڵێن من وا دەکەم، هیوادارم دڵم ڕازی کردبن، بۆ زانیاریتان من ئەوەی لە دڵمایە لە سەر زمانیشمە وا نەزانن تەنها موجامەلەیە، بەڵکو زۆر بەڕاستمە.

سازان: پیاوی وەکو بەڕێزتان زۆر دەگمەنە لەم ڕۆژەدا کاک ماکوان، کە هاوڕێیەتی ئافرەت قبوڵ بکات.



ماکوان: یەکجار وانییە سازەی خوشکم، ئەم دنیایە پڕە لە پیاو، دەشێت زۆر لەمن باشتر و چاکتر و ئاقڵتریش هەر زۆر زۆر هەبێت.

ئازار: پێش ئەوەی بێین بۆ ئێرە باسمان دەکردیت کە هیچمان لە ژیانماندا بۆلای هیچ پیاوێک نەڕۆشتوین بەو شێوە ئەمن و ئاسایشەی کە لەلای تۆ هەیە، ئێمەی ئافرەت پیاوان لامان یەک ڕستەی چەند وشەین خێرا بە چاوتاندا دەتان خوێنینەوە.

دەستم کرد بە پێکەنین و وتم: ئازاری خوشکم هەر زۆر بچووکت کردینەوە، ڕستەی چەند وشەیی؟ هیچ نەبوایە بتوتایە کتێبێکن.

خەجیج : ئازار ڕاست دەکات، تەنانەت ئێمە دەتوانین جیاوازی لەنێوانی هەریەک لە پیاوانی ناو باخەکە بکەین بە خودی دوکتۆریشەوە.

ماکوان: ئەوە چییە کە ئەوەندە زانای کردوون ئاوا بەخێرایی پیاو بناسن؟ با منیش لە ئێوەوە فێر بم.

خەجیج: ماکوان گیان (لە تەمەندا زۆر لەمن گەورەتر بوو) بەچاوی خوشکی گەورەی خۆت سەیری پیاو بکەیت زۆر زوو دەیناسیت تەماشای ئێستامان مەکە نەخۆشین، ڕۆژانێک بوو ئێمە خاوەن دڵ و گەنجێتی و لەش ساغی بووین، زۆر دەگمەنە پیاوان بەچاوی شەهوەتەوە سەیری ئافرەت نەکەن لەیەکەم چرکە ساتەوە.

ماکوان: ئەی ئاساییە پیاو ئەو هەستەی هەبێت بۆ ڕەگەزی بەرانبەر، بەڵام من مەبەستەکە تێناگەم ئەگەر پیاوێک پیاو بێت دەبێت هەر شەهوەتی بۆ ئافرەت بێت، ئەی خۆ ناکرێت پیاو حەز لە پیاو بکات بە چاوی شەهوەت تەماشای یەکتری بکەن.

خەجیج: نا؛ کاک ماکوان زۆر هەڵە تێگەیشتی، لێرەدا باسی مرۆڤ بوون دەکەین، بۆلای تۆ ئارامین؟ چونکە چاوی شەهوەتت لەسەر ئێمە نییە، بەڵکو بە چاوی مرۆڤ بوون سەیرمان دەکەیت، وەکو خوشک و هاوڕێ و کەسوکارت تەماشامان دەکەیت.



ماکوان: واتا ئێوە ژنان یەکسەر ڕاستەوخۆ دەزانن پیاو چۆن تەماشاتان دەکات؟

خەجیج: بەدڵنیاییەوە، ڕاستەوخۆ بە چاویا دیارە و دەزانین کە چ جۆرە پیاوێکە.

ماکوان: هەر تۆ وایت یان هەموو ئافرەتان بەگشتی وان؟

خەجیج: بەدڵنیاییەوە هەرچی ئافرەتە ئەوە دەزانێت، من بەناوی هەموویان دەتوانم پێت بڵێم، بەڵی هەموو ئافرەتان بەگشتی وان بە من و ئازار و سازان و خێزانت و دایکت و دایکی ئێمە و هەموو ئافرەتان باش ئەوە دەزانن.

ماکوان: کەواتە قسەکەی ئازار ١٠٠٪ وایە، ئێمەی پیاو ڕستەیەکی چەند وشەیین.

ئازار: ببورە کاک ماکوان پێت ناخۆش بوو وام وت؟

ماکوان: نەبەخوا ئازاری بەڕێز سوێند بەخوا قسەکەتم زۆر لا جوان بوو، پاشان خوێندنەوەت زۆر بە جورئەت بوو، بۆیە نەک پێم ناخۆش نەبوو خۆشحاڵت کردم، بەڵام دەمەوێت مادام ئێوە پێوانە کاری دەکەن هەر لەدەمی خۆتانەوە بە ئینسافەوە خۆتان بناسێنن.

ئازار و خەجیج هەردووکیان ویستیان قسە بکەن، ئازار فەرمووی لە خەجیج کرد بەڵام خەجیج وتی نا سەرەتا تۆ قسە بکە، بۆیە ئازار دەستی کرد بە قسە و وتی: تۆ لەم بوارە کارت زۆر لەگەڵ ئافرەتان کردووە، دوایش من هاوکاریت بکەم، خۆت دەزانی کاک ماکوان ڕۆژنامەنووس و ئەدیبە دەیەوێت ئینتەرڤیومان بکات (هەموو دەستمان کرد بە پێکەنین)

ئازار: لێرەدا ئەوەی من دەیزانم و مامەڵەم لەگەڵ ئافرەتدا کردووە بۆت باس دەکەم، ئافرەت کائینێکی زۆر تۆڵە سێنەرەوەیە، بەدوای تۆڵەدا دەگەڕێت، ئافرەت لەگەڵ ئافرەت ڕەحم بەیەکتری ناکەن وەکو پیاو نین،




پیاو لایەنی ڕەحم و بەزەییان ئەگەر چی لەچاو ژن کەمترە بەڵام لەبەرانبەر یەکتریدا بەکاری دەهێنن، هیچ نەبێت پیاو خاوەنی غیرەت و پیاوەتی و چاکە کردنن لەگەڵ یەکتریدا، هەندێک پرنسیپیان هەیە وەکو شەرەفمەندێتی، بەوەفایی، لێبوردەیی و زۆری تر لەم خاسێتانە، ئافرەتیش بەهەمان شێوەی پیاو ئەم سیفاتانەی هەیە، بەڵام لایەنی سۆزداری و خۆشەویستی بەهێزترە لە پیاو و کەمتر بەکاریان دەهێنن، پیاو زیاتر لایەنی ئەقڵی بەکار دەهێنن، وەکو دەڵێن عەیبە بۆ پیاو مافی هاوڕێکەی یاخود دراوسێ دوکانەکەی یان هاوپیشەکەی بخوات یان زەوتی بکات. هەڵبەت ڕوو ئەدات لەنێوانی پیاوانیشدا کەمترە، بەڵام لەناو ئافرەتاندا یەکجار زۆرە.

ماکوان: کوا ئەو هەموو کوشت و کوشتار و خوێن ڕشتن و زوڵمە دەکرێت هەمووی پیاوان دەیکەن، بۆ ئەمڕۆ واتان لەمن کرد بەرگری لەژنان بکەم و ئێوەی ژنیش بەرگری لە تیمەی پیاو بکەن، ئەم هاوکێشەیەتان بۆ وا پێچەوانە کردۆتەوە؟

ئازار: کاک ماکوان پەلە مەکە بۆت ڕوون دەکەمەوە، کێشە لە چاک و خراپدا نییە، کە کێ باشە و کێش خراپ. لەهەردوو ڕەگەز چاک و خراپ هەیە، باسی بواری دەروونی ئافرەتت بۆ دەکەم، ئافرەت شوو دەکات بە پیاوێک کە هاوسەری هەیە، گوێ نادات بەوەی کە پیاوێک لەگەڵ ئافرەتێکی تر بەش دەکات، یان ئەگەر ئافرەت ڕازی نەبێت بە خیانەت کردن هیچ پیاوێک ناتوانێت خیانەت بکات، هەڵبەت مەبەستم دەستدرێژی نییە ئەوەیان دەچێتە باسێکی ترەوە، بەڵام مەبەستم ئەو ئافرەتەیە کە پیاوی هەیە و خیانەت دەکات، ئافرەت زۆر لە پیاو دڕندە ترە، بەڵام بەشێوەیەکی ناسک لەبەرگی ئافرەت، ئافرەت دەتوانێت خێزان تێک بدات، کۆمەڵگە تێک بدات، و شارو وڵاتیش وێران بکات.

ماکوان: ئازاری خوشکم ئەو تێڕوانینەی جەنابتان زۆر دورە لە تێڕوانینی من (کاتی ئەوەبوو کە بزمار بدەم لە تابوتی ئازار)، چونکە تۆ لەوانەیە





لەناو سالاریەتی نێرینەدا چاوت کرابێتەوە، بۆ نموونە لە ئایینی مەسیحی دا ژن ڕۆڵێکی ئەوتۆی نییە، هەموو شتێک لای نێرینەکەیە، لە ئایینی مەسیحی دا زۆر بە کەمی گرنگی بە ئافرەت دەدەن، تەنانەت خودی (عەزراء) کە (خاتوو مەریەمی دایکی عیسایە سەلامی خوای لە هەردووکیان بێت) ناوی زۆر کەم هاتووە لە ئینجیل دا، لە مەرکۆس و یوحەنا دا ناوی نەهێنراوە، تەنها لە مەتا و لوقادا ناوی هاتووە زۆر بەکەمی لە پەراوێزدا، تەماشای ئایینەکە بکە هەمووی لەسەر نێرینەیی دامەزراوە هەرباسی خودی خوای پەروەردگار بە پیاو و باوک و نێرینەیە، ئەمە لەکاتێکدا لە ئیسلامدا پێچەوانەیە، خوا بەهیچ ڕەگەزێک ناشوبهێنرێت و خاتوو مەریەمیش میحوەری سەرەکییە لەگەڵ دایکی مەریم دا، بێجگە هەموو ئەمانە ئیسلام ڕۆڵی ئافرەتی زۆر بەرز نرخاندووە، نموونەی دایک و خوشک و کچ، بەهەشت لە ژێر پێی دایکاندایە، ڕێزی دایک زۆر زیاترە لە باوک و...هتد.

ئازار: کاک ماکوان من خوێندنەوەم بۆ ئافرەتە لەسەر بنەمای دینی مەسیحی یان ئیسلام نییە، بەڵکو بە چاوێکی زانستی و دەروون ناسییەوە تەماشای واقیعەکە و ناخی ڕەگەزی مێینە دەکەم.

ماکوان: بڕوا بکە من ئەو خوێندنەوەیەی جەنابت لام قبوڵ نییە، لەگەڵ حورمەتم بۆ ئێوەی بەڕێز.

خەجیج: با من باسێکت بۆ بگێڕمەوە کاک ماکوان، حەز دەکەم بزانیت من خەڵکی ئەو دەڤەرەی لای ئێوە نیم.

ماکوان: دیاربوو بەلەهجەکەتدا بەڵام حەزم نەکرد پرسیارت لێ بکەم.

خەجیج: من خەڵکی ڕۆژهەڵاتم، لەگەڵ کوڕێک دڵمان چوو بەیەکدا و حەزمان لەیەکتری بوو، هاتە داوام لەبەر ئەوەی کوڕەکە هەژار بوو ئێمەش لە ئاغاکانی ناوچەی خۆمان بووین باوکم ڕازی نەبوو، لەگەڵ کوڕەکە پلانمان داڕشت کە هەڵبێین بۆ باشور، بڕیارەکەمان جێبەجێ کرد، هەرچی



پارەو شتمان پێ بوو خەرجمان کرد، بیهرادی خۆشەویستم کرێکاری دەکرد، لە ڕاستیدا چونکە منی خۆش دەویست هێز وبازووی دە ئەوەندەی تر بەهێز بوبوو، منیش بە نان و ئاوی بیهراد ڕازی بووم.

پاش ماوەیەک لەبەر بەهێزی و لەشجوانی بیهراد بوو بە پاسەوانی بەرپرسێک، زۆر خۆشحاڵ بووین هەردووکمان پارەی مانگانەکەی زۆر باش بوو، ١٥ ڕۆژ لە ماڵ بوو ١٥ ڕۆژیش لەدەوام، ساڵی ٢٠٠٠ لە ڕێگای کەرکوک-بەغداد لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی کەوتنە کەمین و کوژران، وتم تەواو ژیانم کۆتایی هات دوای بیهراد. وەڵامم ناردەوە بۆ دایکم و خوشکەکانم وتم مێردەکەم مردووە، دایکم پارەی بۆ ناردم کە نەگەڕێمەوە، چونکە باوک و براکانم دەمکوژن، بڕوا بکە کاک ماکوان هیچ کارێکی هەڵەم نەکردبوو، تەنها بیهرادم خۆش دەویست و شوم پێکرد.

بەهەرحاڵ ماوەیەکی پێچوو منیش بەرپرسەکەی بیهرادم نەدیبوو هات پارەی بۆ هێنام و سەرخۆشی لێکردم، پیاوێکی بەڕێز و مەعقول دیار بوو، دیار بوو زیرەک و بەتواناش بوو، زۆر باسەکەت بۆ درێژ ناکەمەوە منو جوتیاری بەرپرسی بیهراد ڕێکەوتین بۆ زەواج، داوای لێکردم کە شوی پێبەکەم، منیش داوام کرد بەو مەرجە شوت پێدەکەم کە هاوسەری یەکەمت تەڵاق بدەیت و واز لە منداڵەکانت بهێنیت.

ماکوان: چەند مندالی هەبوو؟

خەجیج: دوو منداڵی هەبوو، کوڕێک و کچێک، وازم پێ لێهێنان، ژنەکەم پێ تەڵاق دا، منداڵەکانم لێکرد. ژنەکەی بەهۆکاری ئەوەی من شوم پێ کرد خۆی سووتاند و هەموو دەموچاوی تێکچوو.

ماکوان: شوکر نەمرد؟

خەجیج: نا نەمرد، من دەزانم هەموو ساتێکی مەرگێکە، لەدوای ئەوەی من تووشی ئەم نەخۆشییە بووم، جوتیار چوو ژنی تری هێناو منی پشت گوێ خستووە.



ماکوان: جیابوەوە لێت؟

خەجیج: نا، بەڵام بەمانگ یەکتر نابینین و تەلەفۆنیشم بۆ ناکات، ئەوەی کە ئێستا بەسەرم هاتووە هەموو تاوانی خۆمە.

ماکوان: وانییە، ڕاستە تاوانێکی گەورەت کردووە، بەڵام خوای گەورە ئەگەر تۆڵەشت لێ بکاتەوە بۆ پاکبوونەوەتە، ئەی باشە خۆ ئەگەر تاوانێکت کردبێت، ئەی ئازار و سازان چی ئەوان بۆ نەخۆش کەوتون؟

خەجیج: با خۆیان وەڵام بدەنەوە.

ئازار: منیش دان بەتاوانی خۆمدا دەنێم، لە زانکۆ لەگەڵ کوڕێکدا یەکترمان ناسی و زۆر یەکترمان خۆش دەویست، زیاتر ناچمە ناو قوڵایی باسەکە لەپاشان کوڕێکی تر بە دەساڵ لەو کوڕە گەورەتر بوو کە پێشتر یەکترمان خۆش دەویست لەبەر سەروەت و سامانەکەی من وازم لەو کەسە هێناو ڕازی بووم شوو بەم پیاوە دەوڵەمەندە بکەم، خۆشەویستەکەم ناوی ئەحمەد بوو لەداخا سەری خۆی هەڵگرت و ڕۆشت کەس نازانێت لەکوێیە، پاشان پیاوە دەوڵەمەندەکە ئاڵتونی زۆر و سەیارەی بۆ کڕیم، کە تووشی ئەم نەخۆشییە بووم وازی لێهێنام.

ماکوان: سەیرە، ئەی سازان تۆ هیچ شتێک، کۆمێنتێکت هەیە.

سازان بەقوڕگی پڕ لەگریانەوە وتی: تاوانی من لەهەموویان گەورەترە من وەکو هەموو کچانی تر ئارەزووم بوو شو بکەم بە کوڕێکی ئامۆزام بەڵام ئەو منی نەدەویست، لەپڕ براکەی هاتە داوام، منیش بۆ ئەوەی سزای ئەو بدەم شوم کرد بە براکەی، ماڵی مامم زۆر گەورە بوو، چوار ماڵی تێدا دەژیان واتا چوار خێزانی جیاواز بوون، ماڵی ئێمەو خوشکی مێردەکەم و ماڵی مامم و ئەو برایەی کە من حەزم لێدەکرد پێشتر هەموومان لەیەك حەوشەدا بووین و خانوەکانمان جیا بوو، بەڵام من ژیانم لەهەموویان تێکدا لەبەرخاتری خۆم و لەکۆتاییدا خوای گەورە تۆڵەی لێسەندمەوە.

ماکوان: بۆ چیت کرد؟



سازان: هەمیشە لە فیتنەی و دوو ڕوویی و ئاژاوە نانەوەدا بووم، وەکو شەیتان لەنێوانی ئامۆژنم و مامم، هاوسەرەکەم و براکەی و خوشکەکەی و مێردەکەی شەڕم دروست دەکرد، لەبەرچاویان وا خۆم نیشان دەدا کە پەیوەندیم هەیە لەگەڵ مێردی دشەکەم، تا لە یەکم جیاکردنەوە.

پاشان ئەو ئامۆزایەم کە پێشتر حەزم لێی بوو شوی پێبکەم کێشەم دروست کرد ئەویش ژنەکەی تەڵاق دا.

خەریک بوو هەرسێکیان بکەمە دەرەوە، بەڵام نەمدەزانی چی بکەم، ئەوان دەردە دڵ و پۆخڵەواتی خۆیان بۆ من باس کرد، من سەرم داخستبوو، وەڵامم پێنەبوو بۆ قسەکانیان. بەهەرحاڵ پێم وتن من دەتوانم چیتان بۆ بکەم؟ چیم پێدەکرێت و بۆچی هاتوون بۆلام، بەڵام بە شێوەیەکی زۆر نەرم و برایانە پێم وتن.

خەجیج: من هیچ کەسم نییە، پێویستم بەکەسایەتی تۆیە، چی بکەم تا خوا لێم خۆش بێت، پارەشم زۆرە تۆ چی بڵێیت لەقسەت دەرناچم.

ئازار: منیش دەزانم مەرگم نزیکە ئەگەر ژیانێکی تر هەبێت حەزدەکەم لەگەڵ کاک ماکواندا بم.

سازان: من دنیام لەدەست چوو، هاتووم بۆ ئەوەی هاوکاریم بکەیت قیامەتم لەدەست دەرنەچێت.

ماکوان: لەڕاستیدا چوار وشەم هەیە بۆتان، لەبەری بکەن بۆ ئەوەی وشەی پێنجەم لەدایک بێت ئەگەر دەکرێت فێری ئەم چوار وشەیە بن

یەکەم: هەڵەم.

دووەم: ببورە.

سێیەم: سوپاس.

چوارەم: خۆشم دەوێیت.



ئەم چوار وشەیە ئەتانگەیەنێتە بەردەرگای وشەی تەوبە، خۆی لەڕاستیدا ئێوە درەنگ کەوتوون هەموو لەسەر لێواری مەرگین دەبێت فریای خۆمان بکەوین، بڕۆن لەبەردەرگای پەروەردگار داوای لێخۆش بوون بکەن، بەڵکو خوای گەورە ڕەحمتان پێ بکات، کاتەکەتان زۆری نەماوە فریا بکەون.



## هەڵەم، ببورە، سوپاست دەکەم، خۆشم دەوێیت

لە نووسینگە گوێم گرت لە کورتە چیرۆکی ژیانی خەجیج و ئازار و سازان، تووشی شۆک بووم، بەڵام ویستم دان بەخۆمدا بگرم، گۆڕانکاری تەواو بکەم لەژیانی ئەو ئافرەتانەدا، لەکاتێکدا هەرسێکیان سەرەیان گرتووە بۆ مەرگ، خۆشیان باش دەزانن کە دەمرن، بەڵام دیار بوو زۆر دەترسان لەدوای مردن، بۆیە پەنایان بۆلای من هێنابوو کە ڕێگایان نیشان بدەم، دەبوو ئەمانەتەکە بە باشترین شێوە بپارێزم.

بۆیە داوام لێکردن کە چوار وشە فێر بن بۆ تۆبە کردن و گەڕانەوە بۆلای خوای گەورە، بۆم باسکردن کە هەمیشە چاو کوێر نابێت، بەڵکو دڵ کوێر دەبێت، ئێوە زۆر شتتان لەدەست داوە یان بابڵێم مردووە، ئەقڵتان نەماوە و گوێکانتان نابیستێت، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَاۖ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ ﴿٤٦﴾﴾ الحج

واتە: ئایا ئەم کافرانەی مەککەش بەسەر زەویدا نەگەڕاون تا ئەم شتانە بە چاوی خۆیان ببینن و دڵیان هەبێ تا بە دڵیان تێبگەن یاخود گوێیان هەبێت و شتی پێ ببیستن، بەڵام چاو کوێر و نابینا نابێت، بەڵکو ئەو دڵەی کە لە سنگدایە کوێرەو حەقیقەت و ڕاستییەکان نابینێت.

بەهەرحاڵ کاتی ئەوەمان نەماوە کەچی باسبکەین و چی باس نەکەین یان لەگەڵ ڕێزم بۆ ئازار باوەکو مەسیحی نەبین باسی تاوانی خۆمان بکەین و بەناوی ئیعتیراف و دانپیانان، پاشان باسی تاوانەکانمان وەکو تیر یان فیشەک بدەینە دەستی خەڵکی و دوایی پێوەمان بنێتەوە، ئیتر ئەگەر بە قسەی من دەکەن هیچ کات باسی تاوانەکانتان مەکەن، بەڵکو بڕۆن بۆلای

خوای موتەعال دەرگاری کراوەیە، کاتی دیاری کراو بۆ کەس دانانێت، گوێ بۆ هەموو کەس دەگرێت و ئاگادارە بەسەر هەمووانەوە، تەنها ئەو لە هەموو تاوانێک خۆش دەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾﴾ الزمر

واتە: بێئومێد نەبوون لە ڕەحمەتی خوا، ئیبنو عەباس دەفەرموێت: کەسانێك لە هاوبەش بڕیاردەران خەڵکیان کوشتبوو بە زۆری، زینایان کردبوو بە زۆری، هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتیان: ئەی محمد ﷺ ئەوەی تۆ دەیڵێیت و بانگەوازی بۆ دەکەیت شتێکی چاکە بەڵام پێمان بڵێ: ئایا ئەو تاوانانەی کە پێشتر کردوومانە دەسڕێتەوەو خوا لێمان خۆش دەبێت؟ خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی: ئەی محمد ﷺ بەو بەندانەم بڵێ کە ئیسراف و زیادڕەویان کردووە لە تاوان و سەرپێچیدا: بێئومێد نەبن لە ڕەحمەتی خوا، بەدڵنیایی خوای گەورە لە هەموو تاوانێك خۆش ئەبێ تەنها شەریك دانان نەبێت بۆی ئیتر لە هەموو تاوانێکی تر خۆش ئەبێت، (ئەمە ئومێدبەخشترین ئایەتە لە کتابی خوای گەورە، و صەحابە زۆر دڵیان پێی خۆش بووە)، (ئەم ئایەتە بانگکردنی سەرجەم کافران و تاوانبارانە بۆ تەوبە کردن و گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە، ئەوەی تەوبە بکات چەندێك تاوانی زۆر بێت خوای گەورە لێی خۆش دەبێت، وەکو ئەو کەسەی کە سەد کەسی کوشت و تەوبەی کردو خوای گەورە لێی خۆش بوو)، ئیبن عەباس دەفەرموێت: (هەرکەسێك لە پاش ئەم ئایەتە خەڵکی بێئومێد بکات لە تەوبە ئەوا باوەڕی بە قورئانی پیرۆز نییە)، بە دڵنیایی خوای گەورە زۆر لێخۆشبوو بەڕەحم و بەزەییە.

بڕۆن خۆتان بە ئاو پاک بکەنەوە و دەستنوێژ بگرن و دڵودەروونتان پاک بکەنەوە و بڕۆنە سەر بەرماڵ و بڵێن:



خوایە گیان هەڵە بووم زۆر داوای لێبووردن دەکەم ببورە، سوپاست دەکەم کە دەرگای تەوبەت دانەخستووە و لێم خۆش بە، خوایە گیان خۆشم دەوێیت، چونکە هەموو شتێک جێ دەهێڵم و دەگەڕێمەوە بۆلای زاتی بەرزت.

ئەمەش نهێنی ئەو چوار وشەیەیە کە پێموتن، داوا دەکەم لە ئازاری خوشکم واز لە ئایینی تر بهێنێت و بگەڕێتەوە بۆ ناو دینی ئیسلام بەکافری نەمرێت و بۆ هەتا هەتایە لە دۆزەخ دا نەبێت.

بڕۆن بەگریانەوە تاوانەکانتان بۆ خوا باس بکەن و داوای لێخۆشبوونی لێبکەن، زۆر نزیکە دوعا و تەوبەکەتان هۆکاری چارەسەری نەخۆشییەکانتان بێت.

هیچ کەس لە ئێوە ١٠٠ کەسی نەکوشتووە، خوای پەروەردگار لەکەسێک خۆش دەبێت کە ١٠٠ کەسی کوشتووە بێ تاوان، چونکە بەدوای گەڕانەوە و تەوبەدا بووە خوای گەورە نائومێدی نەکردووە، ئەو ئافرەتەی کە پشیلەکەی برسی کرد و لەبرسا مرد، چووە دۆزەخ تەوبەی نەکرد، شەیتان بۆیە بووە خاوەنی پلەی شەیتانی چونکە لوت بەرز بوو لە تەوبەکردن ، بەڵام ئادەم و حەوا هەردووکیان زانیان هەڵەیان کردووە خێرا داوای لێبوردنیان کردو سوپاسی خوایان کرد، پاشان خۆشەویستیان بۆ پەروەردگار دەربڕی، خوای گەورە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت:

﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ۝٢٣﴾ الأعراف

واتە: هەردووکیان یەکسەر تەوبەیان کرد وەکو ئیبلیس نەبوون کە تاوانی کردو تەوبەی نەکرد، بەڵکو ئەمان یەکسەر دانیان بە تاوانی خۆیاندا نا ئەی پەروەردگار زوڵممان لە نەفسی خۆمان کردو تاوانمان کرد (پێویستە هەر کەسێك تاوانی کرد وەکو ئادەم و حەوا خێرا تەوبە بکات و بۆ لای خوای گەورە بگەڕێتەوە تا خوای گەورە لێی خۆش بێت)، ئەگەر تۆ لێمان

خۆش نەبی و ڕەحممان پێ نەکەی ئەوا ئێمە لە زەرەرمەندان ئەبین لە دونیاو قیامەتدا، خوای گەورە لێیان خۆشبوو.

خوشکەکانم خوای گەورە هەموو شەوێک چاوەڕێیە کە ئێوە بگەڕێنەوە بۆلای هەموو شەوێک دێتە ئاسمانی دنیا تا سێ یەکی شەو دەمێنێتەوە، پاشان دەفەرمووێت: کێ داوام لێدەکات تا پێی ببەخشم، کێ داوای لێخۆش بوون دەکات تا لێی خۆش ببم، ئەمەش قسەی بەڕێزترین و بەپێزترین مرۆڤی جیهانە پێغەمبەر محمد ﷺ کە دەفەرمووێت:

يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ، يَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي، فَأَسْتَجِيبَ لَهُ؟ وَمَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ؟ وَمَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ؟/ متفق عليه

ئێوە دەتوانن لەم کات و ساتەدا خێرا ژیانتان بگۆڕن کە گۆڕانکاری ڕوویدا خوای گەورە عیزەت و ئارامی و دڵنەوایتان پێشکەش دەکات، ڕێگای بەرەو خوا ڕاستە ڕێگایەو تاسە و خوارو خێچی تێدا نییە، بەقسەم بکەن پەلە بکەن لەتەوبە و گەڕانەوە بۆلای خوا، خێرا فریای بەندایەتی و یادی ئەو زاتە بەرزە بکەون، کە دەگەڕێنەوە بۆلای دڵنیابن زۆر دڵنیا بن، لە دایک بە بەزەیی ترە بۆ منداڵەکانی، ئەو زاتەش بۆ بەندەکانی، دڵنیا بن شەیتان ڕێگاتان پێ دەگرێت، بەڵام چاوکراوە بن بەیادی خوا ڕاوی بنێن، چونکە لە کەمیندایە بۆتان، ئێستا لە ئێوە زۆر نزیکە، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ٢٠١﴾ الأعراف

واتە: ئەو کەسانەی کە تەقوای خوای گەورە ئەکەن کاتێك تووشی وەسوەسەیەك ببن لەلایەن شەیتانەوە یاخود لە کاتی تووڕەییدا فەرمانیان پێ بکات بە خراپە و تاوانیان بۆ برازێنێتەوە، دواتر بیر ئەکەنەوە لە

گەورەیی خوای گەورەو سزاکەی ئەوان بەئاگا دێن و ڕاستیەکان ئەبینن کە ئەمە لە شەیتانەوە بووە.

ئەو کەسانەی کە خاوەنی ڕەحم و بەزەیین خوای بە بەزەیش بەزەیی پیایاندا دێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: (الراحمون يرحمهم الرحمن) ئێوەش بەزەیتان بەخۆتاندا بێتەوە تا خوا بەزەیی پیاتاندا بێتەوە.

خوای پەروەردگار دڵنیامان دەکاتەوە کە هەرکەس خۆپارێز و خواناس بوو خوای گەورە دەرگای خێرو چاکەی بۆ دەکاتەوە:

﴿... وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ۝٢﴾ الطلاق

واتە: هەر کەسێك تەقوای خوای گەورە بکات بەوەی کە سنووری خوای گەورە نەبەزێنێ و تاوان و سەرپێچی نەکات و خێزانەکەی تەڵاقدا لەسەر سوننەت تەڵاقی بدات، گەڕاندییەوە لەسەر سوننەت بیگەڕێنێتەوە، شایەت دابنێت، ئەوە خوای گەورە دەرووی خێری لێ ئەکاتەوە لەو کێشەیەی کە کەوتۆتە ناوی و ڕزگاری ئەکات، لە ناخۆشییەکانی دونیاو قیامەت ڕزگاری دەکات، یاخود کەوتە ناو هەر شوبهەو گومانێك لە دیندا خوای گەورە دەرووی لێ ئەکاتەوەو ڕزگاری ئەکات، یاخود لەسەرەمەرگدا لە ناخۆشییەکانی سەرەمەرگ ڕزگاری ئەکات.

هەروەها ناکرێت هەموو ژیانت بە ڕقەوە تەماشای خۆت بکەیت و بڵێی تەواو من کۆتایم هات لەبەر تاوانەکانم خوای گەورە ئەوەی بەسەردا هێنام، دڵنیاتان دەکەمەوە خوای گەورە زوڵم ناکات، گومانم لەوەدا نییە خوای گەورە تۆڵە دەسێنێتەوە، بەڵام لەو کەسانە نا کە تەوبە دەکەن و دەگەڕێنەوە بۆلای خوای پەروەردگار، دەمەوێت پێتان بڵێم شت لەسەر خۆتان قورس مەکەن بەئاسانی بیگرن، چونکە بیرکردنەوەی پۆزەتیڤ ئەنجامی باشی لێدەکەوێتەوە، بەچاوی مرۆڤەکانەوە تەماشای خوای پەروەردگار مەکەن، خوای گەورە بەدیهێنەرە خاوەنی بەزەیی و ڕەهاییە،

واتا بەزەیی و ڕەحمی خوا پێوەر ناکرێت بە مەخلوق، ئەوەشتان لەبیر نەچێت کە چۆن بیر لەخوا بکەیتەوە خوای گەورە بەو شێوازە بەرخوردت لەگەڵ دەکات.

جا بۆیە تکاتان لێدەکەم کارەکان بەئاسانی وەربگرن و لەسەرخۆتان قورس مەکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت و فێرمان دەکات کە دین و هەموو شتێک بەئاسانی بگرن و قورسی مەکەن، مژدەدر و هەمیشە گەشبین بن و دووربن لەنەفرین کردن و خراپەکاری و تاریک بینی و خراپ بینی (يسِروا ولا تعسِروا، وبشِّروا ولا تنفِّروا) متفق عليه.

خەجیج: کاک ماکوان تۆ بڵێیت خوای گەورە لەمن خۆش ببێت؟

ماکوان: بەدڵنیاییەوە لێت خۆش دەبێت، چونکە پەیمانی خۆیەتی خوای پەروەردگار، وەکو پێشتر ئاماژەم پێکرد کەس لە ئێوە ١٠٠ کەسی بێتاوانی نەکوشتووە، کەچی خوای گەورە لەو کەسە خۆش بووە کە ئەوکارەی کردووە.

سازان: ئاخر کاک ماکوان من ماڵی خەڵکم وێران کردووە، ئەو خەڵکانە چۆن لێم خۆش دەبن و دەبێت هەتا ماوم قوڕ بکەم بەسەرما بەڕاستی.

ماکوان: ئاخر سازان گیان باوکەکەم، خۆتۆ تەوبەکردن و گەڕانەوە بۆلای خوای گەورە بە یاری منالان و ماڵە باجێنە و شت ئەزانیت، ئەگەر ڕاستگۆ بیت لە تەوبە کردن و گەڕانەوەت بە دڵنیاییەوە خوای گەورە لەدنیا و لە قیامەت دڵی ئەوانەی کە غەدرت لێکردوون بۆت ڕازی و نەرم دەکات، ئێمە باسی تەوبە و گەڕانەوە بۆلای خوای گەورە دەکەین، خوای موتەعال هەموو دڵەکانی دروست کردووە کەنێوانی پەنجەی موبارەکیدایە چۆنی بوێت هەڵیان دەسوڕێنێت و ڕازییان دەکات.

سازان: واتا من ئەو هەموو زوڵم و خراپەیەم کردوە، بە تەوبەیەک خوای گەورە لێم خۆش دەبێت و کۆتایی دێت؟



ماکوان: تاریکی بەتاریکی لاناچێت، بۆ ڕۆشنکردنی تاریکیەکە مۆمێک بەسە، یان ڕۆشن کردنی چرایەک ئەگەر لە توانامدایە چراخان دامەگیرسێنە، ئەگەر توانات هەیە پڕی بکە لە بلاجکتۆر و گڵۆپ، ئەگەر لەوانە زیاترت توانی خۆر و مانگ لەتاریکی تاوانەکانیدا داگیرسێنە.

کەواتە گرنگە پلەی تەوبەکەی تۆ چەندە، تۆ هەر لە تاریکیدا بیت، دڵنیابە بەتاریکی تاریکی لاناچێت، تەنها ڕووناکی تاریکی لادەبات، تاوان و تەوبە وەک تاریکی و ڕووناکین.

ڕق و کینە بە ڕق و کینە لەناو ناچێت، خۆشەویستی لەناویان دەبات.

ئازار: کاک ماکوان ئەی من چی بکەم؟

ماکوان: وەڵڵا ئازاری بەڕێز ئەو خاچە لەمت کەرەوە و خۆت ڕزگار بکە لەم خاچ و صەڵیبە، باوکی من بۆ خۆت کافر و بێدینو مورتەد کردووە، لەگەڵ خوشکەکانت تەوبە بکەو شایەتومان بێنەرەوە وەرە بۆ ناو ئیسلام.

من ئامۆژگاریت دەکەم کە هەموو شەوێک پێنج خولەک دابنێیت بۆ پەیوەندی بەستن لەگەڵ خوادا، هەرچەندە پەیوەندییەکانی تر زۆرە، بەڵام بەگشتی مەبەستم ئەوەیە پێنج خولەک خۆت لەگەڵ خوای موتەعال قسە بکە و پشکنین بۆ تەوبەو گەڕانەوەت بکە.

یەکەم: هەست بەو خۆشییە بکە کە خوای گەورە لێت خۆش بووە، پەیوەندیت کردووە بە هەموو سیفاتە بەرز و پیرۆزەکانیەوە، هەر لەخۆشەویستی و لێبوردەیی و سەلامەی و یەکتاپەرستی.

دووەم: ئاهەنگ بگێڕە بۆ ئەو چرکە ساتانەی کە نزیک دەبیتەوە لەخوای گەورە بە ئاوازی خوێندی قورئان، هەروەها نزیک بوونەوەت لە سیفاتە بەرزو پیرۆزەکانی.

سێیەم: ڕۆژانە خۆت بەدوور بگرە لە یادنەکردنی خوا و بەشەودا پێداچوونەوە بکە بزانە ئەو ڕۆژە چەندە دوور بوویت لە خوای خۆت، یان



چەندە خوات لەبیر کردووە، چونکە دڵنیابە خوا لەبیر بکەیت خوای موتەعال لەبیرت دەکات و پەراوێزت دەخات و خۆت ئامادە دەکەیت بۆ دۆزەخ.

چوارەم: لەجیاتی ئەوەی دەست بکەیت بە لۆمەی خۆت کە چیت کردووە و چیت نەکردووە، ئەوانە بخەرە پشتی گوێت و هەوڵبدە بۆ چاککردنی نێوانی خۆت و خوای پەروەردگار بزانە، دووریەکەت لە کوێدایە نزیک بەرەوە لێی.

پێنجەم: پەشیمانی دەربڕە لای خوای پەروەردگار و هەموو ڕۆژێک بزانە چەند وتوتە (استغفرالله وأتوب اليه) کە نابێت ١٠٠ جار کەمتر بێت، بەڵام زیاتر باشترە.

شەشەم: بیری ئەو تاوانانە بکەرەوە کە زۆر گەورەیە و کاریگەری زۆری لەدوای خۆی بەجێهێشتووە پاشان دەست بخەرە سەر دڵت و بیر لە ڕاستی و دروستی نیەتت بکەرەوە و داوای لێخۆش بوونت کردووە و گەڕاویتەوە بۆلای خوای پەروەردگار و بزانە خوای پەروەردگار بە بەزەیی و گەورەو بەخشندەیە.

حەوتەم: سوپاسی خوا بکە و بەیادو زیکری (الحمدالله) کە بەخشندە و ڕێگای هیدایەتی نیشان دایت و دڵنیا بەرەوە لەوەی تۆ نیەتت ڕاستە، ئەوا خوای پەروەردگار لێت خۆش بووە.

هەشتەم: پەیوەندی پتەو دروست بکە لە نێوانی خۆت و خوای موتەعال، ئەم نزیک بوونەوەی پەیوەندییە تەنها بۆ نویژ و ڕۆژوو بەخشین و قورئان خوێندن و زیکر و فیکری پەروەردگار دەبێت و دووبارەکردنەوەی وشەی (استغفرالله) بەردەوام.

نۆیەم: سەرەتا زۆر سەختە، بەڵام لەدوایدا تام و چێژی زۆر نایابی لێوەردەگریت، بۆ ئەوەی نێنەرجیت بۆ بگەڕێتەوە تەماشای تاوانەکانت



بكە و بەراوردی بكە لەگەڵ چاكەكانت، ئەوكات دەزانیت پێویست بەو پەیوەندییە پتەوە هەیە لەگەڵ خوای پەروەردگاردا.

دەیەم: بەردەوام بە لەسەری لانی كەم یەك مانگ بزانە چ گۆڕانكارییەك ڕوو ئەدات، كە ڕوویدا پەیمان نوێ بكەرەوە بۆ دوو مانگ پاشان بۆ سێ مانگ و شەش مانگ و تا ساڵ و هەموو ژیان ئەوكات دەزانیت تامی بەندایەتی و ئیمان چەندە شیرین و خۆش و بەپێزە.

ئازار: كاك ماكوان دەتوانیت دووبارەی بكەیتەوە، چونكە دەمەوێت تۆماری بكەم، دڵنیابە بۆ خۆم دەبێت.

ماكوان: جا ئەگەر بڵاویشی بكەیتەوە من هەر زۆر مەمنون دەبم چونكە خێر و پاداشتی لەسەر وەردەگرم.

بۆیە هەر دە خاڵەكەم بۆ دووبارە كردەوە و ئەویش مۆبایلەكەی دەرهێناو دەنگەكەی تۆمار كردم.

لەپڕ پاسەوانەكەی بازاڕی ڕەشەمۆڵ هات وتی كاك ماكوان كاتژمێر ٧ی ئێوارەیە دووكانەكانی تر هەموو دایانخست، نازانم زیاتر دەمێنیتەوە یان كاتەكەتان بیرچووە، چونكە ئێمەش پشوومان هەیە.

ماكوان: زۆر زۆر داوای لێبوردنم هەیە، سەرقاڵ بووین كاتمان لەبیركردبوو، هەر ئێستا دایدەخەم. من و كچەكان هەستاین ڕۆشتین، پێم وتن ڕازی دەبن بەیەكەوە بچین بۆ كەباب خواردن یان پابەندن بە شتی ترەوە؟

خەجیج: كاك ماكوان بەو مەرجەی دەعوەتی من بیت.

ماكوان: كێشە نییە، بەڵام ئێمەی لادێی واین كە پیاو ئامادە بوو هەرگیز ئافرەت دەست ناكات بە گیرفانیا، ئێمەی لادێی خۆمان بە (جێنتڵ مان) دەزانین، بەڵام پێم بڵێن كوێ كەبابی خۆشی هەیە؟



هەموویان بێدەنگ بوون دیاربوو شارەزای کەباب خواردن نەبوون، ئازار سەیارەکەی هێناو چووین بۆ نانخواردن، بۆم باسکردن ڕۆشنبیری کەباب خواردن چۆنەو کام کەبابخانەی باشە بۆی بڕۆین، پێم وتن ئەو کەبابخانەی نانەواو نانی گەرمی هەیە، پاشان تەڕە پیازو لیمۆ بەکار دەهێنێت و گۆشتەکە لەبەرچاوی موشتەرییەکانیدا دەکات بە قیمەو لە شیشی دەدات.

سازان: کاک ماکوان ئەگەر پرسیارێکت لێ بکەم ئاساییە؟

ماکوان: بە دڵنیاییەوە سازان-ی خوشکم.

سازان: سوپاس، دەمەوێت بپرسم ئایا تۆ ڕۆژنامەنووسی، بانگخوازی یان مەلایت یان نووسەری، چاکسازیت، بزنسمانی کامیانیت؟

بەپێکەنینەوە وتم: باشە سازەی خوشکم یەکێک لەوانە هەڵبژێرە و بەئارەزووی خۆت، چ جیاوازییەک دەکات بۆ تۆ؟

سازان: وەڵڵا هیچ، بەڵام ماشاءالله هەموو کەسایەتییەکانت تێدا کۆبوەتەوە بۆیە سەرم لێدەرنەچوو لەکام بوار کار دەکەیت.

ماکوان: جارێ ماوتە هەندێک شتی تریشم پێ دەڵێت، هەندێک خەڵک پێم دەڵێن کۆنەپەرست، تیرۆریست، ڕادیکاڵ، ئوصوڵی و زۆری تر، بەڵام پێم خۆشە خزمەتکاری خەڵکی بم بەگشتی.

خەجیج: درێغیت نەکردووە.

ماکوان: ئازار ڕێگا هەڵە مەکە لێرەوە دەڕۆین، برسیمە با خێرا بکەین.

لەگەڵ هەرسێ خانمەکەدا بووم لەسەیارەکەی ئازاردا زەنگی تەلەفۆنەکەم لێیدا شێرکۆ بوو، وتی بابە حەزدەکەم بتبینم بۆ دیار نیت؟

ماکوان: شێرکۆ بەیانی گەنم دێت بە شوێنتا و دەتهێنێت بۆلام، ببورە سەرقاڵ بووم بۆیە تەلەفۆنم بۆ نەکردیت، نانت خواردووە؟

شێرکۆ: بەڵێ نانم خواردووە.

ماکوان: چیت خواردووە؟

شێرکۆ: نیسکێنە.

ماکوان: چەند خوشکت هەیە شێرکۆ؟

شێرکۆ: دوو خوشک و برایەکین.

ماکوان: ئەزانم برای ترت هەیە، ئەی کێی تری لێیە، سەروەری مێردی دایکت لەماڵە؟

شێرکۆ: نا لەدوکانە.

ماکوان: باشە تۆزێکی تر کەبابتان بۆ دەهێنم بۆ خوشک و براکانت، بەڵام بەشی دایکت و سەروەر نەیەن خۆتان بیخۆن باشە کوڕی خۆم.

شێرکۆ: باشە.

ماکوان: کە هاتمە سەری کۆڵانەکە تەلەفۆنت بۆ دەکەم وەرە کەبابەکە بەرە.

شێرکۆ: باشە، ئەی دادە گەنم بەیانی سەعات چەند دێت؟

ماکوان: نازانم، تەلەفۆنت بۆ دەکات، جارێ خوات لەگەڵ من میوانم لەگەڵدایە کوڕی خۆم جارێ بەئیجازە قسە دەکەینەوە، خوات لەگەڵ.

گەیشتینە کەباب خانەکە و شێخ عەبدولڕەحمان لەکەبابخانەکەی (حەسەن)ی کەبابچی کەبابی دەخوارد، چوومە لای سڵاوم لێکرد و وەڵامی دامەوە زۆر ڕووگەش بوو وتی: خۆت ئامادە بکە بۆ کارێکی گەورە، من نانم خوارد دەڕۆم، پارەکەم بۆ ئەدەیت یان پارەی هەموتان بدەم؟

ماکوان: نا شێخ گیان بڕۆ من لەخزمەتام.



بەزەردەخەنەیەکەوە وتی: ئەم جارە کارەکەت قورسە، باش خۆت ئامادە بکە.

کە نانمان خوارد نانم برد بۆ شێرکۆ و بەیانی لەگەڵ گەنم و شێرکۆ تەواوی ڕۆژەکە بەیەکەو بووین لە بازاڕ، دوکتۆر چالاک تەلەفۆنی بۆ کردم.

د. چالاک: داوات لێدەکەم ڕۆژی سێ شەممە بێیت بۆ باخەکە و وازمان لێ نەهێنیت.

ماکوان: بەدڵنیاییەوە دێم، پێشتر وەعدم داوە کە بچم بە شوێن ئەنوەر دا لەگەڵ ئەنوەر بەیەکەوە بێین، ئەم بەیانییە قسەم لەگەڵ کرد ڕازیم کرد کە بەیەکەوە بێین بە پشتیوانی خوا.

د. چالاک: زۆر سوپاس کاک ماکوان، بەڕاستی جێگای ڕێزی ئەو بڕیاری دابوو نەگەڕێتەوە، بەڕاستی کارێکی باشت کرد من زۆر سوپاست دەکەم.

ماکوان: پێویستی بە سوپاس نییە ئەوە ئەرکی سەرشانمە.

بەردەوام بووم لەگەڵ شێرکۆ و گەنم لەبازاڕ، گەنم پرسی: کاکە وەرزێر تەلەفۆنی بۆ نەکردوویت؟

ماکوان: نا لەو ڕۆژەوە هیچ پەیوەندی نەکردووە.

گەنم: پەیوەندی بە منیشەوە نەکردووە.

ماکوان: بێتاقەتی و بیری دەکەیت؟

گەنم: نا بەخوا هەر وتم بزانم خاوەنی وەعدی خۆیەتی؟

ماکوان: وەرزێر کوڕێکی بە ئەدەبە و ئاقڵە، چەندە ڕقم لەباوکیەتی ئەوەندە ڕێزی وەرزێرم لایە، ناهێڵم لێت ون بێت، بەڵام ئیجازەم بە بابۆت ڕاست بکەمەوە، ئەگەر خۆشی بوێیت بەڕاستی دەستبەردارت نابێت، ئەگەر نەیشیەوێیت ئەوا زوو دەست هەڵدەگرێت.



گەنم: بەخوا مەبەستم هیچ نەبوو، هەر ویستم بزانم توانای ئەو قسە زلەی هەیە کە لە زانکۆ و جێگاکانی تردا دەیکرد، بۆ زانیاریت کاکە تۆ هەرچی بڵێیت لە قسەت دەرناچم.

ماکوان: کەواتە وەرزێرت لامەبەست نییە و خۆشت ناوێت؟

گەنم: ئەگەر بڵێم خۆشم ناوێت درۆ دەکەم، بەڵام تۆم زیاتر خۆش دەوێت، تۆ برامی بەڵام ئەو هیچم نییە، جێگای ئەو دەگیرێتەوە بەڵام جێگای تۆم بۆ ناگیرێتەوە.

ماکوان: چەندە دڵ خۆشم بە قسەکەت، خوای گەورە مەحفوزت بکات، ویستم پێت بڵێم لەدانانی پلانێکدام، کە هەموو کەسووکار ئاگادار بکەمەوە لەوەی خوشکی ئێمەیت، دوای ئەوەش نابێت لەماڵی جەمال بژیت، دێیتەوە بۆ ماڵی باوکت لای ئێمە دەژیت، ئەگەر ڕازی بیت.

گەنم لە خۆشیا دەستی کرد بە پێکەنین و باوەشی پیاکردم و چاوی پڕ بوو لەگریان وتی پلانەکەت چییە؟

ماکوان: جارێ بابمێنێت، هێشتا لە مێشکما تەواو نەبووە، پێویستم بەکاتی زیاترە، کە پلانەکەم داڕشت ئەوکات لەورد و درشتی ئاگادارت دەکەمەوە. با ئەمڕۆ لەبەر شێرکۆ سەرقاڵ نەبین بەو باسەوە، بەڵام ویستم بزانم پێناسەکەت سەر بەکوێیە، مەبەستم لەکوێ لەدایک بوویت؟ لەکوێ بۆیان دەرهێناویت؟

گەنم: دڵنیا نیم بەڵام وابزانم ڕانیەیە یان قەڵادزە.

ماکوان: باشە کە چویتەوە دڵنیا بەرەو ئاگادارم بکەوە.

گەنم: کاکە شێرکۆ زۆر دووبارەی دەکاتەوە کە بیبەیت بۆ نەرویج، دیارە زۆر نائارامە لەگەڵ دایکی و باوەپیارەکەیدا.

ماکوان: ئاگادارم، دوێنێ لەگەڵ خێزانم قسەم کرد زانیاری باشی دامی دوای چەند ڕۆژێکی تر دەست دەکەم بە ئەنجامدانی ئەوکارە، لەگەڵ خۆم



دەیبەم بۆ سەفارەتی نەرویج لە ئوردون و دەبێت فەحسی بۆ بکەم لەوێ ئەیناسێنم، ئەوەی کە پێویستە بکرێت دەیکەم، من خۆم بەدوای شتێکی وادا دەگەڕێم، بەپشتیوانی خوا ئەویش ڕزگار دەکەم لەو بنەماڵەیە.

گەنم: خێزانت دەزانێت کە کوڕێکت هەیە؟

ماکوان: نا باسم نەکردووە، وتم هاوڕێیەکم ئەو کێشەی هەیە، بەڵام دەبێت لەکۆتاییدا هەر پێی بڵێم، ناتوانم بیشارمەوە، بەڵام دەبێت هەمووی لەکات و شوێنی گونجاودا باس بکەم، جا بۆیە جارێ کاتی ئەوەی شێرکۆش نەهاتووە.

گەنم: ئەی کێشەت بۆ دروست نابێت؟

ماکوان: بڕوا ناکەم، کێشەم بۆ دروست بێت بەڵام دڵنیام کە سەرەتا تووشی شۆک دەبێت بەڵام کە زانی لەسەردەمی کابینەی ئەودا نەبووە پەیوەندی بە حکومەتی خێزانمەوە نییە دڵنیام ئاسایی وەریدەگرێت، خێزانم ئافرەتێکی مێشک فراوانە.

زۆر زوو شت وەردەگرێت و ئەمدیواو دیوی ناکات.

گەنم: سوپاس بۆخوا ان شاءالله بە خزمەتی دەگەین.

ماکوان: ان شاءالله.

تا درەنگانێک بەیەکەوە بووین گەنم من و شێرکۆی گەیاندەوە، پاشان هەموو چووینەوە جێگای تایبەتی خۆمان و شەو کاتژمێر ۹ وەرزێر تەلەفۆنی بۆ کردم، داوای لێکردم کەبەیانی لەنزیک باخی گشتی کاتژمێر ۳ی دوانیوەڕۆ بڕۆین بۆ کافتێریایەک لەگەڕەکی عەقاری.

ماکوان: بەخۆشحاڵییەوە لەخزمەتام.

وەرزێر: خۆ کێشە نییە ئەگەر هاوڕێیەکی خۆم ئامادە بێت ئەو جەنابت دەناسێت بەڵام تۆ ئەو ناناسیت، هاوتەمەنی خۆمە باسەکەم

بۆباسکرد وتی زۆر حەز دەکەم لەگەڵتان بم، منیش مەرجی ئەوەم داناوە کە دەبێت جەنابتان ڕازی بن، جا نازانم چی دەفەرموویت؟

ماکوان: بۆ من ئاساییە.

کاتێک لەگەڵ وەرزێر تەلەفۆنم دەکرد دووجار جەمالی مێردی دایکی گەنم تەلەفۆنی کرد، منیش تەلەفۆنم بۆ کردەوە.

جەمال: کاک ماکوان حەز دەکەم سبەینێ لەماڵی ئێمە بیت بۆ نانخواردن، جا نازانم چی دەڵێیت خۆ مەجالت دەبێت؟

ماکوان: کاک جەمال گیان سبەینێ دوو شەمەیە زۆر سەقاڵم، سێ شەمەش دەعوەتم پێشتر وەعدم داوە، چوارشەممە من لەخزمەتاندام.

جەمال: چوارشەممە منیش لەماڵ نیم.

ماکوان: دەیبرا دەیخەینە کاتێکی کە، ئەگەر هەر بۆ نانخواردنە کاتی ترمان دەبێت، بەڵام ئەگەر شتێکی کتوپڕە پێویستە بێم ئەوا واز لەهەموو شتێک دەهێنم و دێم.

جەمال: نا؛ کاک ماکوان گیان هەر زیاتر بۆ نزیک بوونەوە و تەعاروفە سوپاس بۆ خوا هەموو شتێک ئاسایی و باشە.

ماکوان: دەی سوپاس بۆ خوا ان شاء الله پەیوەندیمان دەبێت.

بەڵام بەبانگ کردنەکەی جەمال دڵخۆش نەبووم، هەستم کرد شتێکی لە پشتەوەیە، حەزم نەکرد تەلەفۆن بۆ گەنم بکەم نیگەرانی بکەم، بەڵام بڕیارمدا کە ڕۆشتم بۆ ماڵیان بەتەنها ناڕۆم و یەکێک لەهاوڕێکانم لەگەڵ خۆمدا دەبەم.

ئەو شەوە بیرم لەوە دەکردەوە کە داخۆ باسی من و وەرزێر چی بێت و دەبێت خێراترین ڕێگا بدۆزمەوە بۆ باوەڕ پێهێنانی لەبەر خاتری گەنم، بۆ ئەوەی وانەزانێت من زوڵمم لێکردوە، بەهەرحاڵ شەو ڕابورد و ڕۆژ بوویەوە تا کاتژمێر ٣ لەناو بازاڕدا بووم دوای ئەوە پێشوەخت بەچەند



خولەکێک گەیشتمە ئەو جێگایەی کە بڕیاربوو لەگەڵ وەرزێر یەکتری ببینین، کە چووم ئەو لەوێ بوو چاوەڕێی دەکردم.

بەیەکەوە چووین بۆ کافتێریاکە و لەوێ هاوڕێکەی چاوەڕێی دەکردین دوای هەواڵ پرسین خۆی ناساند کە ناوی ئاری بوو زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنی کردم و داوای کرد کەمن چی دەخۆمەوە، منیش داوای کوپێک قاوەی ڕەش بێ شەکرم کرد و پەرداخێک ئاو.

وەرزێر: کاک ماکوان خۆت فەرموت جێگایەکی هێمن بۆیە بانگم کردیتە ئێرە، چونکە ئێرە زۆر لە سلێمانی پالاس باشترە و هێمن ترە.

ماکوان: من کێشەم نییە، گرنگ ئەنجامە بۆ من نەک جێگاو ڕێگا و دیکۆر.

وەرزێر: کاک ماکوان چۆن دەست پی بکەم لەگەڵتا ئایا بەئازادی قسە بکەین یان خاتر و خۆتر و خزمەیاتی کەین؟

ماکوان: مرۆڤی خاوەن فیکر و زانست هەرگیز موجامەلەی درۆ ناکات، ئەوەی لەدڵیدا بێت دەیڵێت، من داوام لە تۆ ئەوەیە کە ڕاستگۆ بیت لەگەڵم هیچی تر، دڵنیابە ڕاستگۆیی و سەرڕاستی لە قسەو گفتوگۆدا دەردەکەوێت، نامەوێت بکەومە گومان لێت ڕاستەوخۆ ئەوەی لە دڵتدایە بیڵێ.

وەرزێر: ئەی ئەگەر تۆ نەتوانیت وەڵامم بدەیتەوە، چی بکەین ئەوکات؟

ماکوان: زۆر ڕاستە ئەوە زۆر دەشێت کە نەتوانم وەڵامت بدەمەوە، بەڵام دەتوانم وەڵامت بۆ پەیدا بکەم.

وەرزێر: کەواتە ئەگەر منیش نەمتوانی وەڵامی بەڕێزت بدەمەوە دەتوانم وەڵامت بۆ پەیدا بکەم.



ماکوان: بەدڵنیاییەوە لای من کات کراوەیە، بۆ هێنانی وەڵام و پرسیارو ئارگۆمێنت و بەڵگەو گۆڕینەوەی بیرورا.

وەرزێر: کاک ماکوان دەمەوێت ڕاستگۆ بم لەگەڵتا، ئاستی بەڕێزت گەیشتە ئاستی بیرکردنەوەی من ئەوا لێرە دانانیشین و دەڕۆینە جێگای تر، ئەگەر ئاستی بەڕێزت لەخوار ئاستی پرسیار و وەڵامەکانی من بوو یان بەگوێرەی پێویست نەبوو ئەوا لێرە دەمێنینەوە تا خۆت بڕیار دەدەیت.

ماکوان: سەرەتا من نازانم ئاستی بەڕێزت چۆنە، پاشان دۆزینەوەی ئاستیی منیش لە ئەنجامی گفتوگۆکە دروست دەبێت، بۆ من گرنگ نییە بڕۆینە هەر جێگایەک وەکو وتم ئەنجام گرنگە و ڕەچاوی پرنسیپی گفتوگۆ.

وەرزێر: کاک ماکوان پرنسیپی گفتوگۆ لای بەڕێزت چۆنە؟ بۆ ئەوەی من ڕەچاوی بکەم.

ماکوان: بریتییە لەوەی کە هەرکەسێکمان قسەی کرد تا تەواو نەبێن قسە بەیەکتری نەبڕین، گاڵتەو سوکایەتی بە بیروباوەڕی یەکتری نەکەین، بەڵام نەترسین لە ڕەخنەی جدی، بەڵام بەبێ ئەوەی تانەو تەشەر بدەین، خۆ ئەگەر ڕوویدا من زۆر ترسناک دەبم لەو حاڵەتەدا دووجار بەرانبەر بە یەکجاری تۆ دەبێت و بە پێکەنینەوە وتم نەوەک بترسێت.

وەرزێر: کاک ماکوان من کێشەم لەگەڵ خوادا نییە، خوا هەبێت یان نەبێت بیرم لێنەکردۆتەوە من کەسێکی زانستیم تا سەر ئێسقان بڕوام بە زانست هەیە، باسی من لە گەردوون و ژیان و مرۆڤەوە دەست پێدەکات، ئەگەر کێشەکانم بۆ یەکاڵا بوویەو ئەوا دەبم بە موسڵمان، لێت ناشارمەوە ئێمە گروپێکی زانستین، بەناوی (گروپی زانست و گەڕان) هەرچەندە ڕێکخراوێکی مەدەنین و ئیجازەمان بۆ وەرگرتووە، هەروەها چەند بانگخواز و مەلایەکمان بانگێشت کرد، هەڵبەت دانیشتنەکانمان کراوە نەبووە هەموو داخراو بوون، لەبەر ئەوەی کۆمەڵگەکە ئێمە قبوڵ ناکەن، جا دوو بانگخواز و مەلایەک وازیان لەدین هێناوە ئێستا لە گروپی زانستی





و گەڕاندان، بۆیە ڕاستەوخۆ ئەمەم باسکرد بۆ ئەوەی جەنابت بزانیت من کەسێکی سادە نیم لە پرسیار کردن و وەڵامی زانستی و ئارگۆمێنتی ڕاست و دروستم دەوێت.

ماکوان: وا ئێستا دووبانگخوازی کافر و مەلایەکی کافرتان لەگەڵدایە، سەیرە مەلا و بانگخواز کافر ببنەوە، بەڵێ بفەرموو زیاتر قسەم بۆ بکە.

وەرزێر: کاک ماکوان خۆ تووڕە نەبوویت؟

ماکوان: نا وەرزێر گیان وەکو وتم تووڕە نابم، تکایە بەردەوام بە، بەڵام قسەکەت جێگای سەرنج و تێڕوانینی من بوو وەکو وتم بەردەوام بە.

وەرزێر: کاک ماکوان من بە چەند پرسیارێک دەست پێ دەکەم، ئەگەر توانیت وەڵامم بدەیتەوە، دەچینە قۆناغی دوای ئەوە، بەڵام باجارێ واز لە باسی خواو پێغەمبەر و دین و ئەو شتانە بهێنین.

ماکوان: ئێ کوڕی باش من بۆ باسی ئەو سێ چەمکە لەگەڵ تۆ دانیشتووم.

وەرزێر: ببورە دەزانم بەڵام من دەست دەکەم بە پرسیار بۆ ئەوەی بڕۆینە ناو گەوهەری باسەکە، ڕازیت؟

ماکوان: بفەرموو، موجامەلەی زۆر مەکەو باسەکەت بکەرەوە.

وەرزێر: جەنابت بڕوات وایە کە خوا ئەم گەردوونەی دروست کردووە؟ پرسیاری من ئەوەیە خوا لە ئیسلامدا چۆن باسی دروستبوون و گەردوون دەکات؟

ماکوان: خوای پەروەردگار باسێکی سەرەتایی دەکات و پاشان پێمان دەفەرمووێت: بڕۆن خۆتان بگەڕێن، قورئان یان ئایین بەگشتی کاری بەسەر ئەو باسەوە نییە، تەنها سەرەقەڵەمێک ئەدات و ئەوی تر جێدەهێڵێت بۆ ئەقڵی مرۆڤ.

وەرزێر: ئەی ناڵێن لە (کن فیکون) دا دروستی کردووە؟



ماکوان: نا؛ بۆ باسی گەردوون دەفەرموویت:

﴿أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾﴾ الأنبياء

واتە: ئایا کافرو خوانەناسان نابینن و، بۆیان ڕوون نەبۆتەوە کە ئاسمانەکان و زەوی یەکپارچە بوون لەوەودوا لێکمان جیاکردنەوە (کە ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەم ڕاستەقینە زانستیە لەلایەن خوانەناسانەوە پەی پێ دەبرێت)، لە ئاویش هەموو شتێکی زیندوومان فەراهەم هێناوە (زۆربەی پێکهاتەی لەشی ئادەمیزادو زیندەوەران و ڕووەک ئاوە)، ئایا ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن (بەو ڕاستیانەو بەو دەسەڵاتە بێ سنوورەی ئێمە)؟!

وەرزێر: کاک ماکوان ئەو ٦ ڕۆژە چییە، دەتوانی بۆم باس بکەیت؟

ماکوان: ٦ ڕۆژ بەواتای ٦ ڕۆژی ئێمە و لەم ڕۆژمێرەی ئێستا نییە، بەڵکو ئەوە کالیندەرو ڕۆژمێری خواییە، تەنها لە مەملەکەتی خوای گەورەدا هەیە، دەبێت بزانیت ڕۆژێک چەند ڕۆژی ئێمە دەکات، بۆمان ڕوون نەبۆتەوە پێویستیشمان پێی نییە.

وەرزێر: ئەی جەنابت دەزانیت تەمەنی گەردوون چەندە؟

ماکوان: بەڵێ ئەوەی کە زانراوە و زانایانی فیزیا پێی گەیشتوون تەمەنی گەردوون ١٣.٧ بلیۆن ساڵە، تەمەنی زەویش ٤.٥٤٣ بلیۆن ساڵە، تەمەنی ژیان واتا زیندوێتی نزیکەی ٣.٧ بلیۆن ساڵە، ژیانی مرۆڤیش دەگەڕێتەوە بۆ DNA نزیکەی ٢ ملیۆن ساڵ کەمتر یاخود زیاتر بەگوێرە ئەو ئامێری کاربۆنی و ڕادیۆی و کارکردنە لە سەر.

وەرزێر: سەیرە ئەمانە دەزانیت و باسی دینداری دەکەیت کاک ماکوان، زانیارییەکانت ڕاستە، بەڵام دین ئەوەندەی من بزانم باسی (کن فیکون) دەکات.



ماکوان: تۆ چۆن لە (کن فیکون) تێگەیشتوویت تۆزێکم بۆ باس بکە.

وەرزێر: واتا لە پڕدا هەمووی دروست بووە.

ماکوان: کێ وادەڵێت؟

وەرزێر: قورئان.

ماکوان: ڕاستە لە قورئاندا لە زۆر جێگادا هاتووە، بەڵام جێگایەک شک دەبەیت دەریبخات خوای گەورە ئەم گەردوونە یاخود بوونەی بە کن فیکون دروست کردبێت؟ یان خوای گەورە دەفەرموێت: ئەگەر بمانەوێت هەموو شتێک لە کن فیکون دا دروست دەکەم.

وەرزێر: من شارەزا نیم نازانم، بەڵام لەمەلا و بانگخوازەکانی گروپ دەپرسم.

ماکوان بە پێکەنینەوە: مەلا کافر و بانگخوازە بێدینەکانی لای ئێوە، با تێپەڕ بین لەم باسە بۆ زانیاریت، بەو مەلا و بانگخوازانە بڵێ ماکوان دەیوت (کن فیکون) مانای ئەوە نییە کە کوتوپڕ خوای گەورە هەرچی بوێت دروستی دەکات، هەڵبەت خوا توانای لە کن فیکون کتوپڕ زیاترە و توانای ڕەهایە، بەڵام تەماشای قاموس بکەن لە نێوانی (کن فیکون) ماوە زۆر چونکە پیتی (ف) بەکار هاتووە، زمانی عەرەبی پیتی (ف) و وشەی (ثم) بۆ کاتی درێژخایەنە، هیوام وایە ڕوون بێت.

وەرزێر: جەنات فەرموتان تەمەنی مرۆڤ دەگاتە ٢ ملیۆن ساڵ، ئەم وتەیەت دژی قورئان نییە.

ماکوان: نا؛ بۆ دژی قورئانە، بەڵکو قورئان داوامان لێدەکات کە بگەڕێین و زیاتر لێکۆڵینەوە بکەین.

وەرزێر: ئەکرێت پێم بڵێیت لە کوێدا داوامان لێدەکات؟

ماکوان: جا وا پێم وتیت خۆ تۆ لێم تێناگەیت.



وەرزێر: ئایەت و ژمارەکەی دەنووسم و دوای بە شوێنیدا دەگەڕێم.

ماکوان: خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَرۡحَمُ مَن يَشَآءُۖ وَإِلَيۡهِ تُقۡلَبُونَ ٢١﴾ العنكبوت

واتە: هەندێك جار، سزای ئەو کەسانە دەدات کە خوا بیەوێت و شایستەی سزان و سۆزو میهرەبانی خۆیشی دەنوێنێت بۆ ئەوانەی کە دەیەوێت و باوەڕدارن، سەرئەنجامیش هەر بۆ لای ئەو زاتە دەبرێنەوە.

ئەتوانین بڵێین لەبواری سروشت و ئەترۆپۆلۆجیاوە داوامان لێ دەکات کە بگەڕێن، ئەگەر بواری زیندەوەران و ئاژەڵان بێت خوای گەورە بەهەمانشێوە سەرنجمان ڕادەکێشێت بۆ وشتر، ئەگەر جیۆلۆجی بێت بەهەمان شێوە، ئەگەر خاک و کشتوکاڵ بێت داوامان لێ دەکات کە بەدواداچوون بکەین بۆ نموونە ﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلۡإِبِلِ كَيۡفَ خُلِقَتۡ ١٧ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيۡفَ رُفِعَتۡ ١٨ وَإِلَى ٱلۡجِبَالِ كَيۡفَ نُصِبَتۡ ١٩ وَإِلَى ٱلۡأَرۡضِ كَيۡفَ سُطِحَتۡ ٢٠﴾ الغاشية

واتە: ئینجا خوای دروستکار لە ڕوانگەی هەندێ دروستکراوەکانیەوە دەیەوێت (صدفە) چییەکان داچڵەکێنێت، بۆیە دەفەرموێت: ئایا ئەوە سەرنجی وشتر نادەن چۆن دروستکراوە (قەبارەی، ملی درێژی، قاچە درێژەکانی کە بە سمێکی ئیسفنجی کۆتایی هاتووە، ئینجا خۆگرتنی لەسەر برسێتی و تینوێتی بۆ ماوەی چەندەها ڕۆژ، و گەلێ شتی تر) ١٧ ئایا سەرنجی ئاسمان نادەن چۆن بەرز کراوەتەوە (ئەو هەمووو ئەستێرەو کەهکەشان و هەسارە بێشومارە دەورەی زەوی داوە لە بڵندیەوە ڕاگیراون) ١٨ ئەی سەرنجی کێوەکان نادەن، چۆن داکوتراون و دامەزرێنراون (ڕەگیان چووە بە ناخی زەویدا) ١٩ ئەی سەرنجی دەشتەکانی زەوی نادەن چۆن تەختکراوە (لەبار هێنراوە بۆ کشتوکاڵ و ڕێگەوبان و ژیان) ٢٠

سەدان ئایەتی ترمان هەیە لەو بارەیەوە، جارێ تۆ پشکنین بۆ ئەو دوو ئایەتە بکە ئەگەر جێگای بڕوا پێکردنت نەبوو دوو هێندەی ترت ئەدەمێ، بەڵام نامەوێت لە ئێستادا زۆر سەرقاڵت بکەم، ئەگەر پرسیاری تری هەیە بفەرموو، خۆ ئەگەرنا من پرسیار دەکەم.

وەرزێر: پەلەم لێ مەکە با پرسیارێکی تریش بکەم، خەنابت فەرموت دروست بونی مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ ٢ ملیۆن ساڵ، قسەکەت ١٠٠٪ ڕاستە، بەڵام ئەی کوا قورئان باسی مرۆڤی ڕابردوو دەکات، بەڵکو بە ئادەم و حەوا دەست پێ دەکات، مەگەر وانییە، ئەو یەکەم مرۆڤ نەبووە؟

ماکوان: نا؛ ئەم بیرکردنەوەی جەنابت بیرکردنەوەی زانستی نییە لە ئادەم و حەواوە، بەڵکو بیرکردنەوەی ناو کۆمەڵگەیە، هەندێکیان کە وەرتگرتووە تێکەڵت کردووە لەگەڵ ئەفسانە و چیرۆکی دروستکراوی خۆشی بەر ئاگردان، بەشێکیش زۆر ڕاستە و قورئان ئاماژەی پێکردووە، بەڵام بە نەزانی تەفسیر کراوە.

بۆ نموونە: من کە دەڵێم مرۆڤ ٢ ملیۆن ساڵە پەیدا بووە ئەم قسەیەم لەوانەییە، چونکە بە گوێرەی زانستی ئارکۆلۆژی جیاوازی هەیە ١.٤-٢.٤ ملیۆن ساڵ بە گوێرەی دۆزینەوەی ئەو وێنە و پەیکەر و فۆسیلانەی کە دۆزراونەتەوە، ئێمە باسی مرۆڤ دەکەین باسی پێغەمبەر ناکەین، پێشتر ئاماژەم پێدا قورئان داوای لێکردوین کە بە شوێن دروستکراوەکاندا بگەڕێین، باسی ئادەم باسی یەکەم مرۆڤ نییە، بەڵکو باسی یەکەم پێغەمبەرە لە قورئاندا، چونکە مرۆڤی ئاقڵ پەیدابوونی دەگەڕێتەوە بۆ ٢٠٠ هەزار ساڵ، مرۆڤی ئاقڵ دەرکەوتووە پاشان پێغەمبەران دەرکەوتوون کە یەکەم پێغەمبەر ناوی ئادەمە.

وەرزێر: بەڕاستی کاک ماکوان ئاستی جەنابت زۆر لەمن بەرزترە، من ناتوانم زیاتر لەگەڵت بدوێم، هەموو بیروبۆچوونەکانمت هەلا هەلا کرد و پرژوبڵاوت کردنەوە، کۆتا پرسیار دەکەم ئەنجامی ئەم قسانەی جەنابت وا دەگەیەنێت کە بڕوات بە پەرەسەندن هەیە؟

ماکوان: بەڵێ ١٠٠٪ بڕوام پێیەتی، خوای گەورە هەموو شتێکی بە پەرەسەندنی ئاراستەکراوی خوایی دروست کردووە.

وەرزێر: سەیرە. یەکەم جارە لەگەڵ موسڵمانێک دابنیشم و بەم جۆرە ئاخاوتن بکات، ئەوانەی کە گفتوگۆ و دیبەیتمان کردووە لەگەڵیاندا هەموو بەیەک ڕیتم ڕۆشتوون کە خوا لە کن فیکون دا هەموو بوونی دروست کردووە و بڕوایان بە بەدیهێنەری سەربەخۆ هەبووە، بەڵام جەنابت ڕێگاکەت گۆڕی سەریشت لە من تێکداوە، ناتوانم زیاتر پرسیار بکەم، بەڵام ڕازیت کۆڕێکی داخراو بگرین لە گروپی زانست و گەڕان بۆ ئەم باسە و ئەو دوو بانگخوازە و مەلایەش بانگ دەکەین، چونکە ئەوان زیاتر شارەزان لە بواری دینیدا.

ماکوان: من هیچ کێشەم نییە، بەڵام شتێکی گرنگ هەیە بیزانە تۆ کەسێکی زۆر زیرەک و ئاقڵیت خۆشمویستی لەبەر ئەوەی ڕاستگۆ بوویت، بۆ زانیاریت من پرسیارت لێناکەم چونکە هەست دەکەم ماندووی بەڵام دەبێت خۆت ئامادە بکەیت بۆ وەڵامی پرسیارەکانم ئەگەر لە توانات نەبوو مانای وانییە دۆڕاویت مانای وایە لە قۆناغێکی ئاقڵی ورد بیتەوە دەڕۆیت بۆ ئاستێکی بەرز و قوڵتر و فراوان بوونی زیاتری مەودای بیروباوەڕت، هیوام وایە ئەم پەیامە بە هاوڕێکانی تریشت بگەیەنیت، من نایەم سەرکەوم بە سەرتاندا، من دێم ئاڵوگۆڕی بیروباوەڕ دەکەین.

وەرزێر: کاک ماکوان لە هەر وشەو ڕستەیەکی جەنابت قوڵی و ڕاستی و جورئەتی تێدایە، منیش حەزدەکەم پێت بڵێم لەهەموو ژیانمدا هێندەی ئەم ئێوارەیە لەزەتم لە گفتوگۆ نەبردووە.

ئاری: کاک ماکوان پێش هاتنت من بە کاک وەرزێرم وت، کە کاک ماکوان زۆر جیاوازترە لەو خەڵکانەی کە پێشتر کاک وەرزێر ئاخافتنی لەگەڵ کردوون.

ماکوان: جەنابت چۆن من دەناسیت کاک ئاری بەڕێز؟



ئاری: له ڕێگای پاڵتۆڵکەوە گوێگری قسەکانت بووم.

ماکوان: تۆش وەکو کاک وەرزێر بیردەکەیتەوە یان موسڵمانیت؟

ئاری: من لەنێوانی هەردووکتاندام،کێشەی من ئەوەیە خۆمم بۆ ساغ نابێتەوە.

ماکوان: زۆرباشە، ئێستا چی بکەین؟

وەرزێر: ئەگەر کات دابێنین بۆ دانیشتنێکی تر زۆر سوپاست دەکەم.

ماکوان: زۆر بە خۆشحاڵییەوە.

وەرزێر: لە کات و شوێن ئاگادارت دەکەمەوە.

ماکوان: دە مادام وایە ئیزنی من بدەن کە بڕۆم کات درەنگە بافریای نوێژی مەغریب بکەوم.

ئاری: من سەیارەم پێیە دەتگەیەنم.

وەرزێر: منیش سەیارەم پێیە چۆن دەهێڵم خۆت بڕۆیت، خۆم لەخزمەتا دەبم پێم خۆشە ئەم ئێوارەیە میوانی من بیت.

ماکوان: ناتوانم ئەمجارە بۆ جارێکی تر، چونکە پەیمانم داوە بە باپیرم کە لە خزمەتی ئەودا بم، بۆیە دەمەوێت بڕۆم با دوو قسەم پێنەڵێت.

وەرزێر: کاک ماکوان من ئەتگەیەنم بفەرموو، داوایەکی ترم لێت هەیە ئەو ڕۆژەی کە کۆڕە داخراوەکە دەگرین، هیوادارم ڕازی بیت گەنم بێت.

ماکوان: ئافرەتی تری لێ دەبێت؟

وەرزێر: نا بڕوا ناکەم.

ماکوان: منیش خوشکی خۆم ناهێنم بۆ ئەو جێگایە بەتەنها، خوشکێکی خۆت یان دایکت بهێنە با منیش گەنم بهێنم، ڕوونە؟

وەرزێر: بەڵێ ڕوونە.

ماکوان: من دەتوانم خەڵک بانگ بکەم بۆ ئەو کۆڕە؟

وەرزێر: کۆڕەکە داخراوە و جێگاکەی بچووکە و ئەگەر ٥ بۆ ١٠ کەس بن زۆر باش دەبێت، بەڵام زیاتر نەبێت.

ماکوان: زۆرباشە لای خۆتانە و بزانین لەگەڵ مندا دە کەس بانگ دەکەم، ئەوە ئێوە حسابی بۆ بکەن کە دە کەس لەگەڵمدا دێتە ناو کۆڕەکە.

وەرزێر: کەسەکان کێن کاک ماکوان، دەکرێت بزانین؟

ماکوان: بۆ دەترسن؟

وەرزێر: بەڵێ، ئەگەر ڕاستت دەوێت.

ماکوان: من لە هەموویان ترسناک ترم، کە من خاوەنی کۆڕ بم ئێوە ترستان نەبێت، ئەوانەی دێن جارێ نازانم کێن تا ئەم ساتە بیرم لێنەکردۆتەوە، پێم بڵێ تەلەفۆن بۆ گەنم دەکەیت بەیەکەوە قسە دەکەن؟

وەرزێر: زۆر کەم، کاک ماکوان بڕوا بکە زۆر کەم.

ماکوان: زۆرباشە، من لەم مزگەوتە دابەزێنە خۆم دەڕۆمەوە بۆ ماڵەوە، ئێرە مزگەوتی عەلی کەمالە و ئەویش ماڵی ئێمەیە بۆ ئەوەی بیزانیت، سوپاس بۆ ماندوو بوونت، چاوەڕوانی کۆڕە داخراوەکەم.

وەرزێر: بەسەرچاو، بەزوترین کات ئاگادارت دەکەمەوە.

دوای ماڵاوایی چوومە مزگەوت و نوێژی مەغریبم کرد و بەرەو ماڵەوە ڕۆشتم، چوومە لای باپیرم و شەوم لای ئەو بردە سەر و بەیانی تەلەفۆنم کرد بۆ ئەنوەر کە بە سەیارەکەی ئەو بڕۆین بۆ باخەکەی دوکتۆر چالاک لە زڕگوێز، هات بە شوێنمدا داوام لێکرد کە بڕۆین بەیەکەوە نان بخۆین کاتژمێر ١ی نیوەڕۆ بوو من نانم نەخواردبوو، ڕازیم کرد کەباب و نمەک کەوتە نێوانمان و بەقسەی خۆش و گوێگرتن لە گۆرانی چووین بۆ باخەکە، لەڕێگادا ئەنوەر وتی: نازانم تۆ چۆن ئەم ڕەفتارانەت هەیە و ئیسلامیشی؟

ماکوان: بۆ بەدیدو تێڕوانینی تۆ ئەوەی کە موسڵمان بوو ئیتر نابێت گوێ لە موزیک و گۆرانی بگرێت، ئەم قسیەت لەکوێوە هێناوە.

ئەنوەر: کاکە تورە مەبە بڕوام پێ بکە لەم ڕۆژانەدا گوێم لە ڕادیۆیەک بوو ئەیوت شەیتان میز دەکاتە گوێت یان وتی گوێت زینا دەکات، بۆیە وا دەڵێم.

دامە قاقای پێکەنین و وتم: لێخورە هەی دنیا و قیامەت فەوتاو.

ئەنوەر: بڕوام پێ ناکەیت، ئەزانم.

ماکوان: بڕوات پێدەکەم بۆ زینای گوێکە بەڵام میزەکە قسەی خۆتە.

گەیشتینە ناو باخەکە من چووم بۆلای سرەو و چۆنی و چاکیم لەگەڵ کرد، وتم حەتمەن دوکتۆر چالاک بەهەموویانی وتووە کە من نەخۆش نیم، سروەی خوشکی سرەو هات و هەندێک قسەمان کرد وتم با بڕۆین بۆلای حاجی عەبدولکەریمی باوکتان و مەرحەبایەکی بکەم، کە چووم بۆ خزمەتی خەریکی پاککردنەوە و بژاری باخەکەی دوکتۆر بوو، دوای سڵاوکردن وتم خۆ شوکر لێرە مورتاحن؟

حاجی عەبدولکەریم: سوپاس بۆ خوا زۆر باشین، خوای گەورە بیکردایە سرەو چاک بوایەتەوە من هیچم نەدەویست.

ماکوان: دەستم کرد بە گیرفانمدا و دەفتەرێک پارەم دایە دەستی حاجی عەبدولکەریم بە بەرچاوی سرەو و سروەوە وتم: ئەوە بەکار بهێنە بۆ سرەو، مەهێڵە لە هیچیان کەم بێت، بەڵام مەهێڵن دوکتۆر چالاک بزانێت من پارەم داونەتێ، هەرچەندە پیاوێکی چاکە بەڵام مرۆڤە و با دڵ و دەروونی نەگۆڕێت، باشە.

حاجی عەبدولکەریم: کاک ماکوان بەخوا ئەوە زۆر زۆرە، برا سروە ملیۆنێک دیناری دامێ کە تۆ دابوتێ زۆر یارمەتیت داوین پێویست ناکات.







ماکوان: من ملیۆنە دینارەکەم داوە بە سروە و سرەو تا بیدەن بە جلوبەرگ و پێداویستی خۆیان، بۆ داویانە بە تۆ نازانم، حاجی گیان کچەکانت پێداویستیان زۆرە ئەزانم کەوا ئێوە دەست کورتن، بەڵام خوای گەورە دەرگای خێری زۆر لەمن کردۆتەوە، ئێوە سەرفی بکەن پارە وەکو کانی وایە کە سەرفت کرد بە سازگاری دەمێنێتەوە و بەدوایدا دێت.

سروە: کاک ماکوان گیان بەخوا باوکم زۆر ماندووە.

ماکوان: ئەزانم ماندووە بەڵام لێی بپرسە بزانە چی لە پارەکە کردووە، ئەزانم هەڵی گرتووە، دەزانم دەقی نەشکاوە و چۆنتان لەمن وەرگرتووە ئاوا ماوەتەوە وایە؟

حاجی عەبدولکەریم دەستی کرد بە گیرفانیدا وتی بەخوا برا وایە، دامنابوو بۆ مەسرەفی سرەو، برا ئەوە دامەوە دەست سروە و سرەو خۆیان بڕۆن چی لێ دەکەن من حەقم نییە، پێیان نەوتبووم تۆ داوتە بەوان.

دەستم کرد بە پێکەنین و وتم: بەخوا شازی کچت هەیە و بەهەشتت بۆ خۆت مسۆگەر کردووە ان شاءالله، باشت پەروەردە کردوون، دەست پاک و ئەمینن. خۆشبەحاڵی ئەو کەسەی کە کچەکانی تۆ دەبنە هاوسەریان.

سروە و سرەو قسەکەی منیان پێخۆش بوو.

بەردەوام بووم وتم: براکەتان بیر نەچێت شتێکیش بۆ ئەو بکڕن.

سرەو: جا کاک ماکوان گیان هەر ئەو تاکە برایەمان هەیە تۆ بڵێیت لەبیری بکەین؟

ماکوان: ئەی من چیتانم؟ خاڵ یان مام؟

سروە: تۆ برا گەورە و خاڵۆمانیت.

ماکوان: زۆرباشە باسی هیچ مەکەن من دەڕۆمەوە بۆلای نەخۆشەکانی دوکتۆر، سرەو دەزانێت تۆش دەبیت لەگەڵماندا دابنیشیت وایە؟



سرەو: بەڵێ دوکتۆر پێی وتم کە چی دەکەین و چۆن هەڵسوکەوت دەکەین.

ماکوان: بەیارمەتی دەڕۆم بۆلای ئەو کچانە بزانم حاڵوگوزەرانیان چۆنە.

چوومە لای ئازا و سازان و خەجیج و کەسێکی تریشیان لەگەڵ بوو بەناوی وشە، پیاوانیش حاجی سەمیر هات و بەگەرمی چۆنی و چاکی کرد و هەواڵم پرسی و کاک فایەق و نامیق و کاک کامەران ئەویش زۆر گەرموگوڕ بوو، هەواڵی دلاوەر و گەلآم پرسی وتیان چوون بۆ عومرە و مانگی هەنگوینیان بردووە بۆ مەککە و هەفتەی داهاتوو دەگەڕێنەوە، زۆر خۆشحاڵ بووم بۆیان.

ئەوەی کە سەرنجی ڕاکێشام سەلیبەکەی ئازار بوو نە لەملیدا مابوو نە بەسەیارەکەیەوە بوو، یەکسەر چاوم چووە سەر سەیارەکەی و زانیم کە سوپاس بۆخوا کاریگەریم لەسەری داناوە.

چووم بۆلای ئازار وتم: ئەی بۆ کۆتایی ناهێنیت بە هەموو شتێک لەگەڵ کاک فایەق خۆم مارەتان بکەم لەیەکتر.

ئازار: بڵێم چی کاک ماکوان شەخسێتی زۆر لاوازە، ناتوانێت بڕیار بدات.

ماکوان: کورە فەقیرە دردە دارە کەسایەتی چی لاوازە، خۆ تۆ ناتەوێت بیکەیت بە سەرۆکی حکومەت، چەند ڕۆژێک لە ژیاندا ماوین بەخۆشی و شادی و حەلاڵی بیبەنە سەر.

بەڵکو خوای گەورە ڕەحممان پێ بکات، قسەکانم لەگەڵ ئازار تەواو نەکرد بوو دوکتۆر چالاک بانگی کردین وتی دانیشتنەکە دەست پێدەکات. منیش چوومە نێوانی خەجیج و ئازار لە سەر کورسییەک دانیشتم، ئەنوەر تەماشای دەکردم و پێدەکەنی.

ماکوان: بۆ پێدەکەنیت لەبەر ئەوەی لەناو ژنان دانیشتووم؟



لەناو سەیارەکەش کە گۆرانیم دەوت لای سەیر بوو.

ئێ برا خەجیج و ئازار هەردووکیان خوشکی منن بۆ پێت ناخۆشە، قسەکانمان بە پێکەنینەوە بوو.

ئەنوەر: کاکە بەخوا هیچم نەوتووە، بەس مەنزەرەکەم پێ جوان بوو لەخۆشیدا پێدەکەنم، خۆزگە هەموو ئیسلامییەکان وەکو تۆ بوونایە.

دوکتۆر چالاک چەپڵەیەکی لێداو وتی: ئەمڕۆ خۆشترین چیرۆک لەدەمی کەسێکەوە دەبیستین، تەمەنا دەکەم بۆ هەموتان بەو شێوەیە بێتەدی، ئەمڕۆ خوشکێکی بەڕێزتان پێ دەناسێنین ئەویش خوشکە سرەوە ئەو چیرۆکەکەمان بۆ باس دەکات.

لەو کاتەدا حاجی عەبدولکەریم چای هێنا من خێرا هەستام لێم وەرگرتوو وتم جەنابتان تەشریف بەرن من دەیگێڕم، چونکە دانیشتنەکە تایبەتە، ویستم سرەو ئیحراج نەبێت من نەشم دەزانی باسی چی دەکات سرەو، هەموو لایەک بەخێرهاتنی سرەویان کرد، سرەو دەستی کرد بە قسەکردن.

سرەو: نزیکەی مانگێک بەر لە ئێستا خۆشترین ڕۆژی ژیانم بوو، پێشتر لە نەخۆشخانە و جێگاکانی تر ئاگاداریان کردبوومەوە کە تووشی نەخۆشی سەرەتانی مێشک بووم، هاتم بۆ سلێمانی پشکنینم کرد و بردمەوە بۆ نەخۆشخانەی هیوا وتیان تۆ هیچت نییە.

لە خۆشیا خێرا گەڕامەوە بۆ دەربەندیخان لەگەڵ خوشکەکەم، ئەوکات ماڵمان لەوێ بوو، پشکنینەکەم فڕێ دایە ناو تەنەکەی خۆڵ، خەریکی گسک دان بووم چاوم کەوتە سەر تەنەکەی خۆڵەکەو یەکسەر ناوی سەر پشکنینەکەم بینی کە نوسرابوو خەسرەو عەبدولکەریم، خێرا دەرمهێنایەوە تەماشام کرد ناوی مامۆستا خەسرەوی لەسەرە، پشکنینەکەی منیش بەهەڵە درابوو بە مامۆستا خەسرەو.



مەجلیسەکە بێدەنگ بوون بەردەوام نەیاندەزانی مەوزوع چییە، و خەسرەو کێیە؟ هەموو سەیری سرەویان دەکرد و چاوەڕوان بوون بەردەوام بێت، سرەویش دەستی کرد بە گریان، منیش دەستم کرد بە گریان، ئەو بۆ نەهامەتی خۆی دەگریا منیش بیری ئەو نەهامەتی و ناڕەحەتییەی ڕۆژانی پێشترم دەکەوتەوە و لەخۆشیشدا دەگریام.

دیسان هەموو واقیان ڕما بوو بەدیار گریانی من و سرەو، لە پڕ دوکتۆر چالاک وتی: کاک ماکوان تۆ قسە دەکەیت یان من قسە بکەم؟

بەچاوی پڕ لە گریانەوە فەرمووم کرد لە دوکتۆر چالاک.

د. چالاک: بەڕێزان سوپاس بۆ خوا کاک ماکوان نەخۆش نییە، بەڵکو وەڵامی پشکنینەکەی (خەسرەو عەبدولکەریم)گۆڕابوو بە هۆکاری لێکچوونی ناویان لەگەڵ دادە (سرەو عەبدولکەریم)، کاک ماکوان لە ڕاستیدا ناوی خەسرەو عەبدولکەریم-ە.

حاجی سەمیر دەستی کرد بە گریان و باوەشی پیا کردم، هەموو خوشکەکان بێجگە وشە کە تازە ناسیبووم دەگریان و پیرۆزباییان لێ دەکردم.

پیاوەکان یەکە بە یەکە هاتن و ئەملاولایان ماچ کردم، بەڵام زۆر هەستم بە ئیحراجی دەکرد و نەمدەزانی بۆ؟

ماکوان: بەدڵی خۆم قسە بکەم یان بە دڵی ئێوە؟ ئەنوەر تۆ و کامەران و کچەکان لێم توڕە مەبن، خۆ دڵنیا بن ئەگەر لێشم توڕە بن من ئەمڕۆ تەنها سەر دادەخەم.

هەموو فەرموویان لێ کردم کە بەئارەزووی دڵی خۆم قسە بکەم.

ماکوان: برایان و خوشکانی زۆر موحتەرەم کەس هەست بە ئێوە ناکات من هەستتان پێدەکەم، چونکە لەگەڵتاندا ژیاوم و لەناو واقیعەکەدا بووم، ڕاستیتان دەوێت گۆڕانی قەدەری ژیانمان زۆر ئاسانە کە منیش تووش بووم

خوای گەورە ئێوەی پێ ناساندم، قەدەرێکە کە زۆر سەیرە لەسەر دەستی من دلاوەر و گەڵا بەیەک گەیشتن، من خوشکێکی خۆم دۆزییەوە بە هۆکاری ئەم نەخۆشییەوە، سرەو خۆی و کەسوکاری تا ڕادەیەک ئاسانکارییان بۆ کرا، هەڵبەت لەلایەن دوکتۆرەوە، بەڵام قەدەری نەخۆشی منی هەڵگرتبوو، ناسینی خەجیج و سازان و ئازار هەروا شتێکی ڕێکەوت و ئاسان نییە خۆشیان باش دەزانن کە چ پەیوەندییەکی برایەتی و وخوشکایەتی لە نێوانماندا دروست بووە، ئاسایی نییە کە من و ئەنوەر لەوپەڕی شەڕ کردنەوە ببینە هاوڕێی خۆشەویستی یەکتر، ئاسایی نییە دوکتۆر چالاک لەماوەیەکی کەمدا لێکۆڵینەوەکەی قبوڵ بکرێت لە باشترین زانکۆ لە (تۆرێنتۆی) کەنەدا.

بۆیە دەشێت ئەم نەخۆشییە سەرچاوەی ژیانەوە بێت، بە هەڵە تێمەگەن مەبەستم ورە بەرز کردنەوەتان نییە، بەڵکو مەبەستم حەقیقەتی ژیانە بۆیە زۆرجار خوای گەورە نەخۆشمان دەخات دەیەوێت بە پاکی بمانگەڕێنێتەوە لای خۆی، زۆرجار مرۆڤ بەهۆکاری ئازارەکانی هەست بە تاوانباری خۆی دەکات سوێند دەخۆم ئازار وەرگرتن لە هەژاری، لە نەخۆشی دوور بوون، لە زیندان، لە کەمئەندامێتی، نزیکبوونەوەی خودی ئەو مرۆڤەیە لە خواناسی و چاکەکاری، بەڵام ئەگەر سوود لەو هەلە وەرنەگریت دنیاو قیامەتان دەفەوتێت وەکو ئەنوەر (لێرەدا دەستم کرد بە پێکەنین).

کۆتایی بە قسەکانم دەهێنم هەموتان دەعوەت دەکەم بۆ کۆڕێکی داخراو کە کۆمەڵێک بێدین و مەلای کافر و بانگخوازی خوانەناس بۆیان ڕێکخستووم (هەموو دەستیان کرد بە پێکەنین) وایان دەزانی گاڵتەیان پێدەکەم، من بەهەموو شێوەیەک هاوکارتان دەبم بە ماددی و مەعنەوی هەریەکێک بم لە ئێوە بۆ خزمەتی لێکۆڵینەوەکەی دوکتۆر و ئێوەی بەڕێز، ٥ دەفتەر دەکەم بە دیاری بۆ هەموتان تکا دەکەم سندوقێک بکەنەوە کە ئێوەش هاوکار بن بۆ سەدان و هەزارانی تری توش بوو کە توانای هیچیان

نییە، من دوعا بۆ هەندێکتان دەکەم و دوعای شیفاو هیدایەتیش بۆ هەندێکی ترتان بە تایبەت بۆ ئەنوەری برام و دوکتۆر چالاک دەکەم، ئیتر من نایەمەوە ئێرە و کاتی گەڕانەوەشم بۆ ئەوروپا زۆر نزیکە، ئەوەش ٥ دەفتەرەکە لەبەرچاوی هەموویان دامە دەستی دوکتۆر چالاک و بێدەنگ دانیشتم.



# چوون بۆ کۆڕی زانست و گەڕان

لەدوای دانیشتنم بەبێ دەنگی دوکتۆر چالاک داوای کرد کە کێ قسەیەکی هەیە با بفەرمووێت.

ئازار دەستی بەرز کردەوە و وتی: ئەگەر ئێمەش لە سەرەتادا خاوەنی پرەنسیپی عیشق بوینایە وەکو کاک ماکوان دەرباز دەبووین، بەڕاستی لەماوەیەکی کورتدا زۆر شتی لێوە فێربووم، خۆزگەم دەخواست تۆ باوک یان برا گەورە یان کەسێکی نزیکی من بوویتایە تا زیاتر لێت بەهرەمەند بومایە، تۆ ڕاست دەکەیت ئاسایی نییە هاتنەکەت بۆلام، ڕۆشتنیشت هەر ئاسایی نییە، ڕاستە من نەخۆش بووم، بەڵام ئەم ئێوارەیە زانیم کە ژیان دەستی پێکردووە لای من، ئەمەوێت بڵێم کاک ماکوان سوپاست دەکەم لەوەی کە فێر بووم لێتەوە.

د. چالاک: چی فێر بوویت لە کاک ماکوان، ئازار خان؟

ئازار: پرەنسیپی عیشق.

مەجلیسەکە بێدەنگ بوو، دیسان دوکتۆر چالاک وتی کێ قسەی هەیە؟

ئەنوەر: ئەگەر یارمەتی هەبێت.

د. چالاک: بفەرموو:

ئەنوەر: حەز دەکەم خوێندنەوەیەک بۆ ماکوان بکەم، ئەگەر ئیجازەم بدەن.

د. چالاک: کاک ماکوان ئیجازە هەیە بۆ کاک ئەنوەر خوێندنەوەت بۆ بکات؟



بەپێکەنینەوە وتم: نەخێر؛ چونکە ڕقی لێمە، بەڵام کێشە نییە لەبەرخاتری ئێوە با کاک ئەنوەری برام بفەرموێت، بەڵام خاترم بگرێت و نەمشوات، کە وام وت هەموویان دەستیان کرد بە پێکەنین.

ئەنوەر: وەڵڵا قسەیەکی هەڵە بکەم ئازار و سازان و خەجیج دەمکوژن، بابە تۆ وەکو موعەمەر قەزافی وایت پاسەوانەکانت ئافرەتن.

بە پێکەنینەوە وتی: ڕاستی زۆر ڕقم لە ماکوان بوو، هەستم کرد کەسێکە خۆی دەنوێنێت، یان تەمسیل دەکات، بەڵام دوێنێ و ئەمڕۆ بۆم دەرکەوت من هەڵە بووم، ماکوان وێڕای ئەوەی زۆر جیاوازم لەگەڵیدا لەڕووی بیروباوەڕ، بەڵام دەمەوێت پێی بڵێم زۆرم خۆش دەوێت. لەبەر ئەوەی ڕێزی ئافرەتت لایە، زۆرم خۆش دەوێیت چونکە باسی عیشق دەکەیت و مۆسیقات لا جوانە، خۆت جوانی، شانۆت خۆش دەوێت پڕ پڕی لە زانیاری، دووری لە ڕق و کینە و لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ماکوان بەچاوی مرۆڤ تەماشای ژن و پیاوی کافر و موسڵمان و هەموو چین و توێژەکان دەکات، ئەمڕۆ قسەیەکی زۆر جوانی بۆ کردم و وتی: ئەنوەری برام ئەگەرچی من و تۆ لە بیروباوەڕدا جیاوازین، بەڵام لەزۆر شتی تردا هاوبەشین من و تۆ مرۆڤین، هەموو مرۆڤێک ٧٠٪ هاوبەشن، ٣٠٪ جیاوازن، ئەو هەموو هاوبەشییە واز لێ ناهێنم بۆ خاتری لە ٣٠٪ بەو مەرجەی پێشێلی سنووری یەکتر نەکەین.

ئەم قسەیە هەموو کەس نایکات بەڵکو تەنها مرۆڤە جوانەکات دەیکەن منیش قسەکەی هاوڕێ ئازار دووبارە دەکەمەوە ماکوان خۆی پرنسیپی عیشقە.

ماکوان: زۆر سوپاسی ئەنوەری برام دەکەم.

کامەران: منیش قسەیەکی دڵی خۆمدەکەم، ئەگەر ماکوان لە نەخۆشییەکەیدا ٥ دەفتەری بدایە، دەموت خۆی ئامادە کردووە بۆ مەرگ بۆیە پارەی لا گرنگ نییە، بەڵام لەدوای ئەوەی کە زانی نەخۆش نییە ئەو

پارەیەی پێشکەشی ئەم کۆڕ و مەجلیسە کرد، منیش دەڵێم ماکوان کەسێکی جوان و ڕاستگۆیە لەگەڵ خۆی و خەڵک و دینەکەیدا، سوپاس بۆ ماکوانی بەڕێز.

ماکوان: سوپاس کامەرانی برام.

خەجیج: من پێشتر تەنها قسەم لەگەڵ خۆمدا دەکرد، یان زۆر جار قسەم بۆ گوڵ و ئینجانەکانم دەکرد، یان زۆربەی کاتەکان قسەم لەگەڵ وێنەکاندا دەکرد، بەڵام ماکوان فێری کردم قسە لەگەڵ خوا بکەم، زۆر سوپاس ماکوان.

ماکوان: سوپاس بۆ خوا پاشان سوپاس بۆ تۆ خەجیج خانی خوشکم.

وشە: ئەرێ ئەم ماکوانە چییە و کردتان بەچی، من بۆ پیاهەڵدان نەهاتووم، ئیتر بەسە ماکوان نەبڕایەوە.

ئەنوەر خێرا هەڵیدایە و وتی: وشەی بەڕێز منیش وەکو تۆ کە ئەوەندەیان بەشان و باڵیدا هەڵدا زۆر ڕقم لێ هەڵسا، دڵنیابە ئەو حاڵەتەی کە ئێستا تۆی تێدایی منیش پێیدا تێپەڕیم، بەڵام هێمن بەرەوە و ماکوان زۆر لەوە زیاتر دەهێنێت کە وتیان.

دیاربوو کەس گوێی نەدایە قسەکانی وشە، منیش هیچم نەوت، بەڵام ئەنوەر توانی ئەویش و خەڵکەکەش هێمن بکاتەوە، کەس قسەکەی وشەی بەهەند وەرنەگرت، منیش زۆر سادە بوو لام.

د. چالاک: خواردن ئامادەکراوە بابڕۆین بۆ نان خواردن و پشوبدەن، هەموو ڕۆشتین و چووم بۆلای ئەنوەر وتم دەمگەیەنیتەوە سلێمانی تا شەڕێکی تر دروست نەبووە؟

ئەنوەر: گوێ مەدەرێ ئاسایی وەریبگرە.

ماکوان: سوێند دەخۆم کە زۆر ئاسایی بوو لام، لەبەر ئەو ناڵێم بەڵام ئیتر بوونی من لەم جێگایەدا زۆر زیادەیە.





ئەنوەر: باشە بەسەرچاو با داوای یارمەتی بکەین لە د. چالاک دەڕۆین.

من و ئەنوەر چووین بۆلای دوکتۆر چالاک و داوامان کرد ئیجازەمان بدات، ماڵاوایمان کردو ئەنوەر منی گەیاندەوە بۆ ماڵەوە.

بۆ سبەینێ لەگەڵ پێشڕەوی برام چووم بۆ هەولێر و دەعوەتی وەزیری یەکەمی کابینەی حکومەتی هەرێم بووم، کە وەزارەتی کشتوکاڵی درابوویە لە سەر لیستی بزوتنەوەی ئیسلامی. بۆ شەوەکەی لە گەڕەکی ئیسکان مەوعیدم هەبوو لەگەڵ سەرداری هاوڕێم، سەردار هات و دوای هەواڵپرسین و تۆزێک گەڕانی شەوانی ئیسکانی هەولێردا چووینە چاخانەیەک دانیشتین، پێشڕەو لەگەڵ چەند کەسێکی تر لەدەرەوەی چاخانەکە دانیشتبوون، من باسەکەم بۆ سەردار گێڕایەوە ئەوەی سەروەری بەلوعەو تاڤانە ڕەش دەڵێن من منداڵێکم هەیە لە تاڤان، تاکە هاوڕێ و کەسێک کە ئاگاداری من بوو کە ئەو حەبەم خواردووە تۆ بوویت سەردار، تاڤان دەڵێت گوایە تۆ منت بەجێ هێشتووە ئەویش لەگەڵما خەوتووە، ڕاستیش دەکات من کە هەڵسام لە خەو هەستم کرد لەش گران بووم.

سەردار سوێند و تەڵاقی بۆ خواردم کە بەجێی نەهێشتووم، بەڵکو شاهیدی هەیە، سەلامیش لەوێ بووە هەردووکیان کۆنکەنیان کردووە، تاڤانە ڕەش درۆ دەکات شتی وا ڕووی نەداوە، کە هەڵسایت خۆت وتت کە لەش گران بووم، چویت لە بۆریەکەی زێویێ خۆت شۆرد، سەلام و هیوا چەرچەفیان بۆ گرتبوویت، تاڤان درۆ دەکات ئەگەر شتی وا ڕووی بدایە واتا من خیانەتم لێ کردوویت تۆ سوێندت دام کە بەجێت نەهێڵم، شاهیدەکەشم سەلامە، سەلامیش لە سلێمانییە لەبازاڕی جگەرە فرۆشەکانە. تەلەفۆنەکەیم لانییە بەڵام دەزانم لەوێیە و کاری جوملەی جگەرە دەکات.

کەوای وت لە خۆشیا سوجدەی شوکرم برد، پێشڕەو و هاوڕێکانی تەماشیان دەکردم، هاتن وتیان چی بووە وتم کاکە سەردار هەواڵێکی خۆشی دامێ منیش سوجدەم برد نابێت، بڕۆن من و سەردار ئیشمان هەیە.



سەردار: کاکە بەخوا هەر لەگەڵ تۆ کاری وایان نەکردووە، بۆ زانیاریت خۆت دەزانی سەروەر لە ٣١ی ئاب ڕای کرد بۆ هەولێر، ماڵی عەزە بێ سمێڵ باوکی تاڤانە ڕەش ئەوانیش هاتن، ساڵی ١٩٩٧ سەروەر و تاڤان بەیەکەوە گیران لە جێگایەک لە هەولێر، ماڵی عەزە بێ سمێڵ گەڕانەوە بۆ سلێمانی، براکەی تاڤان نەگبەت بوو سوێندی خواردبوو ئەگەر سەروەر تاڤان نەهێنێت ئەیکوژێت، ٢٠٠١ تاڤانی هێنا، ئەوەندەی من بزانم چەند جار جیابونەتەوە، چەندین کێشەی هەبووە سەروەر لە ئاسایشی هەردوولا، خۆت باش دەزانیت سەروەر سومعەی باش نییە، تاڤان و ماڵی عەزەی بێ سمێڵ هەمان مەنجەڵ و سەرقاپی یەکترن، ئەوەندەی من بزانم سەروەر و تاڤان بۆ پارە کاری زۆر قێزەونیان کردووە، یەکێک لەوانەت بۆ باس دەکەم.

دەچووە بازاڕ خەڵکی دەهێناوە بۆ ماڵەوە، بەڵام پێش ئەوەی کاری لەگەڵ بکات سەروەر خۆی دەکرد بە ژوورا و پارە و سەروەت و سامانیان بەو شێوەیە پەیدا دەکرد، تا ئاسایش پێی زانین و ماوەی چەند مانگێک سەروەر زیندان بوو، جا کاکی خۆم بەخوا سوێند دەخۆم ئەم کارەش لەگەڵ تۆ فرتوفێڵە.

ماکوان: جا سەروەر چۆن شتی وا لەگەڵ من دەکات، بەخوا وەکو سەگ پەتی دەکەم، زۆر توڕە بووم.

سەردار هێمنی کردمەوە و وتی: لەگەڵ هیوا قسە دەکەم، تۆش بەوردی بیری لێ بکەرەوە بزانن چۆن و لەکوێ ئەم قسەیە هاتووە، ئینجا چۆن تۆ قبوڵت کردووە؟

ماکوان: کاکە من قبوڵم نەدەکرد، نەبەز زۆری لێکردم وتی حەیامان دەچێت، ئێستا خەڵک زۆر دەتناسن و شکات بکەیت بڵاو دەبێتەوە دوایی چی بکەین.

سەردار: نەبەزە شومی خۆمان؟





ماکوان: بەڵی نەبەز لەبەر کەسایەتی من وایوت، بۆیە منیش قبوڵم کرد، یەکەم جار کە پێی وتم خەریک بوو وەکو سەگ بیتۆپێنم.

سەردار: بەهەرحاڵ من سوێند و تەڵاقت بۆ دەخۆم کەشتی وا لە خێمەکەدا ڕووی نەداوە، بەڵکو من و سەلام لە خێمەکەدا بووین تۆمان بەجێ نەهێشتووە، شاهیدیت بۆ دەدەم لە دنیاو قیامەت. ئەگەر وتیشی دەیبەمە مەحکەمە مەترسە و درۆ دەکات، ئەگەر وای کرد ئەوا منو سەلام شاهیدین، سەلام پیاوە دەزانم ئەویش شاهیدی دەدات.

ماکوان: قوربانی تۆ بم، درێغیت نەکردووە من دەبێت بڕۆم.

سەردار: بە هیوام وتووە هەفتەی داهاتوو دێم بۆ سلێمانی لەوێ یەکتر دەبینین و خۆشم دێم بۆلای ئەو بێ ڕەوشتانە، دەستم دەکەم بەچاویانا، بەڵام پێش هاتنم سەلامم بۆ بدۆزەرەوە، بەڵام بە ئەقڵ کارەکە بکە و توڕە مەبە و هێمن بە، چونکە دەزانم توڕە بیت خراپی دەکەیت.

ماکوان: باشە مامە سەرداری برام خەمت نەبێت لەگەڵ هیواو نەبەز و وریا قسە دەکەم، چاوەڕێی تۆم کە هاتی بۆ سلێمانی تا دێیت بە پشتیوانی خوا سەلامیش پەیدا دەکەین.

ماڵاوایم لە سەردار کرد و گەڕامەوە بۆ سلێمانی بۆ ڕۆژی دواتر لەگەڵ هیواو نەبەز و وریا لەنووسینگەی خۆم کۆبوینەوە و وتمان چی بکەین باشە؟

هیوا: چی دەڵێیت وا دەکەین، بەڵام من شتێکم لە مێشک دایە، ئەگەر ئیجازەم بەن تەلەفۆنێک دەکەم بۆ کوڕێکی هاوڕێم لە ئاسایشە لەو گەڕەکەی ئەوانە، بزانین لە ئاسایش پاشەڵی چۆنە؟

ماکوان: من زۆر بەباشی دەزانم، کارێکی زۆر باشە.

هیوا پەیوەندی کرد بە هاوڕێکەیەوە و دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵ ئەودا لەپڕ چەند ڕۆژنامەنووسێکی هاوڕێم خۆیان کردبە نووسینگەدا،



هیوا هەڵسا چووە دەرەوە، ڕۆژنامەنووسەكان كەمێک دانیشتن زانیان دانیشتنەكەمان تایبەتە هەڵسان ئێمەیان بەجێ هێشت.

هەر من و نەبەز و وریا بووین، نەمانزانی هیوا چی بەسەر هات، چاوەڕێ بوین بێتەوە بڕۆین بۆ نان خواردنو لەوێوە بڕۆین سەلامی جگەرە بدۆزینەوە، هیوا هاتەوە پێدەكەنی، ڕووخساری چەندە ڕەش بوو پێكەنینكەی ئەوەندە گەشی كردبوو.

ماكوان: چییە هیوای برام، هیچت دەستكەوت؟

هیوا جنێوێكی دا بە سەروەر و وتی: كاكە پاشەڵی پیسە، چەندین ئیشی قۆڕی كردووە، هاوشێوەی ئەم كارەی لەگەڵ ئێمەدا كردویەتی، پێشتر بەهەمان شێوە هەمان سیناریۆی دووبارە كردۆتەوە لەگەڵ بەرپرسێک دا پارەی زۆری وەرگرتووە و تاڤانی بۆ ناردووە، یەكێک لەمنداڵەكانی بێجگە شێركۆ كردویەتی بە منداڵی ئەو، بەرپرسەكەش لەبەر حەیاو حورمەتی خۆی وازی لێ هێناوە و نەیهێشتووە شتەكە بڵاوبێتەوە، بەڵام دیارە لەگەڵ ژنەكەیدا خەوتووە.

ماكوان: ئەو كەسەی ئەمانەی بۆ باسكردیت لە ئاسایشە؟

هیوا: بەڵێ؛ ئێستا بۆی باس كردم وتی ئەگەر شتێكتان هەیە لەسەری سكاڵای لەسەر تۆمار بكەن، خێرا دەست بەجێ دان بەتاوانەكانیا دەنێت.

ماكوان: بەڵام سەیر لەوەدایە داوای پارەی لەمن نەكردووە، لەڕاستیدا هەر زۆر ئاسایی بووە.

وریا: پێدەچێت نەخشەی كێشا بێت بۆ داهاتوو لەداهاتوودا داوای پارەت لێبكات، نازانین چی لەژێر سەریدایە؟

هەموو بەیەكەوە ڕۆشتین بەرەو بازاڕی جگەرەكەی سلێمانی بۆ دۆزینەوەی سەلام، زۆری پێنەچوو سەلاممان دۆزییەوە و چووینە



نووسینگەکەی زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنی کردین، سەیر بوو بەلایەوە کە هەموو هاوڕێ کۆنەکان بەیەکەوە چووین بۆلای.

ماکوان: کاک سەلام بۆ شاهیدیەک هاتووم بۆلات، پێریّ لای سەردار بووم، ناوی بەڕێزتی هێنا و منیش هاتووم بەڕاست و دروستی باسەکەم بۆ بکەیت، بەڵام با من باسەکەت لەسەرەتاوە بۆ بگێڕمەوە.

دوای گێڕانەوەی باسەکە سەلام زۆری لا سەیر بوو.

سەلام: وەڵڵاهی مامە خەسرەو سەردار ڕاست دەکات ئێمە تۆمان بەجێ نەهێشت، من باش لەبیرمە تۆ وتت لەشم گران بووە با فریای نوێژی عەسر بکەوم من و کاک هیوای شارباژێڕی هاتین پەردەمان بۆ گرتی تا خۆت شت، وابوو؟

ماکوان: بەڵێ تەواوە وابوو، بەڵام ئەوە تێناگەم کە ئەم بنەماڵەیە ئەم فیتنەیە چییە دروستیان کردووە بۆ من و خۆشیان ئەوەندە بێ حورمەتانە باسی دەکەن، بەهەر حاڵ من تەلەفۆنێک دەکەم بۆ سەردار و هەواڵی جەنابیشت دەگەیەنم ئێستا.

تەلەفۆنم کرد بۆ سەردار و باسەکەی سەلامیشم بۆ گێڕاوە.

سەردار: کاکە من دەزانم ئەوانە بێ ڕەوشتن بۆ پارە هەموو شتێک دەکەن.

ماڵاوایمان لەسەردار کرد و لای سەلامیش هەستاین، هەرچەندە سەلام زۆر پیاوانە لەگەڵماندا ڕەفتاری کرد، ئامادەیی دەربڕی بۆ هەموو هاوکارییەک پاشان داوای کرد کە میوانی ئەو بین، بەڵام کاک سەلام کەبابی نەدەخوارد لەبەر ئەوەی (کۆلسترۆڵ) چەوری خوێنی بەرز بوو، ئەومان بەجێ هێشت و چووین بۆ کەبابخواردن، هیوا وتی ئەگەر دەیکوژیت با منت لەگەڵ بێت.




ماکوان: کوشتنی چی، ئەوە کەی پیاوی ئەوەیە شەرەفی کوشتنی بەر بکەوێت، من ئەگەر کەسێک بکوژم دەبێت بزانم لێی دەترسم یان لەخۆم باشترە و توانام بەسەریدا نییە، ئینجا بیر لەکوشتنی دەکەمەوە، تا ئێستاش بۆ تەنها چرکەیەک بیرم لەکوشتنی کەس نەکردۆتەوە، با جارێ نانەکەمان بخۆین دوایی بیری لێدەکەینەوە کە چی بکەین.

نەبەز: ئەرێ تۆو هیوا ئەم چرپە چرپەتان لە چییە، ئەگەر متمانەتان بە ئێمە نییە بابڕۆین و ئێوە بەجێ بهێڵین.

دیار بو ونەبەز پێیناخۆش بوو بەهەڵە تێگەیشت بوو...

ماکوان: کاکە لەبازاڕداین ناکرێت بەدەنگی بەرز قسە بکەین، هیوا دەڵێت با بیکوژین تۆ دەڵێی چی، ئەوە چرپەکەمان بوو.

کەوام وت یەک دوو کەس تەماشایان دەکردم و پێدەکەنین، باشبوو نەبەز هێمن بویەوە.

هیوا بە پێکەنینەوە قسەیەکی بە نەبەز وت و وتی: مامە تا پلەی بەرز بێتەوە ئەمە هەر کەرەکەی جارانە.

دەستمان کرد بە قسەی خۆش و نانخواردن، دوایی گەڕاینەوە بۆ نووسینگە و دەستمان کرد بە پلان دانان تا بزانین چی بکەین باشە.

هیوا: مامە من پلانێک لەمێشکمایە، بەڵام دەبێت تۆی تیا نەبێت، من و نەبەز و وریا جێبەجێی دەکەین.

ماکوان: جا چۆن دەبێت، دڵم ئاو ناخواتەوە سێ چوار دانە نەکێشم بەدەم و قەپۆزیا.

هیوا: ئەوە هەڵبگرە بۆ دوای پلانەکەی من، با بۆت باس بکەم پلانەکە چییە و چۆن دەست پێدەکەین.

هیوا بەوردی باسی کرد کە چی دەکات و چۆن ئیعتیرافی پێ دەکات.



ماکوان: ڕازیم.

ئەوان ڕۆشتن بۆ جێبەجێ کردنی پلانەکەیان و منیان بەجێ هێشت، منیش هاتمەوە بۆ ماڵەوە لەسەر جۆلانەی حەوشەکەمان لەگەڵ دایکم بەیەکەوە دانیشتین و قسەوباسمان دەکرد، لەپڕ شێرکۆ تەلەفۆنی بۆ کردم، وتی باوکە بۆ دیار نیت دوێنێ و ئەمڕۆ چاوەڕێم دەکردیت، منیش لای دایکم هەستام چوومە ژورەوە وتم کوڕی خۆم خەریکی ئەوە بووم کە بتبەم بۆ ئەوروپا، دەمەوێت ڕێگایەک بدۆزمەوە، تا ناوو تەسکەرەو پاسپۆرتت بەناوی خۆمەوە بۆ دەربهێنم، جارێ کێشەی ئاسایشم هەیە، دەبێت لەوێ چارەسەری بکەم، تەلەفۆنەکەم داخستەوە، ئەگەر ئەو تەلەفۆنی نەکردایە خۆم بەتەما بووم شەو تەلەفۆنی بۆ بکەم و ئەو قسانەی پێ بڵێم، چونکە ئەوە سەرەتای پلانەکەی هیوا بوو.

دەبوو ئەو قسەیە بگەیەنمە دەمی شێرکۆ و ئەویش بە تاڤانە ڕەش و سەروەری بگەیەنێت.

تەلەفۆنم کرد بۆ هیوا و وتم ئەوەی ویستان کردم، قسەکەم خستە دەمی شێرکۆ، هیوا زۆری پێخۆش بوو دیار بوو ئەوەی دەمانەویست بیکەین بەئاسانی دەهات بەدەستەوە، خوای گەورە زوو کاری گەندەڵ و خراپەکاران ئاشکرا دەکات.

شەویش هەواڵی مۆڵەتی گۆڤاری بزاڤم گەیشتە دەست لەلایەن پارێزەرەکەم کاک محمد سالار پاشان کە خۆشی یەکێک بوو لە دەستەی دامەزرێنەرانی، بۆ بەیانی دەستەی دامەزرێنەری گۆڤاری بزاڤ کۆبوینەوە و گۆڤاری بزاڤمان دامەزراند و بودجەی ساڵێکمان دانا، من بە خاوەن ئیمتیاز هەڵبژێردرام، کاک دلێر عەبدوڵڵا بە سەرنووسەر.

کاک محمد سالار پارێزەری گۆڤارەکە و بەڕێوەبەری نووسین و دەستەی نووسەران، کاک کاروان ڕەحمان بە لێپرسراوەی ئیداری، دەست کرا بەکارکردن لەگۆڤاری بزاڤ دا بە سیستەمی موکافەئە.

گەنم تەلەفۆنی کرد وتی: کاکە دەمەوێت بێم بۆلات لەگەڵ خۆم شێرکۆ بهێنم؟

ماکوان: نا کەسوکارم بەس خۆت وەرە واز لەو بهێنە، بۆچی بێتاقەت دیاری؟

گەنم: وەڵڵا هیچ ڕووینەداوە بەڵام هەر حەز دەکەم بێم بۆلات زۆر دڵم تەنگەو لەخۆم بێزارم.

ماکوان: وەرە هەرچی کەسەکەم بزانم بۆچی بێتاقەتی وەرە بۆلام خێرا، ئەگەر شتێک بووە پێم بڵێ با من بێم بۆلات.

گەنم: نەبەخوا هیچ نەبووە هەر حەز دەکەم بتبینم، بە بینینت دڵخۆش دەبم کاکە گیان.

ماکوان: دە وەرە باوکی من وەرە من لەخزمەتام.

تەلەفۆنەکەی داخستەوە، زۆر بەزەیم پیادەهاتەوە، من برای گەورەی بووم دەبوو دەوری باوک و براشی بۆ ببینم دەمزانی دڵشکاوە.

لەگەڵ برادەران بەردەوام بووم لەسەر ئیشوکارەکانی گۆڤارەکە و کۆتایی هات بە کۆبوونەکەمان، هێشتا گەنم نەگەیشتبوو، تەلەفۆنم بۆ کردەوە وتم بۆ دیار نەبویت؟

گەنم: کاکە وەڵڵا ئیزدیحامە، هێشتا لای سلێمانی پالاسم.

ماکوان: من دێم بۆ ئەسحابە سپی لەبەردەم صەمونخانەکە چاوەڕێت دەکەم، ئەگەر تۆش زوو گەیشتی چاوەڕێم بکە.

تەلەفۆنەکەم داخستەوە و بەرەو ئەسحابە سپی کەوتمە ڕێ گەیشتمە لای صەمونخانەکە و ئەویش پەیدا بوو، لەگەڵی سەرکەوتم وتی بچم بۆ کوێ؟

ماکوان: بۆ کوێ پێت خۆشە بڕۆ من لەخزمەتام.



گەنم: کاکە تۆ بڵێ حەز دەکەم بەدڵی تۆ بێت.

ماکوان: گەنم گیان دڵی من بەکەڵک نایەت، دلی من حەزی لەمەڵکەنی و برایم پاشا و پیرمەنصور و شێخان و سابونکەرانە، ئەوەش لەگەڵ حەزی تۆ ناگونجێت، یان ئەگەر پێت خۆشە ئەچینە سەرگۆڕی باوکم و فاتیحەیەکی بۆ دادەخەین و دوعای خێری بۆ دەکەین، دوای ئەوە بۆکوێ دەڵێیت دەڕۆین.

گەنم: وەڵڵا هەزار جار خۆشحاڵ دەبم با بڕۆین.

ماکوان، وشەی هەزارجارەکەت زۆر لەقسەی دایکم دەچوو، ئەوە بۆچی وا دەڵێیت؟

گەنم: واتە قسەکەت ئەوەندە خۆشە و باشە هەزار جار دووبارەی بکەیتەوە دەڵێم باشە.

ماکوان: دەی زۆرباشە هەزار جار بابڕۆین بۆ گردی سەیوان.

بەرەو گردی سەیوان ڕۆشتین لەوێ لەنزیک گۆڕەکەی باوکم سەیارەمان ڕاگرت و کەوتینە ڕێ ، فێرم کرد کە چووە سەرقەبران سڵاو بکات لەهەموو مردووەکان و بڵێ ئێمەش بەم نزیکانە بەویستی خوا پێتان دەگەینەوە.

گەنم: وەی کاکە خوانەکات، یاخوا تۆ نەمریت، عومری منیش بێت بۆ تۆ.

دەستم کرد بە پێکەنین و وتم: کورە گەنم گیان ئەوە ئاداب و زیکری سەرقەبرانە، دەبێت بیڵێیت من و تۆ پێمان خۆش بێت یان نا هەردوکمان دەمرین بۆیە دەبێت بڵێین: (السَّلامُ عَلَيكُمْ أهْلَ الدِّيارِ مِنَ المُؤْمِنِينَ والمُسْلِمِينَ، وَإنَّا إنْ شَاءَ اللهُ بِكُمْ لاحِقُونَ، أسْألُ اللهَ لَنا وَلَكُمُ العافِيَةَ) رواه مسلم




چووینە سەر قەبری باوکم ئەو زۆر گریا منیشی خستە گریان، ئینجا بۆم باسکرد کە باوکمان لەگەڵ خەڵکی دا چەندە پیاوێکی بەڕێز و زیرەک و باش بووە.

گەنم: بەداخەوە من هیچ لەژیانی باوکم نازانم.

ماکوان: با بڕۆین بۆت باسدەکەم هەموو ژیانی خەمت نەبێت.

بەس ئەوەندە بزانە باوکمان زۆر دەستودڵ باش بووە، لەدوای مردنی زانیمان چەند خزمەتی بە هەژار و بێوەژن و فەقێی مزگەوتەکان کردووە، دەیان ماڵی گرتبووە ئەستۆی خۆی هاوکاری دەکردن.

گەنم: وەڵڵا کاکە ئەگەر من هەزار دینار بەم بە فەقیرێک دایکم و جەمال ئەڵێن بۆ پارەی خۆت خەسار دەکەیت، ناهێڵن خێر بکەم، بەخوا پارەم یابێت بە هەر فەقیرێک ئەو دوانە وتویانە درۆ دەکات، کەچی تەماشای تۆ دەکەم هەر فەقیرێک بێت داوا بکات دەست نانێیت بە ڕوویەوە، زۆر موعجیبی ئەوەتم.

بە پێکەنینەوە جا ڕۆڵە هەر موعجیبی ئەوەمی..

گەنم: نەبەخوا کاکە ماشاءاللەت لێبێت بەخوا وەکو باوکم ئێستا تەماشات دەکەم و هەموو کەسایەتی باوکم لەتۆدا دەبینم.

ماکوان: هەروایە گەنم گیان، هیوادارم بتوانم لەداهاتوودا جێگای باوکم بگرمەوە بۆ تۆ و خۆشم، هەرچەندە بڕواناکەم باوکم پیاوێکی زۆر بەڕێز و گەورە و چاک بوو.

گەنم: ان شاءالله هەمووشمان هەروەکو باوکمان دەبین، بەڕاست بیرم چوو پێت بڵێم وەرزێر تەلەفۆنی بۆ کردم وتی لەگەڵ کاکەت دانیشتووین باسی تۆی زۆر کرد، داوای لێکردم کە گوایە تۆ ڕازی بکەم بۆ کوڕێکی داخراو منیش بێم لەگەڵت، وتی ئەو هەردوو خوشکەکەی بانگ دەکات.

ماکوان: ئێ چیتری وت، مام وەرزێری خۆمان؟



گەنم: وەڵڵا باسی تۆی کرد وتی ئاستی کاکەت زۆر بەرزە من نەمتوانیوە لەگەڵی دەربچم، هەرچی وتووە ڕاستەوخۆ یەکان گیر بووە لەگەڵ بیروبۆچونی ئەودا، تەنها ئەوەندەی وت، وتی کاکەت ڕازی بکە وەرە بۆ ئەو کۆڕە، منیش وتم هیچ لە کاکە ماکوانم ناشارمەوە پێی دەڵێم ئەگەر وتی باشە دێم.

ماکوان: باشە ئەگەر ئەو خوشکەکانی هاتن تۆش وەرە، حەزناکەم بەتەنها تۆ لەناو پیاواندا بیت، ئەگەر ئافرەتی تر هات هیچ کێشەم نییە تۆش وەرە، بەڵکو سوود وەربگریت لە کۆڕەکە.

گەنم: کاکە زۆر گەورە باسی دەکردی.

ماکوان: گەورەیی هەر بۆ خوا باشە، من نەگەورەم نە هیچ، بەڵام بڕوا بکە ئەوان خۆیان قەزەمن و زۆر بچووکن بۆیە منیان لا گەورەیە.

گەنم: وەڵڵا وانییە کاکە تۆ زۆر گەورەیت

کردم بە قسەی خۆش و سوعبەت لەگەڵیا وتم: لە تەمەندا یان لە باڵادا گەورەم؟ هەر زوو زوو دەیوت بۆ کوێ بڕۆین، منیش هیچ جێگایەکم شک نەدەبرد بۆی بڕۆین، لەکۆتاییدا وتم من بگەیەنەوە ماڵەوە و تۆش بڕۆرەوە بۆ ماڵەوە، ئاگام لێبوو پێی ناخۆش بوو حەزی دەکرد لەگەڵ من بێت، بەڵام منیش چارەم نەبوو، لەڕێگا منی بەرەو ماڵ هێنایەوە و هیوا تەلەفۆنی بۆ کردم پرسی لەکوێیت؟ وەرە بۆ ماڵی نەبەز لەوێین، بەڵام خۆت دوامەخە زوو وەرە زەرورە بەتەلەفۆن ناوترێت پێویستە قسە بکەین، بەگەنمم وت خێرا بڕۆ پێی لێبە دیارە شتێک ڕوویداوە، بمگەیەنە ماڵی هاوڕێکەم. گەیشتمە ماڵی نەبەز و خواحافیزیم کرد لە گەنم لەدەرگای ماڵی نەبەزم دا نەسرین خان دەرگای کردەوە وتم نەبەز لەماڵە؟

نەسرین خان: نەبەز و هەرچی منداڵی چڵمنی جارانی ڕەفیقتە لەژوورەوەن چاوەڕێی تۆن هەر چپە چپیانە، ناشێ ژن نەهێنیت؟

ماکوان: جارێ با ژن بۆ نەبەز بێهین، من بەشی خۆمم بردووە.





نەسرین: دەبڕۆ هەرتۆیان نوقسانی لەوان چڵمنتر.

ماكوان: باشە نەسرین خان گیان، چوومە ژورەوە نەبەز و وریا و هیوا و سەروەری بەلوعە و كوڕێكی تر دانیشتبوون، تەوقەم لەگەڵ هەموویان كرد كە هاتە سەر ئەو كەسەی كە نەمدەناسی پێیان ناساندم ناوی كاك یاسین بوو دیار بوو لە ئاسایشی سلێمانی كاری دەكرد.

هیوا: مام خەسرەو داوا لەبەڕێزت دەكەین كەهەموو شتەكان بەڕۆحێكی ڕیازی وەربگرە كاك سەروەری بەلوعە دەڵێت كامێرای شاراوە بووە، لەگەڵ كاك خەسرەو دا و هەموو ئیعتیرافێكی كردووە.

ماكوان: جوان تێمبگەیەنە چی بووە چیتان كردووە؟

یاسین: كاك ماكوان كاتی خۆی ئەوەی ڕوویداوە لەسەیرانگای زێوێ، تاڤان خانی خێزانی كاك سەروەر گوێی لێبووە كە ئەو ماوەیە جەنات كێشەی خەوتان هەبووە بە حەبی خەو دەخەوتیت، بەهەمان شێوە گوێی لێبووە كە بەدڵ سافی بە هاوڕێكانت وتووە لەشت گرانە و ئەبێ خۆت بشۆیت تاڤان و سەروەر ئەم سیناریۆیەیان بۆ دروست كردوویت، نە لەگەڵت خەوتووە نەهیچ هەمووی درۆو دەلەسەو ساختەچێتی بووە، وەكو مامە هیوا دەڵێت كامێرای شاراوەی سەروەرە فەنی بووە.

ماكوان: جا ئەم خوێڕییە بۆ وای كردووە لەگەڵ مندا، هۆكارەكەی چییە؟

هیوا: بەبێ ئەوەی پەنجەی لێبەم بەیەك تف ئیعتیرافی كرد بۆ ئەوەی شێركۆی كوڕیان بەریت بۆ نەرویج دوایی ئەم سەخیفە نیازی بووە سكاڵات لەسەر تۆمار بكات كە شێركۆ گەیشتە نەوێ لەڕێگای پۆلیسی ئەنتەرپولەوە بڵێن ماكوان فڕاندویەتی و ئینجا دایك و باوكی شێركۆ بەرن بۆ ئەوروپا.

ماكوان: ئەی ئەحمەقی وا نازانێت پێش چوونی شێركۆ پشكنینی DNA بۆ دەكرێت.



هیوا: ئەی ئەگەر ئەحمەق نەبێت کاری وا چۆن دەکات، وا ئەزانێت دنیا وەک لای خۆی منالّبازاڕە.

ماکوان: ئەی بۆ قسەیەک ناکەیت خوێڕی دوو لەڕووی ئەم پیاوانە؟

سەروەر: داوای لێبوردن دەکەم، بەخوا زۆر قەرزارم، نەمدەزانی چی بکەم.

توڕە بووم بۆی هەڵسام وریا و نەبەز نەیان هێشت و گرتیانم، بەڵام هەرچۆن بوو تفێکم لێکرد.

یاسین: کاک ماکوان دەزانم جەنابت کەسێکی بەڕێزی، هەموو شتێکمان لەگەڵدا بۆ دەکرێت، پێم وابێت ئەو تفە بۆی بەسە ئەگەر خاوەنی شەرەف و کەرامەت بێت، جا بۆیە من دەڵێم وازی لێبهێنە.

ماکوان: ئاخر چۆن وازی لێ بهێنم ئەو خوێڕییە.

یاسین: کاک ماکوان هەرچی دەتەوێت دەتوانی لەگەڵی بکەیت، من دەزانم کەسێک وا زەلیل بێت وازهێنان باشترین چارەسەرە. لێی ئەدەیت یان ئەیکوژیت کەس لەسەری هەڵناداتێ، نەشەرەفی هەیە نە خاوەنی ژن و منداڵ و خێزانیەتی، هەرچی لێ دەکەیت ئەو ئامادەیە، پیاوی خاوەن شەرەف لەگەڵ خەڵکی خاوەن شەرەف ڕووبەڕوو دەبێتەوە، خەڵکی بێشەرەف بۆ ئیهمال کردن باشە.

ماکوان: وەڵاهی قسەکەی جەنابت زۆر ڕاستە، بەڵام داوای لێدەکەم لەگەڵ شێرکۆی کوڕی جارێکی تر بڕۆمە دەرەوە لەبەر حورمەتی ئێوە وەکو کڵاش ئەیکەمە پێم و ئەمسەراو سەری پێدەکەم.

هیوا: مامە کڵاش زۆر بەقیمەت ترە لەم ئەم خوێڕییە، گوێت لێیە کەی مامە خەسرەو ویستی شێرکۆی کوڕت بنێرە بۆلای.

سەروەر: شێرکۆت بۆ چییە کاک خەسرەو؟

ماکوان: پێشتر زۆر هاتۆتە دەرەوە لەگەڵم دەمەوێت بۆ دواجار قسەی لەگەڵ بکەم و دەینێرمەوە بۆت.

سەروەر: بەخوا خەتای ئەو نەبوو ئێمە فێرمان دەکرد، تکایە لێی نەدەیت لە من بدە.

ماکوان: ئەزانم و گومام لەوە نییە کە تۆ فێرت کردووە، من لە منداڵێکی وا نادەم تۆ بڵێی من ئەوەندە بێ غیرەت بم ئێستا کەملت شکاند بە نەبەزدا بینێرە هەر بە نەبەزیشدا بۆت دەنێرمەوە، بە ئیجازەی ئەم پیاوە بەڕێزانە هەستە ملت بشکێنە و لەناو مەجلیسی پیاواندا تۆ جێگات نابێتەوە، دەی هەڵسە بڕۆ.

نەبەز هەستا لەگەڵیدا ڕۆشت، سوپاسی کاک یاسینم کرد و پاشان سوپاسی هیوام کرد لەگەڵ وریادا، بەس وتم باسەکەم بۆ بگێڕنەوە چی بووە.

هیوا: مامە ئەم سەروەرە خوێڕییە لەم کاک یاسینە زۆر دەترسێت، پێشتر بە کاری زۆر خراپترەوە گرتویەتی، جا کە چوومە سەری لە دوکانەکەیدا مامە یاسینم لەگەڵ بوو یەک تفم لێ کرد خێرا ئیعتیرافی کرد بۆمان و چی کردووە و چی نەکردووە بۆی باس کردین، مامە یاسین بە ئاقڵی خۆی هەموو پلانەکەی پێ ئاشکرا کرد.

یاسین: کاک ماکوان لام سەیرە چۆن کەوتیتە داوی ئەم خوێڕییە؟

ماکوان: بەخوا مامە یاسین سەرەتا ویستم ئیهمالی بکەم، بەڵام ماڵی نەبەزم ئاواکرد زۆری خوێند بە گوێمدا و لەبەر سومعە و کەسایەتی خۆشم تۆزێک بۆم داخست، سەرەتا تەنەزوڵم کرد بەڵام هەر وازم نەدەهێنا من پێش ئەم کێشەیە تووشی دوو کێشەی گەورەتر بووم، بۆیە نەپەرژامەوە سەری تا ئەم ڕۆژانەی ڕابردوو کە چوومە بنج و بناوانی هەڵبەت بەهاوکاری مام هیوا و جەنابت و ئەو برایانەی تر ئاوا بۆمان دەرکەوت کە درۆیە، سەرەتا دەمزانی بەڵام خۆم گومانم لەو لەشگرانییەی خۆم بوو،



بۆیە زۆر پێداگریم نەکرد تا شاهیدەکانم دۆزییەوە، دەنا مامە یاسینی بەڕێز هەروا بەئاسانی خۆم نەئەدا بەدەستەوە.

یاسین: بەهەرحاڵ من لەخزمەتی جەنابت و مام هیوا دام چیتان بوێت خزمەتکارتانم، ئەگەر ئیجازەی من بدەن دەڕۆم دەوامم هەیە.

ماکوان: زۆر سوپاس مامە یاسین گیان ئەم هەڵویستەی جەنابت بەرز دەنرخێنم و هەرگیز لەبیری ناکەم زۆر سوپاس بۆ هاوکارییەکەت برا گیان.

ماڵئاوایمان کرد لە کاک یاسین، تا نەبەز هاتەوە نەسرین خان بەمن و هیوا و وریای وت وەرن دوو بەرمیل نەوتم لەسەربانە بۆم بێننە خوارەوە، زوو زوو بە وریاشی دەوت باوکت چۆنە؟ من و هیواش کوڵابووین لە پێکەنینا، منیش وتم نەسرین خان وەڵا باوکی مام وریا بەدوای ژنا ئەگەڕێت.

کەچی نەسرین وتی: جا ڕۆڵە ئەو کەڵتە کۆنەی باوکت ژنی بۆ چییە؟

وریا: کورە بەخوا نەسرین خان لەدوای دایکم خڵەفاوە.

نەسرین: خڵەفاوی چی، ئەی بۆ ناڵێی خوای دایکم گەڕوگولی کردووە، ئەزانی چەندە خراپ بوو لەگەڵ دایکت.

من و هیوا پێدەکەنین و وریاش دەترسا لەدەمم دەربچێت کە باوکی بەتەمای نەسرین خانە، نەبەز هاتەوە شێرکۆی هێنابوو لەگەڵ خۆی.

ماکوان: شێرکۆ کوڕم وەرە، ئاگام لێبوو دەترسا، وتم وەرە کوڕی خۆم مەترسە دەزانم تۆ کوڕی من نیت، بەڵام کاکە گیان تۆ گەنجێکی تازە پێدەگەیت مەچۆرە ناو یاری ئاوا لەگەڵ دایک و باوکت، من چاک دەبم لەگەڵت کاکە شێرکۆ، ئەگەر باوک و دایکت ئەمجارە داوای کاری ئاوایان لێ کردیت پێیان بڵێ داهاتووم ڕەش مەکەن، مەبە بە پشکۆ لەبەر ئەوان.

کەوام پێ وت دەستی کرد بە گریان، پێم وت: مەگری گیانی من ئەگەر لەبەر پارە ئەوەت پێ دەکەن، پێیان بڵێ کە نایکەم، وەرە بۆلای من ئەگەر

منیش لێرە نەبووم ئاگاداری نەبەز و هیوا بکەوە ئەوان هاوکاریت دەکەن،کاکە شێرکۆ تکایە بەقسەی دایکو باوکت مەکە ئەگەر وتیان کارێکی ئاوا بکەیت.

بەداخەوە یەکەم جارە بە منداڵ ئەڵێم بەقسەی دایک و باوکت مەکە، بەخوا دەسەڵاتم هەبوایەو جایز بوایە دەمکردیت بە کوڕی خۆم لە دایکو باوکتم دەسەندی، دەستم کرد بە گرفانمدا ١٠٠ دۆلارم دایە و وتم: بڕۆ بیدە بە هەرچی حەزت لێ بوو، کە گەورەش بوویت بڕۆ بەشی هونەرە جوانەکان شانۆ بخوێنە، چونکە جوان دەور ئەبینیت، هیوام وایە سەرکەوتوو بیت.

نەبەز: هەر بۆ ئەمە بوو؟ ئێستا بیبەمەوە؟

ماکوان: لێرە بویتایە دایکیت دوو بەرمیل نەوتی پێ دەهێنایتە خوارەوە، بڕۆ لە ئیشەکەی دایکت باشترە کە بە ئێمەی کرد.

هیوا: ئەوە بەخیلە ئەویش داوای ١٠٠ دۆلار ئەکات بۆیە وا ئەڵێ.

کردیان بە فشقیات و قسەی خۆش.

نەبەز شێرکۆی بردەوە وریا وتی: منیش دەڕۆم.

وتمان مادام وایە من و مامە هیواش دەڕۆین، وریا ترسا مەوزوعی باوکی بکەینەوە لەگەڵ هیوا بەپێ کەوتینە ڕێ بە شەقامی توی مەلیک بەیەکەوە گۆرانی جادە چۆڵ و سێبەربوومان دەوت، وەکو کاتی هەرزەکاری، نزیک کەبابخانەی حەسەن بوینەوە تەماشای یەکترمان کرد هیوا وتی: لە دوو سەرەتان ڕزگارت بوو، سەرەتانی مێشک و سەرەتانی سەروەری بەلوعە، بڕۆین بەو بۆنەیەوە کەباب بخۆین.

ماکوان: با تەلەفۆن بکەم بۆ نەبەز و وریا بێن.

تەلەفۆنم کرد بۆ نەبەز خێرا هات بەڵام وریا وتی نایەم.

دوای نانخواردن گەڕاینەوە بۆ ماڵ و نەبەز هەردوکمانی گەیاندەوە.

بۆ بەیانی هەینی بوو چوم بۆ مزگەوت بۆ نوێژی جومعە، پاشان سەرقاڵی ئەوە بووم کەچۆن سیاسەتی گۆڤاری بزاڤ ڕێکبخەم و بەشی پەیوەندییەکان لەسەرشانی من بوو، هاتمەوە بۆ ماڵەوە بۆ ئەوەی ئیدارەی پەیوەندییەکان دروست بکەم و پێش گەڕانەوەم بۆ نەرویج کێشەی گۆڤارەکە چارەسەر بکەم.

خەیاڵیشم لای ئەوە بوو کە چیتر ناکرێت گەنم لەو ناڕەحەتییەدا بژی، بڕیارمدا کە سەرەتا باسەکە لەگەڵ باپیرم بکەمەوە و پاشان بە مامەکانم بڵێم دوای ئەوە بە براکانم و دایکم و خوشکەکانم.

کاتژمێر ٢ی دوانیوەڕۆ وەرزێر تەلەفۆنی بۆ کردم وتی: کاک ماکوان ڕۆژی یەک شەممە کۆڕەکە ئامادە دەکەین کاتژمێر ٢ی دوا نیوەڕۆ تا ٦ی ئێوارە، ئایا گونجاوە؟

ماکوان: زۆر گونجاوە، بە پشتیوانی خوا ئامادە دەبم، جێگاکە کوێیە؟

وەرزێر: بنکەی زانست و گەڕان لەگەڕەکی بەختیاری، بەڵام جێگاکەمان بچووکە هیوادارم لە ١٠ کەس زیاتر بانگێشت نەکەیت، بۆ زانیاریت من هەردوو خوشکەکەم بانگ کردووە تکایە با گەنمیش بێت.

ماکوان: باشە بەسەرچاو.

تەلەفۆنەکەمان داخستەوە من سەرقاڵی هەندێک سەرچاوە بووم کە ئامادەی کەم بۆ ئەو دوو ڕۆژە بیخوێنمەوە، بەدوای سەرچاوەی زانستی و دینی دا دەگەڕام بۆ خۆ ئامادە کردن بۆ کۆڕەکە، ئەو ڕۆژە لەماڵ نەچوومە دەرەوە، کاتژمێر ٥ی ئێوارە بوو دوکتۆر چالاک تەلەفۆنی بۆ کردم.

د. چالاک: ئەزانی ئەمڕۆ لەباخەکە زۆرێک لەو بەڕێزانە بیری تۆیان دەکرد، خۆت لەوێ نەبوویت بەڵام هەر باسی تۆ بوو.

ماکوان: باش بوو تەلەفۆنت کرد ڕۆژی یەک شەممە کاتژمێر ٢ کۆڕێکم هەیە لە بەختیارییە، من بۆم هەیە ١٠ کەس بانگێشت بکەم، جا دوکتۆر

گیان جەنابت، ئەنوەر، کامەران، سازان، خەجیج، ئازار، نامیق-م دیاری کردووە بانگێشتان دەکەم، ئەوانی تریش کێ حەزی لێ بوو سێ کەسی تر ئەتوانێت بێت.

هەرچەندە کۆڕەکە داخراوە بەڵام ڕێگام پێدراوە ١٠ کەس بانگ بکەم.

د. چالاک: بەخۆشحاڵییەوە من ئامادە دەبم و بەوانیش دەڵێم.

ماکوان: بەڵام زۆر باشترە هەمووومان لە عەیادەکەی جەنابتەوە کۆببینەوەو لەوێوە بەیەکەوە بڕۆین، واتا پێش سەعات دوو با هەموویان لای جەنابت ئامادە بن، خۆ ئاساییە؟

د. چالاک: زۆر ئاساییە و زۆریش باشە، دەی با کاتت نەگرم هەموویان سڵاویان هەبوو بۆت.

ماکوان: ئەملاولای کوڕەکان ماچ دەکەم و دوعای خێریش بۆ کچەکان دەکەم.

هەر ئەو ئێوارەیە تەلەفۆنم کرد بۆ گەنم ئاگادارم کردەوە کە ڕۆژی یەکشەممە بێت بۆلای عەیادەکەی دوکتۆر چالاک و بەیەکەوە دەچین بۆ کۆڕەکە.

ئەو دوو ڕۆژە لەماڵەوە نەچوومە دەرەوە، هەر خەریکی خوێندنەوە و سەرچاوە پەیداکردن بووم، ڕۆژی یەکشەممە لەناو بازاڕ بووم چوم لای بورهانی ئەجێ کەبابم خوارد، کە چوومە ژورەوە تەماشا دەکەم ئازار، خەجیج، سازان، ئەنوەر و نامیق لەوێن نان ئەخۆن.

ئەنوەر: نەموت کاک ماکوان لە کەبابخانە ئەبینین؟

خەجیج: سوێند بە خوا بەخۆشی تۆوە هاتین بۆ ئێرە، ئەو ڕۆژەش باسی ڕۆشنبیری کەباب خواردنت بۆ کردین لەو ڕۆژەوە هەموو حەزمان بە کەباب خواردنە، وتمان نان دەخۆین و دوایی دەچین بۆ عەیادەکەی دوکتۆر چالاک.

ماکوان: زۆر باشە من زۆرم برسییە.

نەفەرێك کەبابم بانگ کرد بە دوو شیش دوگەوە و شیشێکیش تەماتەی زیادە، هەموویان تەماشای منیان دەکرد بەدەست و پلی چەور تێکەوتبووم پەنجەم ئەلێسایەوە، ئەوانیش پێدەکەنین، منیش وتم: دەزانم ئێستا دەڵێن ماکوان زۆر لادێیە و نازانێت نان بخوات، بەڵام بەخوا کەباب وانەخورێت لەزەتی نییە.

ئازار: چۆنت پێخۆشە وابیخۆ، منیش وەک تۆ دەیخۆم، ئەوەندە خۆش دەیخۆیت.

لەکۆتاییدا خەجیج پارەی هەموومانی دا و بەیەکەوە بەرەو عەیادەکەی دوکتۆر چالاک بەڕێکەوتین، چووینە لای دوکتۆر ئەویش لەفەی دەخوارد، گەنم تەلەفۆنی کرد وتی لای بینای عەیادەکەم دێیت یان لەوێیت.

چووم بە شوێنیا هێنام و لەبەرچاوی هەموویان ناساندم وتم ئەمە گەنمی خوشکمە، زۆر بەخێرهاتنیان کرد، گەنمیش زۆر خۆشحاڵ بوو.

تەلەفۆنم کرد بۆ وەرزێر وتم: ئێمە ئامادەین و ئێستا بەڕێدەکەوین.

وەرزێر: کاک ماکوان چاوەڕێتانین، بەڵام گەنمت لەگەڵە یان تەلەفۆنی بۆ بکەم.

ماکوان: نا؛ گەنم دەمهێنێت پێویست ناکات تەلەفۆنی بۆ بکەیت واهاتین.

وابزانم ئەوەندە خۆشحاڵ بوو بەهاتنی گەنم ئەوەندە خۆشحاڵ نەبوو بەهاتنی خودی من.

کاتژمێر ٢ی دوای نیوەڕۆ هەموو ئامادە بووین و پێشوازییەکی پڕ ڕێزو جوانمان لێکراو پاشان لە طەرەفی ئەوان ١٢ کەسی لێبوو، ئێمەش ٩-١٠ کەس دەبووین. ئەوانەی لەگەڵ من هاتبوون: (چالاک، گەنم، سازان،

خەجیج، ئازار، نامیق، کامەران، ئەنوەر، نەبەز و هیوا) جەماعەتی ڕێکخراوی زانست و گەڕان (مەلا حامید و دوو بانگخوازەکە دلێر و ئەحمەد، مامۆستایەکی بایەلۆجی مامۆستا بورهان و دوو جێگری پزیشکی شوان و ڕێبوار، سێ ئەندامی ناو ڕێکخراوەکە بەناوی ڕاوێژ و بەهات و ئیبراهیم، خودی وەرزێر و دوو خوشکەکەی) هاتبوون.

مامۆستا بورهان کۆڕەکەی بەڕێوە دەبرد داوای لێکردم کە شێوازی کۆڕەکە ڕوونکاتەوە وتی: وا دەست پێدەکەین، کە جێگای جەنابت ڕووەو ئێمەیە، ئێمەش پرسیاری خۆمان دەکەین بە شێوەی ئەنتەرڤیو، پاشان جەنابت وەڵام ئەدەیتەوە، ئەم جۆرە کۆڕانە ئیلتیزامی کاتی بۆ جەنابت و ئامادەبوان نییە، میحوەرە سەرەکییەکان پرسیار دەکەن کە بریتین لە ١٠کەسی ڕێکخراو کە جەنابیشت وەڵام ئەدەیتەوە بەکورتی ئەمە ئیدارە و شێوازی کۆڕەکەیە.

ماکوان: زۆرباشە مادام وایە من کێشەم نییە و زۆرم بە دڵە و بفەرموون.

کاتژمێر ٢:٣٠ دەستم پێکرد، من سەرەتا قسەی خۆم کرد وتم: تکا دەکەم کە من نەبەنە ناو باسی لابەلا و ناو بواری بایەلۆجی و خانە و شانە و ناوەکانی دەکرێت من شتێکی سەرەتایی لێ بزانم، بەڵام تایبەتمەندی من نییە، بەڵکو من لەبواری دین و قورئان و فەرموودەدا لەگەڵتاندا دەدوێم، بفەرموون من ئامادەم.

وەرزێر: دوای بەخێرهاتنی کاک ماکوان، کاک ماکوان دەڵێت من بڕوام بە پەرەسەندن هەیە، دەکرێت لە قورئان یان فەرموودە پێمان بڵێت پەرەسەندن چۆنە و گەردوون و زیندەوەران چۆن بە پەرەسەندن دروست بوون؟

پرسیاری دووەم: لە دانیشتنێکی تایبەت دا باسی مرۆڤی پێش ئادەمت کرد، دەکرێت ئەو باسە ڕوون بکەیتەوە لە قورئاندا چۆن باسکراوە؟



پرسیاری سێیەم: ئایا سەرچاوەی پەرەسەندن ناگەڕێتەوە بۆ داروین ئیتر چۆن ئێوە وەکو موسڵمان بڕواتان بە پەرەسەندن هەیە، پەرەسەندن سەرچاوەی مادییەتە و هیچ پەیوەندی نییە بە ئایینەوە، چۆن تۆ کەسێکی موسڵمانی دەڵێیت بڕوام بە پەرەسەندن هەیە؟

ویستی پرسیاری زیاتر بکات....

ماکوان: پێم وابێت پرسیارەکان سێ سێ بکرێت باشترە، بۆ ئەوەی منیش بتوانم وەڵام بدەمەوە و بەسەرم دا تێنەپەڕێت، چونکە کە پرسیار زۆر بوو لەوانەیە باز بەسەردانداا ڕووبدات، منیش نامەوێت وەڵام نەدەمەوە، جا داوا دەکەم لە ئیدارەکە سێ پرسیار زۆر باشە.

بورهان: زۆرباشە با قسەکەی جەنابت بێت، منیش وای بەباش دەزانم

ماکوان: دوای دەستپێکردن بەناوی خوا و درودو سەلام بۆ سەر گیانی پێغەمبەری ئیسلام صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ.

پرسیاری یەکەم: لەدەورو خولی ئەوەدا بوو کە پەرەسەندن لە قورئاندا باسکراوە، بە دڵنیاییەوە خوای پەروەردگار لە قورئاندا بەکۆمەڵ باسی پەرەسەندن دەکات و دەفەرمووێت:

﴿وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ١٤﴾ نوح

واتە: خۆ (ئێوە پێشتر نەبوون) هەر خوا خۆی بە چەند قۆناغدا ئێوەی تێپەڕان و دروستیکردن.

پاشان باسی گەردوون دەکات کە لەئەنجامی تەقینەوە دروست بووە، پاشان خوای موتەعال باسی نێوان گەردوون و خاک و مرۆڤ و مادەکانی تر بەگشتی دەکات کە ماوەی ٦ ڕۆژ درووست بووە، لەوانەیە کێشە بۆ هەندێک کەسی سادە دروست بکات وابزانێت ئەو ٦ ڕۆژە ماوە و کاتی ٦ ڕۆژی ئێمەیە ئەوە زۆر بەهەڵەدا چووە، چونکە سەرەتای دروستبوونی کێشەکان لە ڕۆژمێر (کەلێندەرەکان) دەست پێدەکات و لە نەزانی

زاراوەكانی قورئان، هەروەكو چۆن من سەرەتا دانم نا بەوەی كە شارەزا نیم لە زاراوە بایەلۆجییەكان شەلم كوێرم ناپاریزم نەكەوتمە ناوی داوام كرد ئەگەر نەمزانی یان پێم بڵێن یان بۆم ڕاست بكەنەوە.

بەڕێزانێک كە لە تەفسیر و بوارەكانی زانستی قورئانەوانی و زاراوەكانی تێناگەن و دەكەونە كێشەوە، بۆ نموونە خوای گەورە كە دەفەرموویت (السموات والأرض)، بەواتای هەموو گەردوون دێت، كاتێک باسی دەكات و شوێن و سەردەم دەكات، بەگوێرەی ئەو سەردەم و زەمەنە باسمان بۆ دەكات.

بۆ نموونە ئەگەر باسی شەو و ڕۆژ بكەین لەسەر زەوی جیاوازترە لە شەو و ڕۆژی سەر زوحەل یاخود هەسارەی موشتەری یان ئۆرانۆس و نیبتۆن...هتد.

هەندێكیان لەماوەی ساڵانێكی دوور و درێژدا شەو و ڕۆژێک دروست دەبێت، چجای ئەوەی مەملەكەتی خوای گەورە شەو و ڕۆژ نازانین چۆن پێوەر دەكرێت، بەڵام لە ئەنجامی ئەو جیاوازییە دەشێت بەهەزارەها و ملیۆنەها ساڵ هەژمار بكرێت، كە ئیشی من یاخود هیچ كەسێكی تر كە بگەڕێین و چاو بخشێنین بە دروستكراوەكانی خوای پەروەردگار دەفەرموویت:

﴿قُلْ سِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ كَيْفَ بَدَأَ ٱلْخَلْقَۚ ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأٓخِرَةَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٖ قَدِيرٞ ۝٢٠﴾ العنكبوت

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: با بگەڕێن بە زەویدا، تەماشا بكەن و سەرنج بدەن چۆن ئەو زاتە دروستكراوانی بەدیهێناوە، لەوەودواش هەر خوا سەر لەنوێ بەرپایان دەكاتەوە (بە شێوەو شێوازێكی تر ئاسمانەكان و زەوی و ئێمەش دەهێنێتەوە كایە) بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێكدا هەیە.



مەلا حامید قسەکانی پێ بڕیم و وتی: دەکرێت بەڵگەیەکمان بدەیتێ لەسەر جیاوازی نێوان جێگاکان لە ڕۆژمێر لە قورئان دا.

ماکوان: زۆرە، بەڵام تکایە تا قسەکانم تەواو نەکەم قسەم پێنەبڕن، بەڵام وەڵامی بەڕێز کاک حامید ئەدەمەوە، خوای گەورە لە باسی یارانی ئەشکەوت بەدوو ڕۆژمێر بۆمان دەژمێرێت، چونکە ئەوکات ڕۆمەکان ڕۆژمێری (شەمسی)یان هەبوو، ناوچەی ئەردەنیش ڕۆژمێری (قەمەری) بەهەردوو ڕۆژمێرەکە ئاماژەی بۆ کردووە، چونکە هەردووکی بەکار دەهات، یاخود لە جێگایەکی تری قورئان دا خوای گەورە ڕۆژمێری ڕۆژی قیامەتمان بە ٥٠ هەزار ساڵ بۆ باس دەکات.

لەچاو شەو و ڕۆژی ئێرەدا، هیوادارم ڕوون بێت و لەداهاتووشدا زیاتر ئەم باسە ڕوون دەکەمەوە لەسەر شارستانیەتییەکانی تری جیهان کە هەریەکەو خاوەنی ڕۆژمێری تایبەتی خۆیان بوون.

دێمەوە ناو باسەکە قورئان کتێبێکی بایەلۆجی یاخود جیۆلۆجی یان ئەنترۆپۆلۆجی...هتد نییە بۆ زانکۆ و پەیمانگاکان نووسرابێت، قورئان سەرەداوێکی داویتێ بۆ ئەوەی بە شوێنیدا بگەڕێین، بەڵام ئەو کەسانەی کە زانستیان نییە خۆیان فڕێ ئەدەنە ناو بوارەکانەوە، جا چ مەلا بێت یان بانگخواز یاخود بێدین و مولحید پێویستە بگەڕێینەوە بۆلای خەڵکی تایبەتمەند، ئەم گەڕانەوەیە بۆ خەڵکی تایبەتمەند داواکاری قورئانە دەفەرمووێت:

﴿... فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ النحل

واتە: لە شوێنکەوتوانی (کتێبە ئاسمانییەکان) بپرسن ئەگەر نازانن، کە (ڕەوانەکراوانی ئێمە پیاوانێکی ناسراو بوون لەناو قەومەکانیاندا نەک فریشتە).

پاشان خوای گەورە هەموو زیندەوەرانی لەئاو دروست کردووە و بەهەموو جۆرەکانی پاشان دیزاینێکی ئاراستەکراو بە گوێرەی پەرەسەندی

ئاراستەکراوی خوایی جۆرو بەشی لێجیاکراوەتەوە کە ئەم ئایەتە قورئانییە زۆر ورترو قوڵتر و بەهێزترە زیندەوەرانییەکەی داروین.

خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٍ مِّن مَّآءٍ فَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰ بَطْنِهِۦ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰ رِجْلَيْنِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰٓ أَرْبَعٍ يَخْلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤٥﴾﴾ النور

واتە: هەروەها خوا هەموو زیندەوەرێکی لە ئاوێکی تایبەت دروست کردووە، جا هەیانە لەسەر سکی دەڕوات، هەیشە لەسەر دوو قاچ دەڕوات، هەیشە لەسەر چوار پێ دەڕوات، خوا هەرچی بوێت دروستی دەکات، بە ڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

ئەگەر چاو بە پەرەسەندنی مرۆڤ دا بخشێنین دەبینین زۆر جوان و ناوازە باسکراوە، بەڵام هەروەکو وتم پێویستی بە کەسانی تایبەتمەندە کە تەفسیری بکەن، نەک ئەوانەی کە ناویان ناوە لەخۆیان مەلا و بە فوویەک دەکەون (لێرەدا مەبەستم مەلا حامید بوو) لە سورەتی المؤمنون ١٤ و سورەتی السجده ٧-٩، پاشان الروم ٢٠، پاشان الصافات ١١ و سورەتی الحجر ٢٧-٢٩ هەروەها سورەتی الرحمن ١٠.

﴿ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾﴾ المؤمنون

واتە: لەوەودوا نوتفەکەمان کردووە بە خۆهەڵواسەرێك (سەرەمێکوتەیەك) پاشان خۆهەڵواسەرەکەمان کردووە بە گۆشتپارەیەك، ئینجا (شێوازی) گۆشتپارەکەمان بە پەیکەری ئێسک گۆڕیوە بە گۆشت پەیکەری ئێسکەکەمان داپۆشیوە، ئەوسا لە شێوەیەکی تردا دەرمان هێناوە



(که به شێوەی ئینسانی ڕێکوپێکه دوای ئەوەی که ڕۆحی پێدەبەخشرێ، بەڕاستی خوای مەزن بەرزو پیرۆزو موبارەکەو چاکترین بەدیهێنەرو چاکترین دروستکارە (کەس هاوتای نیەو کەس وەکو ئەو کاربەجێ نیە)﴿١٤﴾

﴿ٱلَّذِىٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَىۡءٍ خَلَقَهُۥ ۖ وَبَدَأَ خَلۡقَ ٱلۡإِنسَـٰنِ مِن طِينٍ ﴿٧﴾ ثُمَّ جَعَلَ نَسۡلَهُۥ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٨﴾ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ۖ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَـٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشۡكُرُونَ ﴿٩﴾﴾ السجدة

واتە: ئەو (خوایە) زاتێکە هەموو شتێکی بە چاکیی و ڕێکوپێکی دروستکردووە، لە سەرەتاوە ئادەمیزادیشی لە خاك دروستکردووە ﴿٧﴾ پاشان زنجیرەی نەوەکانی لە ئاوێکی سادەو بێ نرخ بەدیهێناوە (بەو شێوەیەی کە زانراوە) ﴿٨﴾ پاشان (ئادەمیزادی) بە ڕێك و پێکی ڕێکخست، لە ڕۆح و گیانێك (کە خوا خاوەنیەتی) فووی پیا کرد، ئینجا دەزگای بیستن و بینین و لێکدانەوەی پێبەخشیون، بەڵکو سوپاسگوزاربن ﴿٩﴾

﴿وَمِنۡ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ ﴿٢٠﴾﴾ الروم

واتە: لە نیشانەو بەڵگەکانی خوا ئەوەیە ئێوەی لە خاك دروست کردووە، لەوەودوا دوای بڕینی چەند قۆناغێك کوتوپڕ بوونەتە مرۆڤێك و بڵاو دەبنەوە بە زەویدا ﴿٢٠﴾

﴿فَٱسۡتَفۡتِهِمۡ أَهُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا أَم مَّنۡ خَلَقۡنَآ ۚ إِنَّا خَلَقۡنَـٰهُم مِّن طِينٍ لَّازِبٍ ﴿١١﴾﴾ الصافات

واتە: (ئەی پێغەمبەر لە بێ بڕواکان بپرسە) ئایا ئەوان گرنگترو گەورەترو بەهێزترن یان ئەو شتانەی تر کە دروستمان کردووە وەک

(ئاسمان و زەوی و کێوەکان...هتد)، خۆ ئێمە ئەوانمان لە قوڕێکی مچ دروستکردووە (کە یەکێکە لە قۆناغەکانی دروستکردنی باوکە ئادەم)﴿١١﴾

﴿وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾﴾ الحجر

واتە: پەریشمان پێشتر لە ئاگرێکی بەتین دروست کرد کە بە وردیلە کونەکاندا تێدەپەڕێت ﴿٢٧﴾ یادی ئەوە بکەرەوە کاتێك پەروەردگارت بە فریشتەکانی وت: بەڕاستی من دروستکاری بەشەرێکم لە قوڕێکی وشك کە پێشتر قوڕێکی ڕەشباوو ترشاو بوو ﴿٢٨﴾ جا کاتێك ڕێك و پێك و تەواوم کرد، لەو ڕۆحە تایبەتیەی کە من (بەدیهێنەری ئەوم) پێمبەخشی، ئەوە هەموتان کڕنووشی بۆ بەرن (کڕنووشی ڕێزو بە فەرمانی خوا) ﴿٢٩﴾

﴿وَٱلْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴿١٠﴾﴾ الرحمن

واتە: زەویشی بۆ خەڵکی ڕاخستووەو باری هێناوە (تا ژیانی خۆیانی تێدا بەرنە سەر) ﴿١٠﴾

خەڵکی ئاسایی لەکۆی گشتی ئەو باسی پەرەسەندنانەی کە ئاراستە کراون لەلایەن خاوەنەکەی کە پەروەردگارە لە ڕووی ڕواڵەتی سادەییەوە بریتییە لە خۆڵ و تێکەڵ بوونی ئاو بە خۆڵ بوون بە قوڕ، دوای ئەو قوڕی لینج پاشان وشک بوەوە، هەموو ئەمانە ئاماژەیە بۆ پەرەسەندی مرۆڤ و بگرە زیندەوەران بەگشتی، خۆ ئەگەر بێت و لە ڕووی زانستییەوە باسی بکەین ئەم پێکهاتانە بە تەنها بەس نین بۆ دروستبوونی مرۆڤ، چونکە خاک و خۆڵ ئاویش لم و زیخ جیا دەکاتەوە لە کاتێکدا بریتییە لە ٢٠٪ سلیکۆن کە ئەو زیندەوەرانەی کە ئۆکسجین هەڵدەمژن دوورن لەم سلیکۆنەوە، تەنها جۆرێک لە قەوزە ڕێژەیەک سلیکۆن لەخۆ دەگرێت،

بەڵام لاشەی مرۆڤ سلیکۆن هەڵناگرێت، بەڵکو کاربۆنی تێدایە بە ڕێژەی لە ٣٠٪، کەواتە مادەکانی وەکو خۆڵ و ئاو کە دەبێتە قوڕ پاشان قوڕی بۆگەن یان ترشاو داڕێژراوی ماددەکانی زەوین، کەواتە تێگەیشتنێکی قوڵمان ئەداتێ کە زیندەوەر و مرۆڤ بەتایبەتی بنەڕەتیان دەگەڕێتەوە بۆ خاک و خۆڵ و ئاو کە دەبێتە قوڕ، چونکە ئەم ماددانە کە قوڕی ترشاو، لینج و بۆگەنە، هاوشێوەی پێکهاتەی توخمە ئەندامییەکانی (هایدرۆکاربۆنییەکانن) کە بنچینەیان ئاوە، کە خوای گەورە لە قۆناغێکی پەرەسەندندا ناوی ناوە بە (طين لازب) واتا قوڕی لینج و هاوشێوەی (هەویرێك کە ئاوی زیادی تی بکرێت بە دەستەوە بلکێت) ئەم ماددە لینجە نوساوە پێکهاتەکەی بریتییە لە هایدرۆکاربۆنەکان کە پێکهاتەی ژیان و زیندوییەتین کە پێی دەوترێت (گەردە کاربۆنییەکان، یان زیندەگەردەکان) کە پێکهاتووە لە (پرۆتین، ترشی ناوک، کاربۆهیدرات "شەکرەکان") پاشان دەگوازرێتەوە بۆ قۆناغەکە بۆ قوڕی ڕەش کە زاراوەیەکی گشتییە و هەموو کەس لێی تێدەگات،

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ﴿٢٦﴾﴾ الحجر

واتە: سوێند بەخوا ئێمە سەرەتا ئینسانمان لە قوڕێکی وشك دروست کرد کە پێشتر قوڕێکی ڕەشباوو ترشاو بوو ﴿٢٦﴾.

ئاماژەیە بۆ خانە زیندووەکان یان بڵێین خانە زیندەوەرییەکان کەلە سەرەتاوە پێکهاتەی ژیان بوون.

کەواتە قۆناغەکانی پەرەسەندنی قورئانی بەگوێرەی ئەو پلەبەندی ئایەتانەی کە باسم کرد بریتییە لە (ماددەی نازیندوو بۆ ماددەی ئامادەکراو یان ئەندام، پاشان بۆ پێکهاتەی ژیان و گەردە زیندەکان، نادروست بوونی خانەی زیندوو) ئەم قۆناغانە بە ئاراستەی خوای گەورە دەست پێدەکات بۆ ڕووەک و زیندەوەران بۆ ڕووەک (کلۆرۆفیل) بۆ زیندەوەران (هیمۆگلۆبین) کە پارسەنگی ژیان ڕادەگرێت لەسەر زەویدا

ئەم بەدانی ئۆکسجین و ئەویش بە دانی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن، بەڵگەش بۆ ئەوەی کە دەڵێم هەموو زیندەوەرانی تر لەم پەرەسەندنە خواییە ئاراستە کراوە و هاتووە ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمۡثَالُكُمۚ مَّا فَرَّطۡنَا فِي ٱلۡكِتَٰبِ مِن شَيۡءٍۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يُحۡشَرُونَ ٣٨﴾ الأنعام

واتە: هیچ زیندەوەرو گیانلەبەرێك نییە بەسەر زەویدا بڕوات، یا باڵندەیەك کە باڵەکانی بفڕێت و ئەوانیش ئوممەت و گەلێك نەبن وەك ئێوە، (دڵنیابن) هیچ شتێك نییە پشت گوێمان خستبێ لە کتێبە (تایبەتی یەکەدا) کە (لوح المحفوظ)ە لەوەودوا هەرهەموو ئەوانە کۆدەکرێنەوە لای پەروەردگاریان (بۆ ئەوەی دادگایی بکرێن و هەموو کەس مافی خۆی وەرگرێت یا تۆڵەی ڕەوای لێ بسەنرێتەوە).

ئەمە وەڵامی پرسیاری یەکەمت بوو، کە بەڵگەیە بۆ ئەوەی منی موسڵمان بڕوام بە پەرسەندن هەیە، بەڵام پەرەسەندنی داروینزمی نا، بەڵکو پەرەسەندنێک کە پێی دەوترێت پەرەسەندنی ئاراستەکراو لەلایەن خوای پەروەردگار، سەرچاوەی ئەم قسەیەم دەگەڕێتەوە بۆ کتێبی (زمانی خوا) زانای بەناوبانگ (فرانسیز کۆلینز).

نووسیویەتی لە ساڵی ٢٠٠٦ داو لەساڵی ٢٠٠٨ د. عەمرو شەریف بەزمانی عەرەبی شی کرۆتەوە لە لێدوانێکی دا لەسەر کتێبەکەی (عبدالصبور شاهین) بەناوی (باوکە ئادەم) زانایان زۆرن لەم بوارەدا کە کار لەسەر پەرەسەندنی ئاراستەکراو دەکەن و هەموو پەرەسەندنی هەڕەمەکی و سوتفەکانی داریۆنیزمی بەرپەرچ ئەدەنەوە و بەدرۆی دەخەنەوە.

ئەم باسە لە ڕووی زانستییەوە زۆر لەوە قوڵترە کە من لێرەدا ئاماژەم پێداوە، بەڵام هەروەکو وتم کاری من بەشی ئایینەکەیە نەک قوڵ بوونەوە لەبواری جینۆم و خانە و وردەکاریەکانی تردا.



پرسیاری دووەم: دەڵێیت باسی مرۆڤی پێش ئادەم بکە کە چۆن باس کراوە لە قورئان دا داوای ڕوونکردنەوە دەکەیت.

لەوەڵامدا دەڵێم: بەدڵنیاییەوە پێش ئادەم بەمەودایەکی زۆر مرۆڤ هەبووە، خوای گەورە لە قورئان دا باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە مرۆڤ بەم شێوەی ئێستا ڕێک و تەواو نەبووە و شێوەی جوانی وەرنەگرتوە، دەفەرموێت:

﴿فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ۝٨﴾ الانفطار

واتە: لە هەر شێوەو شێوازێکدا کە ویستویەتی تۆی ڕێکخستووەو ئەندامەکانی بەیەکەوە لکاندووە ۝٨

لەوکاتەدا هەردوو بانگخوازەکە دەستیان بەرز کردەوە دەیان چپاند بەگوێی یەکدا منیش وتم فەرموو.

شوان: کاک ماکوان بورە قسەکانم پێ بڕیت، بەڵام با نەڕوات بەسەردا ئەی بۆ ئایەتی ٤ی سورەتی التین دەڵێی چی؟

﴿لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ۝٤﴾ التين

واتە: ئێمە ئینسانمان بەباشترین و ڕێککردنەوەی شێوازدا دروست کردووە لە هەموو ڕوویەکەوە ۝٤

ماکوان: پێش ئەوەی من شتێک بڵێم ئەی جەنابت و کاک ڕێبوار دەڵێن چی و چۆن لێی تێگەیشتوون؟

شوان: بەجوانترین شێوە دروستمان کردووە.

ماکوان: سوپاس بۆ وەڵامەکەت (أحسن تقويم) مانای جوانترین شێوە ناگەیەنێت، بەڵکو واتا بە باشترین ڕێککردنەوە بەدی هاتوو دێت، لە



کاتێکدا ئەم تەفسیرە بە واتای نەهێشتنی لاری و خوارو خێچی دێت، قۆناغی ئایەتەکەی پێشوتر شی دەکاتەوە بۆمان

وشەی (تقویم) لە فەرهەنگی عەرەبیدا بەو مانایە هاتووە، هەروەها (الطبری و الجلالین) لە تەفسیرەکانیاندا بەهەمان دەستەواژە هێناویانە، هیوادارم ڕوون بێت.

دێمەوە ناو باسەکە، سەرەتا خوای گەورە باسی مرۆڤ دەکات کە ناسراوە لە قورئان دا بە (الإنسان) پاش کۆتایی هاتنی لە قۆناغەکانی پەرەسەندن ناونراوە بە (بشر) بەشەر، کەواتە قۆناغی مرۆڤ بوون کە ئینسان بوون دەگەیەنێت سەرەتاییە و قۆناغی تەواو بوون بەشەرە، بەڵگەش بۆ ئەم قسەیەم خوای گەورە لە قورئان دا ناوی هەموو پێغمبەرانی کە هێناوە و وەکو ئاماژە کردن بە بەشەر ناوی بردوون نەک ئینسان، هەروەها لە ئادەمەوە تا خاتەم.

کەواتە ئادەم یەکەم مرۆڤ نەبووە، بەڵکە یەکەم پێغەمبەر بووە! بۆیە خوای گەورە ئاماژەی کردووە بۆ بەشەر.

مەلا حامید: ئەتوانی یەک دوو بەڵگەی قورئانیمان بدەیتێ؟

ماکوان: بۆ ئادەم لە سورەتی:

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ٢٨﴾ الحجر

واتە: یادی ئەوە بکەرەوە کاتێك پەروەردگارت بە فریشتەکانی وت: بەڕاستی من دروستکاری بەشەرێکم لە قوڕێکی وشك کە پێشتر قوڕێکی ڕەشباوو ترشاو بوو.

لە ئایەتەکەدا دەفەرمووێت: (خَالِقٌ بَشَرًا) واتە: من دروستکاری بەشەرێکم، پاشان لەباسی حەزرەتی یوسف دەفەرمووێت:



﴿... وَقُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ﴿٣١﴾﴾ یوسف

واتە: وتیان: پاکیی و بێگەردیی و دووری لە هەموو کەم و کوڕییەك شایستەی خوایە، ئەمە بەشەر نییە (ئەوەندە جوان و قەشەنگە)، ئەمە هەر فریشتەیەکی قەشەنگ و جوان و پیرۆزە.

هەروەها لە باسی موسا و هاروون دەفەرمووێت:

﴿فَقَالُوٓاْ أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ﴿٤٧﴾﴾ المؤمنون

واتە: (فیرعەون و داروودەستەکەی) وتیان: ئایا ڕەوایە ئێمە باوەڕ بە دوو بەشەری وەك خۆمان بکەین، لەکاتێکدا کە قەومەکەیان ئێمە دەپەرستن و (خزمەتکاری ئێمە دەکەن).

پاشان بۆ حەزرەتی نوح بەهەمانشێوە فەرمووێت:

﴿فَقَالَ ٱلْمَلَؤُاْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِۦ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ﴿٢٤﴾﴾ المؤمنون

واتە: ئەو کەسایەتییانەی کە کافرو بێ باوەڕبوون لە قەومەکەی وتیان: (گوێی بۆ مەگرن) ئەم (پیاوە) جگە لە بەشەرێکی وەك ئێوە (زیاتر نییە)، دەیەوێت خۆی بکاتە گەورەتان!! ئەگەر خوا بیویستایە (پێغەمبەرێك بنێرێت) فریشتەی دادەبەزاند ئێمە ئەم (هەواڵەمان) لە باوباپیرانی پێشووەوە پێ ڕاگەیەنراوە.

بۆ پێغەمبەری خواش صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت:



﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴿١١٠﴾﴾ الكهف

واتە: (ئەی پێغەمبەر پێیان) بڵێ: من تەنها بەشەرێکم وەك ئێوە وەحی و نیگام بۆ هاتووە (کە ئەم ڕاستییەتان تێبگەیەنم) کە: خوای ئێوە تەنها خوایەکی تاک و تەنیایە، جا ئەوەی دەیەوێت بە دیداری پەروەردگاری شاد ببێت (بە خۆشنودیەوە) با کارو کردەوەی چاك و دروست ئەنجام بدات، بەهیچ شێوەیەك لە پەرستنیدا هاوەڵ و شەریك (بۆ خوای گەورە) بڕیار نەدات.

دەگەڕێمەوە بۆ ناو باسکە لەهیچ جێگایەکی قورئاندا ئاماژەی ڕاستەوخۆ نەکراوە بۆ ئەوەی ئادەم یەکەم مرۆڤ بێت، بەڵکو ئاماژە کراوە بۆ مرۆڤی پێش ئادەم کە ئینسان ناوی براوە، دەشێت وەکو هەموو پێغەمبەرانی تر ئادەمیش لەگەڵ حەوادا دایک و باوکیان هەبووێت و ئەگەر وا بڵێین باشترە و هیچ کێشەیەک دروست ناکات لە قورئان دا.

هەرچەندە من لەو کەسانەم کە پێم وایە ئادەم و حەوای خێزانی خاوەنی دایک و باوک بوون، ئەگەرچی پێشتر دەرمنەبڕی بوو بەڵام وا لێرەدا بەئاشکرا دەڵێم ئادەم و حەواش دایک و باوکیان هەیە.

ئەزانم پرسیاری زۆرترتان بۆ دروست دەبێت، ئێستا بوار دەکەمەوە بۆ هەموو پرسیارەکانتان و دەشزانم زۆربەی بێ دین بوونی خەڵکی لەم بوارەدایە، جا وەڵامی سێیەمی کاک وەرزێر ئەدەمەوە دوای ئەوە بە ئارەزووی خۆتان پرسیار بکەن.

پرسیاری سێیەم: دەڵێت سەرچاوەی پەرەسەندن ناگەڕێتەوە بۆ داروین ئیتر چۆن ئێوەی موسڵمان بڕواتان پێی هەیە و پەرەسەندن سەرچاوەکەی ماددەیە و پەیوەندی بە ئایینەوە نییە.

لەوەڵامدا دەڵێم وتەکەت نیوەی ڕاستە و نیوەشی هەڵەیە، ڕاستییەکەی لەوەدایە کە داروین یەکەم کەسە وەکو بواری زانستی ڕێکی خستووە،



بەڵام پێش ئەو (جاحظ) لە کتبی (الحیوان)دا باسی پەرەسەندنی کردووە، بەڵام وەکو داروین بە قوڵی نا، هەروەها ئیمامی غەزالی ئاماژەی پێداوە پاشان لە دوای داروین لە جیهانی ئیسلامیدا لە ساڵی ١٨٨٨ لە کتێبی (الرسالة الحمیدیة) (حسین بن محمد جسر الطرابلسي) شیکاری کردووە بۆ پەرەسەندن.

پاشان ئێمەی موسڵمان هیچ بڕوامان بە تیۆری داروینزمی نییە، بەڵکو بڕوامان بە پەرەسەندنی دیزاینی پاک و بێگەردی ئاراستەکراوی خوایی هەیە، کە ئەمانە دوو شتی جیاوازن.

داروین بڕوای بە هەڕەمەکی و سوطفە و لەخۆوە دروست بوون هەیە، بەڵام ئێمەی موسڵمان بڕوامان بە پەرەسەندی خوای گەورە هەیە، ئەگەر پەرەسەندنی داروینی بخەینە ژێر پشکنینی فەلسەفی نەک ڕادەکەن لە دەستمان بەڵکو لەکۆتایدا دەڵێن ببورە هەڵە بووین، پاشان لەڕووی زانستیشەوە داروین هەڵەی زۆری کردووە و پاشان زاناکانی داروینیزمیش هەڵەی چاوزەق و گریمانی زۆریان خستۆتە ڕوو تێیدا سەرکەوتوو نەبوون بە زانست هەژمار نەکراوە.

ئێستا تەواو بووم لە وەڵامی پرسیارەکان بفەرموون پرسیارەکانتان بکەن لەخزمەتاندام، بەڵام پێش تەواو بوونم تکا دەکەم کە مەجال بدەن ئەو سێ کەسە بکەنەوە کاک مەلا حامید، کاک شوان و کاک ڕێبوار.

مەلا حامید: ئەوەی تۆ باست کرد تا ڕادەیەک نیوەی سیناریۆکەیە، نیوەکەی ترت باس نەکردووە.

ماکوان: تکایە کاک حامید ئەوەی من باسم کردووە وازی لێ بهێنە، ئەوەی لای جەنابتە فەرموو بیخە ڕوو تا بزانم کامەیە کە من باسم نەکردووە بێ تانەو تەشەردان، من لێرەم نەک بۆ ئەم کۆڕە ئامادەم بەڵکو تا یەک مانگ لەسەر یەک ئەم کۆڕە بەردەوام بکەم بفەرموو بۆ پرسیارەکانت، شتی لابەلا باس مەکە و وەرە ناو جەوهەر.






مەلا حامید: زۆرباشە پرسیاری یەکەم دەکەم، بەڵام تا وەڵامی پرسیاری یەکەم وەرنەگرم پرسیاری دووەم ناکەم، دەکرێت؟ ئەگەر وانەبێت پرسیار ناکەم.

بورهان: کاک مەلا حامید وا بڕیارمان دا کەسێ پرسیار بکرێت و کاک ماکوان وەڵام بداتەوە.

مەلا حامید: دە من پرسیار ناکەم.

ماکوان: مامۆستا بورهان من داوا دەکەم کە داواکەی کاک حامید جێبەجێ بکەن هیچ کێشەیەک نییە بۆ من با یەک یەک پرسیار بکات، کە وەڵامم دایەوە پرسیاری تر بکات، بە نسبەت منەوە زۆر ئاساییە.

مەلا حامید: سوپاس کاک ماکوان پرسیاری یەکەم لە ئایەتی یەکەمی سورەتی النساء کە باسی دروست بوونی ئادەم و حەوا دەکات و پاشان کە خوا دروستی کردوون بۆ ئەمە چی دەڵێیت؟ مەبەستم ئەوەیە کە سەربەخۆ دروست بوون، بێ پەرە سەندنی ئاراستە کراو کە جەنابت دەفەرموویت:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ۝١﴾ النساء

واتە: ئەی خەڵکینە لە خەشم و ناڕەزایی ئەو پەروەردگارەتان خۆتان بپارێزن کە ئێوەی لە تاکە کەسێك دروست کردووە، لەو کەسەش هاوسەرەکەی بەدی هێناوە، لەو دوانە پیاوان و ژنانی زۆری هێناوەتەو کایەوە، هەروەها لەو خوایە بترسن کە سوێندی پی دەخۆن، (هەوڵ بدەن) پەیوەندی خزمایەتیش بپارێزن و (پتەوی بکەن) چونکە بە ڕاستی خوا (هەمیشەو بەردەوام) چاودێرە بەسەرتانەوە.





ماکوان: پرسیارەکەت جوانە بەڵام دەکرێت بزانم لەو ئایەتەدا لەکویا باسی ئادەم و حەوا دەکات بێزەحمەت؟

مەلا حامید: ئەی ئەوە نییە باسی ﴿... خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا ... ﴿١٨٩﴾﴾ الأعراف دەکات.

ماکوان: لەڕاستیدا باسی ئادەم نییە، نە تۆ نەهیچ کەسێکی تر ناتوانێت ئەوە بسەلمێنێت، ئەگەر مەبەست پێی نەفس بێت، هاوشێوەی ئەو ئایەتەت لە ئایەتی:

﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ ...﴿١٢٨﴾﴾ التوبة

واتە: بێگومان پێغەمبەرێکتان بۆ ڕەوانە کراوە کە هەر یەکێکە لە خۆتان،

واتای ئەوەی کە پێغەمبەرێکی بۆ ناردوون لە جۆری خۆتان کە مرۆڤە، لێرەدا تەفسیرەکەی جەنابت هەڵەیە، باسی مرۆڤە بەگشتی، پاشان لەسەرەتای سورەتی النساء مەبەستەکە بۆ خەڵکی جاهیلە کە ئافرەتان وەکو پیاوان مرۆڤن، ئەو مانایە هەڵدەگرێت، هەروەها لە تەفسیرەکانی سەید قطب و شێخی شعراوی و مناری محمد عبده و زۆری تر بەو شێوەیە باسکراوە، هەڵبەت وەکو ئەمانەتی زانستی باسی هەندێک تەفسیری تر دەکەم کە موفەسیرەکە بە ئادەم و حەوا لێکی داوەتەوە، کە نە فەرموودەی لەسەرە نە قەولی هاوەڵان و نە زانایانی قوتابی هاوەڵانیش، نموونەی جەلالەین و ابن کثیر ئەوەی کە ئێستا لەبیرمە.

کەواتە ئەو ئایەتە هیچ پەیوەندی بە خەلقی ئادەم و حەواوە نییە،تەنها دەشێت بیروبۆچوون بێت، پرسیارت هەیە؟

مەلا حامید: واتا ئەو ئایەتە هیچ پەیوەندی بە ئادەمەوە نییە، ئێمە کە خوێندومانە هەمووی هەڵە بووە؟






ماکوان: نازانم تۆ چیت خوێندووە؟ بۆ من گرنگ نییە لێرەدا تۆ مەلایت یان مولحیدی یان هەرچیت، ئێمە قسە دەکەین لەسەر بەڵگەیەک خەڵکێک لێرە دانیشتوون دەزانن زمانی عەرەبی و تۆش باش دەزانیت کێشەی من نییە تۆ لە مەلایەتییەوە هاتوی بۆ بێدینی و ئێستا بەناوی مەلایەتی بڵێیت شتی وامان نەخوێندووە، وشەی مەلا لابە لە خۆت وەکو کەسێکی بێدین من ڕەفتار لەگەڵ تۆ دەکەم، ئەوەی دەیزانیت و ڕەخنەت لایە فەرموو بیڵێ، ئێ من دڵنیام تۆ شارەزا نیت لە تەفسیر، وەکو بۆیان باسکردم تۆ فەقێش نەبوویت، بەس یەکێک بوویت نوێژت کردووە لەسەر مەرزەکە بەهۆکاری نوێژکردنت ناویان ناویت کاک مەلا حامید، خۆشت باش دەزانیت کۆمەڵگەی ئێمە وایە هەرکەس نوێژ بکات پێی دەڵێت مەلا، جا ڕێزم بۆت هەیە نە تۆ نە ئەو دوو بەڕێزەی تر هیچ لە دین نازانن، چونکە ئایەتوڵاش بیت لای من ئێستا مورتەد و کافری ڕوونە؟

حامید: بەهەرحاڵ کاک ماکوان ڕاستە من مەلایەتیم نەکردووە، بەڵام بە مەلا ناسراوم، نەشم وتووە مەلا بووم.

ماکوان: کاکە چۆن نەتوتوە ڕاستەوخۆ کاک وەرزێر بەمنی وت، کێشە نییە وەکو وتم بڕۆینە ناو باسەکەمان.

حامید: ئەی چی دەڵێیت بۆ عیسای کوڕی مەریەم کە خوا بە خەڵکی دەڵێت نموونەی ئادەم و عیسا وەکو یەک وایە، کە وتتان ببە خێرا بوو.

﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴿٥٩﴾﴾ آل عمران

واتە: بەڕاستی نمونەی عیسای لەلای خوا وەك نمونەی ئادەم وایە کە لە خاك دروستی کردوو لەوەودوا فەرمانی داو پێی وت: ببە (بە ئینسان) ئەویش بوو.

ئەی بۆ ئەمە چی دەڵێیت؟





ماکوان: پرسیارێکی جوانە، باشە من پرسیارێک بکەم بەڵکو لەو پرسیارە دا وەڵامەکەت دەست بکەوێت، کاک حامید ئەگەر جەنابت پێت وابێت ئادەم لەکن فیکون دروست بووە، وایە؟

حامید: وایە بەدڵنیاییەوە.

ماکوان: ئێ بەڵام عیسا بەو حیسابەی تۆ بێت وەکو ئادەم نییە.

عیسا لە سکی دایکیدا بوو ۹ مانگی پێچوو، هەموو قۆناغەکانی کۆرپەلەی بڕیووە تا لەدایک بوو، بامن پرسیار بکەم، ئەم دووانە کامیان لەکامیان دەچێت؟

حامید: لە مەبەستەکەت تێناگەم؟

ماکوان: ئەیڵێمەوە بە تەفسیرەکانی جەنابت ئەگەر ئادەم و عیسا لەیەک بچن دەبێت وەکو یەک بن وایە؟

حامید: وایە.

ماکوان: عیسا بە ۹ مانگ لە سکی مەریەمدا لەدایک بووە، دەتوانی بڵێیت وانییە؟

حامید: باوایە، بەڵام بێ باوک بووە.

ماکوان: جارێ قسەکە لەسەر باوک و دایک نییە، لەسەر لێکچوون وشەی (کن فیکون)ە وایە؟

حامید: وایە، بەڵام من مەبەستم ئەوەیە کە ئادەم بێ دایک و باوک بووە عیساش بێ باوک.

ماکوان: کێشەکە لێرەدا ئەوەیە کە تۆ و ئەمسالی وەکو تۆ پەلە دەکەن، لێرەدا مرۆڤبوونی عیسا باس دەکرێت پەیوەندی نییە بە شێوەی ئادەم بۆ لەدایک بوون، بەڵکو قۆناغی لەدایک بوونی ئادەم کە لەسکی دایکی دابووە، هەروەکو قۆناغی عیسایە لەسکی دایکیدا و بەهەمانشێوە لەدایک



بووە واتا عیساش لەبەنی ئادەمە لە نەوەی ئادەمە، چونکە پێغەمبەر ئادەم یەکەم مرۆڤ نییە و یەکەم پێغەمبەرە، خوای گەورە دەفەرمووێت: آل عمران ٣٣

واتە: بەڕاستی خوا ئادەم و نوح و نەوەکانی ئیبراهیم و نەوەکانی عیمرانی هەڵبژاردووەو ڕێزی داون بەسەر خەڵکی هەموو جیهاندا.

ئادەمیش وەکو پێغەمبەران هەڵبژێراوە بۆ خەڵکی وەکو نوح و ئیبراهیم.

حامید: ئەی دایک و باوکی ئادەم کێیە؟

ماکوان: هەروەکو من و جەنابت مرۆڤ بووە.

حامید: ئەی ناویان چی بووە؟

ماکوان: ئاخر خۆ من پاسپۆرتیان بۆ دەرناهێنم، چوزانم ناویان چی بووە بۆ نموونە، تۆ ناوی باوکی ئیلیاس پێغەمبەر دەزانی؟ یان ناوی باوکی ذولقرنین دەزانی یان ناوی ژنی لوط و نوح دەزانی لە قورئانیش دا ئاماژەی بۆ کراوە ناو نازانم، بەڵام دەزانم کە ئادەم یەکەم پێغەمبەر بووە، سەرچاوەی شارستانیەت و کۆمەڵگە و کۆبونەوە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە لەم باسە دەشێت بە بەرگ کتێبی لەسەر بنووسرێت، بەهەرحاڵ ئادەم و عیسا وەکو یەک لەدایک بوون هەردووکیان مرۆڤن بۆ وشەی (کن فیکون) شیکارییەکت بۆ دەکەم...

لە قورئاندا لە ٨ جێگادا خوای گەورە باسی (کن فیکون)ی کردووە، پێش ئەوەی باسی ماناکەیت بۆ بکەم دەمەوێت قسەیەکی شیخ الأسلام ابن تیمیەت بۆ بکەم کە بەئایەتی تەکوینی ناوی بردووە، هەروەکو دەڵێت دەبێت مەلا بزانیت ئایەتی تەکوینی و تەکلیفی چییە، بەهەرحاڵ من بۆت ڕوون دەکەمەوە، خوای گەورە لە زانستی خۆیدا پاشان بە قەڵەمی فەرمووده کە میقداد و تەقریر و ڕاپۆرتی دروست کراوەکانی پێویست خوای گەورە پێویستی بە بیرکردنەوە نییە، واتا کە وتی ببە دەبێت ببێت،

ئەم هاتنە بوونە بە هەردوو شێوازەکەیە شێوازی تەکلیف کە بۆ ماوەیەکی دیاری کراوە، وەکو وترا بە ئاگر کە سارد بەرەوە بۆ ئیبراهیم، ئەم سارد بوونەوەیە لە (کن فیکون)ی خوایدا بوو کە موعجیزەیە، بەڵام خوای گەورە یاساکانی ئەم گەردوونە تێکنادات بە تەفسیری هەڵەی هەندێک کەوا دەزانێت (بەجێهێنانی یەکسەری و ڕاستەوخۆیی و سەربەخۆییە لە بەدیهێنان و دەستبەجێ دەبێت بێت).

لەڕاستیدا بەم شێوەیە تەفسیرەکەی ڕاستەو واتاکەی لەگەڵ قورئاندا دێتەوە (هاتنە ناو بوون لەسەر بنەمای یاساو ڕێساکانی گەردوون کە خوای گەورە دایناوە، جا هەیە پێویستی بە کاتە و بە ملیارەها ساڵ هەیە، هەشە بە چرکەساتێک لە نێوانی ئەو کاتەدا کن فیکون-ی خوای گەورە پێویستی بە کات و جێگاو سات و ئان و هیچ شتێک نییە.

حامید: بەڵام لەم باسەدا شتێکت بیرچوو کاک ماکوان خوا لە قورئان دا دەڵێت نموونەی عیسا وەکو ئادەمە لە خۆڵ دروستمان کردووە،

﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴿٥٩﴾﴾ آل عمران

واتە: بەڕاستی نموونەی عیسای لەلای خوا وەك نموونەی ئادەم وایە کە لە خاك دروستی کردوو لەوەودوا فەرمانی داو پێی وت: ببە (بە ئینسان) ئەویش بوو.

ماکوان: ئێ قسەکە دژی خۆت دەبێتەوە، عیسا لە سکی دایکی دروست بووە لەخۆڵ دروست نەبوو، وانییە؟

حامید: ئێ کەواتە ئایەتەکە هەڵەیە، وایە؟

ماکوان: نا؛ تۆ هەڵەیت ئایەتەکە زۆر تەواوە، بەڵام بیرکردنەوە و مێشکی تۆ زۆر بچووکە، ئەصلی مرۆڤەکە لەو ماددانەی کە لەخۆڵدا هەیە و پێشتر ڕوونم کردەوە دروست بووە، ئەگەر سەرنج بدەیت بۆ باسی دوو




هاوڕێکە لە سورەتی الکهف ئەوکات بۆت دەردەکەوێت کە مەبەست لە خۆڵ گەڕانەوەیە بۆ (أصل) ئێ خۆ هاوڕێکەی لە خۆڵ دروست نەبوو، ڕاستەوخۆ بەڵکو مەبەست پێی بنەڕەتیەتی، هیوام وایە ڕوون بێت.

حامید: باشە کۆتا پرسیارم دەکەم و کۆتایی پێ دەهێنم.

ماکوان: من پێمخۆشە بەردەوام بیت لە پرسیار کردن.

حامید: ئەی لە قورئاندا نەهاتووە کە خوا بەدەستی خۆی مرۆڤی دروست کردووە؟ بۆ ئەمەیان چی دەڵێیت؟

﴿قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسۡجُدَ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّۖ أَسۡتَكۡبَرۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡعَالِينَ٧٥﴾ ص

واتە: خوا فەرمووی: ئەی ئیبلیس ئەوە چی نەیهێشت و نایەڵێت سووژدە بەریت بۆ ئەو کەسەی کە بە دوو دەستی قودرەتی خۆم دروستم کردووە؟! ئایا خۆتت بەگەورە زانی یان هەر لە زووەوە خۆت لا بەرزو گەورەیە.

ماکوان: هەر ئەوە دەڵێم کە خوای موتەعال فەرموویەتی: ﴿قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسۡجُدَ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّۖ﴾ تۆ پێت وایە خوای گەورە تەنها مرۆڤی بەدەستی خۆی دروست کردبێت بەهەمان شێوە بۆ هەموو ئاژەڵەکانیش دەفەرمووێت بەدەستی خۆم دروستم کردووە لە سورەتی:

﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا خَلَقۡنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتۡ أَيۡدِينَآ أَنۡعَٰمٗا فَهُمۡ لَهَا مَٰلِكُونَ٧١﴾ يس

واتە: باشە ئەو خەڵکە سەرنجیان نەداوە کە بەڕاستی بە دەسەڵاتی خۆمان ماڵاتمان بۆ درووست کردوون و ئەوان بوون بەخاوەنی؟

پرسیاری من بۆ جەنابی کاک حامید ئەی تۆ بۆ ئەمەیان دەڵێی چی؟ یان خوای موتەعال باسی دروستکردنی هەموو گەردوون فراوانی دەکات کە بەدەستی خۆی دروستی کردووە،



﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ۝٤٧﴾ الذاريات

واتە: ئێمە ئاسمانمان بەدەستی پڕ دەسەڵاتی خۆمان دروستکرد، بەردەوامیش گەورەی دەکەین و فراوانی دەکەین. (ئەمە ئاماژەیە بۆ ڕاستییەکی زانستی کە زاناکانی گەردووناسیی دەیسەلمێنن).

لێرەدا مەبەست لە دەستی خوای گەورە قودرەت و توانا و هێزە، وەکو ئەشعەرییەکان تەئویلی دەکەن، هیوادارم ڕوون بێت، پرسیاری تر بفەرموون.

شوان: کاک ماکوان فەرموودەمان هەیە کە حەوا لە پەراسوی چەپی ئادەم دروست بووە، وەڵامت چییە بۆ ئەمە؟

ماکوان: بە پشتیوانی خوا وەڵام دەبێت، بەڵام دەتوانیت فەرموودەکە بڵێیت؟

شوان: لەبەرم نییە.

ماکوان: ئەی دەتوانیت تێگەیشتنەکەی بڵێیت وەکو ئەوەی بیستوتە؟

شوان: ئەوەندەی کە لەبیرمە ئەوەیە کە ئادەم خەوتووە حەوا لە پەراسوی چەپی دروست کراوە.

ماکوان: سوپاس کاک شوان، ئەوەی جەنابت باسی دەکەیت بەم شێوەیە من بیستومە و خۆم خوێندومەتەوە، باسی ئادەم و حەوا نییە، بەڵکو فەرموودەیەکی ڕاستی پێغەمبەری خوایە ﷺ لەسەرە مەرگیدا وەکو وەسێتنامە بۆ ئوممەتەکەی دەفەرمووێت: لەگەڵ ئافرەتان باش بن لە پەراسوی چەپ دروست بوون (لێرەدا مەبەست پیاوان یان ئادەم نییە، بەڵکو باسی ناخ و دەروونی ئافرەتە کە شێوە گۆییەکی هەیە و چەماوەیە، پارێزگارییە لە دڵ کە زیاتر مەبەست هەست و سۆزە) لەبەشی سەرەوەی پەراسو دەچن ئەگەر ڕاستی بکەیتەوە دەشکێت ئەگەر زیاتر بیچەمێنیتەوە هەر دەشکێت، خۆ ئەگەر وازیشت لێ هێنا هەر




خوارە کەواتە لەگەڵ ئافرەتان باش بن، هەموو فەرموودەکە شێوە وێنایەکە بۆ ناخی ئافرەت بە گشتی نەک دروست بوونیەتی لەپیاو یان لە ئادەم دروست کرابێت...

دەقی فەرموودەکە بەم شێوەیە لە بوخاری و مسلم و إبن ماجە داهاتووە:

(اسْتَوْصُوا بالنِّساء خَيْرًا؛ فإنَّهُنَّ خُلقْنَ من ضلَعٍ، وإنَّ أعْوَجَ شَيْءٍ في الضِّلَعِ أعْلاهُ، فإنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهُ كَسَرْتَهُ، وإنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ أعْوَجَ، فاسْتَوْصُوا بالنِّساءِ خَيْرًا)

ئەو فەرموودەیەم بیستووە و بەخزمەتی گەیشتووم، فەرموو ئەگەر پرسیار یان کۆمێنتێک شتێکت هەیە بفەرمووە؟

شوان: نا؛ سوپاس پرسیارم نییە.

ڕێبوار: بۆ بەڕێز کاک ماکوان، ئایا ئادەم لەبەهەشت دا بووە، دابەزیوەتە سەرزەوی ئەو ئایەتانەی باسی لە چوونی ئادەم دەکەن بۆ بەهەشت مەبەست لێی چییە؟

ماکوان: سوپاس کاک ڕێبوار بۆ پرسیارەکەت زۆر بەجێیە، وەکو باسمان کرد مرۆڤ بونەوەرێکی جوتە پێکهاتەی جەستەی لە قوڕە، خوای گەورە باسی مرۆڤی کردوە، هەڵبەت لێرەدا باسی ئادەم ناکەم جارێ، بەڵکو مەبەستم مرۆڤە بەگشتی بۆ ئەوەی هاوکێشەکەمان تێک نەچێت، هەموو مرۆڤ کە پەرەیسەندووە لەسەر زەوی بووە، بەڵگە قورئانییەکان یەکجار زۆرە لەسەر ئەوە، چەند نموونەیەک بۆ وەڵامی پرسیارەکە لە قورئاندا.

خوای گەورە دەفەرمووێت:





﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًاۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَٱسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيْهِۚ إِنَّ رَبِّى قَرِيبٌ مُّجِيبٌ ﴿٦١﴾﴾ هود

واته: ...ئەو بەرپای کردوون لەم زەویەدا، داوای لێکردوون ئاوەدانی بکەنەوە، بەکاری هێناون تیایدا...

هەروەها دەفەرمووێت:

﴿مِنْهَا خَلَقْنَٰكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ ﴿٥٥﴾﴾ طه

واته: ئێمە ئێوەمان هەر لەم زەویە دروست کردووە، (دوای ماوەیەك) دەتانخەینەوە ناوی، پاشان جارێکی تر دووبارە لەو زەویە دەرتان دێنینەوە (بۆ لێپرسینەوەو وەرگرتنی ئەو پاداشتەی کە شایستەن).

﴿وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ نَبَاتًا ﴿١٧﴾﴾ نوح

واته: هەر خوا خۆی لە خاکی زەوی ئێوەی بەدیهێناوەو پێی گەیاندوون.

ئەم باسەم لەسەر مرۆڤە کە لە زەویدا خوای گەورە دروستی کردووە، گومانمان لەوەدانییە ئەم باسەم لەسەر مرۆڤە، هەر لەسەر زەویدا دروست بووە، بەهەشت لە زمانی قورئان دا تەنها بەواتای بەهەشتی ئاسمان نایەت بەڵکو بەواتای باخ و باخاتی جوان و پڕ بەرووبوم دێت، ئادەم بەهۆکاری بوون بە پێغەمبەری سەرەتا دەشێت خوای گەورە بۆ فێربوونی زانستە ئایینییەکان خستویەتیە باخ و باخاتێکی پڕ بەرووبوم و جوان و نایاب و هەر لەسەرزەویدا کە زۆرێک لە زانایان دەڵێن هیندستان یاخود کشمیری ئێستایە.



کەواتە زۆر دورە لەبەهەشتی ئاسمان، چونكە لەدوای ڕۆژی حەق و حیساب خەڵكی دەچێتە ناوی و پاشان لە بەهەشتدا هیچ شتێک قەدەغە کراو نییە، لەکاتێكدا بە حەزرەتی ئادەم و هاوسەرەکەی خوای گەورە فەرمانی کرد کە لە بەروبوومی جۆرێک لە درەخت نەخۆن، پاشان شەیتان ناتوانێت بڕواتە ناو بەهەشت...هتد.

کورت و پوخت هەموو باس و ڕووداوەکە سەرزەوییە.

حامید: ئەی ئەوە نییە پێغەمبەر لە ئیسرا و میعراج دا چۆتە بەهەشت؟

ماکوان: ئەوەندەی من بزانم تۆ هەڵەیت، نەچۆتە بەهەشت، بەڵکو بەهەشتی نیشاندراوە، وەکو هەواڵێکی یەقین بۆ ئێمەی هێناوەتەوە.

کەسی تر پرسیاری هەیە با بفەرموویێت.

ڕێبوار: کاک ماکوان لە سورەتی الحجر دا بەڕاشکاوانە باسی یەکەم مرۆڤ دەکات کە فریشتەکان سوجدەیان بۆ بردووە، جەنابت باش دەزانی ئەوەی سوجدەی بۆ براوە ئادەمە، الحجر ٢٦-٢٩ بەڕاشکاوانە باسی ئەو پرۆسەیە دەکات.

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٦﴾ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾﴾ الحجر

واتە: سوێند بەخوا ئێمە سەرەتا ئینسانمان لە قوڕێکی وشك دروست كرد كە پێشتر قوڕێکی ڕەشباوو ترشاو بوو ﴿٢٦﴾ پەریشمان پێشتر لە ئاگرێکی بەتین دروست کرد کە بە وردیلە کونەکاندا تێدەپەڕێت ﴿٢٧﴾ یادی ئەوە بکەرەوە کاتێك پەروەردگارت بە فریشتەکانی وت: بەڕاستی من دروستکاری بەشەرێکم لە قوڕێکی وشك کە پێشتر قوڕێکی ڕەشباوو ترشاو

بوو ﴿٢٨﴾ جا کاتێك ڕێك و پێك و تەواوم کرد، لەو ڕۆحە تایبەتیەی کە من (بەدیهێنەری ئەوم، پێمبەخشی، ئەوە هەموتان کڕنووشی بۆ بەرن کڕنووشی ڕێزو بە فەرمانی خوا ﴿٢٩﴾.

ماکوان: سوپاس بۆ پرسیارەکەت دیسان پرسیارێکی زۆر نایاب و بەجێت کرد، وەرە با هەردووکمان ئایەتەکە بەیەکەوە بخوێنینەوە.

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ﴿٢٦﴾﴾ الحجر

دەفەرمووێت: مرۆڤمان لە قوڕێکی لینجی بۆگەنکراوی ڕەش دروست کرد، وایە؟

ڕێبوار: ڕاستە وایە.

پاشان ﴿وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ﴿٢٧﴾﴾ الحجر باسی جۆرێکی تر لە مەخلوق دەکات کە ناویان جنۆکەیە و لە وزەن و لە ئاگری کڵپەدار یان گڕی شینی ئاگر دروست بوون، وایە؟

ماکوان: زۆر ڕاستە، وایە.

ماکوان: پاشان لە ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ﴿٢٨﴾﴾ الحجر زۆر بەجوانی قۆناغی پەرەسەندن دەردەکەوێت قۆناغی مرۆڤ بوون بۆ (بەشەر) فریشتەکان سوجدەیان بۆ بەشەر برد نەک مرۆڤ، پاشان باسی کامڵ بوونی دەکات بە هۆکاری کامڵ بوونی ئەویش جیادەکرێتەوە لە هەموو زیندەوەرەکان کە زیندوون، واتا مرۆڤ بێجگە زیندویەتی خاوەنی ئیمتیازێکی گەورە کە (ڕۆح)ە، ﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ﴿٢٩﴾﴾ الحجر، وایە؟

ڕێبوار: ببورە جیاوازیم لە نێوانی وشەی بەشەر و ئینسان دا نەکردبوو.

ماکوان: ئاساییە، پێشتریش وتمان خوای گەورە کەباسی پێغەمبەرانی کردووە هەموویان بە بەشەر ناوبردووە نەک ئینسان، وایە.

ڕێبوار: وایە ڕاست دەکەیت.

ماکوان: بفەرموون من لە خزمەتاندام بۆ پرسیاری تر.

شوان: کاک ماکوان پەرەسەندن دەڵێت بنەڕەتی هەموو زیندەوەران لە خانەیەکە و بەدرێژی ساڵانێکی زۆر طوڵانی و دوورو درێژە گیانلەبەران پەرەیان سەندووە، تۆش بڕوات بەو پەرەسەندنە هەیە، کەواتە بنەڕەتی ئێمە دەگەڕێتەوە بۆ مەیمون شامپانزی؟ ئایا قورئان لەگەڵ ئەمە یەک دەگرێتەوە؟

ماکوان: ئەگەر سەرنجی قسەکانی منت دابێت من باسی پەرەسەندنی ئاراستە کراوی ڕێکوپێکی خوایی دەکەم باسی سیستەمی مومکین دەکەم، دژی پەرەسەندی داروین و داروینیزمەکانم، لەبەر ئەوەی خودی داروین ئەگەرچی هەوڵی جدی دا بۆ گەیشتن بەزانستی پەرەسەندن بە قوڵی و بەجیهاندا گەڕاوە وەکو زانایەک جێگای ڕێزە، جەنابت دەزانی نزیکی ٢٥٠ ساڵ بەر لە ئێستا تیۆرەکەی نووسییەوە، گومانی تێدا نییە هەڵەی زۆری کردووە، ئەوانەشی کە ناونراون بە داروینیزمییەکان و ڕێچکەی ئەویان گرت، بەتایبەت لەم ساڵانەی دواییدا کە پیاوێکی وەکو ( سێر ئەنطۆنیۆی فلو) باوەڕی هێنا وتی تیۆری مەیمون شامپانزی داروینی تەنها قسەیەکە وەکو خەوخۆشان و بۆ زبڵدان و نامەوێت باسی بەناوی زاناکان سەرقاڵیان بکەم دەنا هەزارانی وەکو (ئێدوین کۆنکلین) کە پرۆفیسۆرو وانەبێژی زیندەوەرزانییە (بایەلۆجی) لە زانکۆی (ئۆهایۆ) و (پێنسلیڤێنیا) هەروەها سەرۆکی یەکێتی ئەمەریکا بووە بۆ پێش خستنی زانست، سەرکۆی دەستەی ئەمەریکی بووە بۆ زانستە سروشتییەکان، بۆیە بە وردی ناوی ئەم کەسەم هێنا هەزارانی وەکو ئەم پرۆفیسۆرە بگرە لە ئاستی ئەویش بەرزتر پەرەسەندنی داروینی زۆر بە نەشیاو بێ مانا دەزانن، چونکە خەریکی



فرتوفێڵ بوون، لەدوای داروین زانستەکە بووە بە ئایدۆلۆژیاو وەکو سیاسەت بەکاریان هێناوە.

بورهان: کاک ماکوان دەکرێت فرتوفێڵە داروینییەکان شتێکی باس بکەیت؟

ماکوان: بەدڵنیاییەوە ئەگەر مرۆڤی (جاڤا) وەربگرین بە نموونە کە دۆزراوەی ئارکۆلۆژیای بەردینە واتا پەیکەری بەردینە دۆزراوەتەوە کە گومانمان نییە هەموو ئەو پاشماوە بە بەرد بوانە حەقیقەتی ڕاستین، بەڵام لەدوای ئەوەی ۱۸۹۱ لە دوورگەکانی دا وای کرد کە وێنەی ئەو بە بەرد بوانە لە (ئیدۆزنیزیا) دۆزرایەوە.

گۆڤاری بەناوبانگی جیهانی National Geographic

شەویلگەی درێژ و برۆی قەوسی ڕاکێشراو لە شێوەی شامپانزیدا ئیتر لای عەوام و پرۆفیسۆرەکانی داروینیزم بۆتەوە حەقیقەتی مطلەق، ئەمە یەکێکە لە فرتوفێڵەکانیان، پاشان فێڵێکی تری داروینزمییەکان، لە دژی ئایین کار دەکەن کە بۆ بوغزاندنی موسڵمان و کرستیان و بەگشتی دیندارەکان دەڵێن مرۆڤ ڕەچەڵەکی لە مەیمونە، لە کاتێک دا گومان نییە لە لێکچوون لە نێوانی ئاژەڵان بە گشتی و مرۆڤدا، نموونە ئێمە لە مشک نزیکترین تاکو مەیمون، ئایا دەکرێت بڵێین بنەڕەتی مرۆڤ لە مشکە؟

بەهەرحاڵ ئەگەر بچینە ناو وردەکاری سەدان بگرە هەزاران و ٩٠٪ زیاتریش دەبینرێت، بەڵام مانای ئەوە نییە بنەڕەتی مرۆڤ لەئاژەڵ بێت، لە ئێستاوە تا ماندوو دەبین و دەتوانین نموونە بهێنینەوە، بەڵام هەرگیز ناتوانین بە ئەقڵ بیسەلمێنین لەنێوانی ئێمە و هەموو گیاندارەکانی تردا هەر ئەو ئەقڵەشە هێزی داوەتە ئێمە کە بتوانین هەموو پەرەسەندی هەرەمەکی داروینی و داروینزمی ڕەد بکەینەوە و لە چوارچێوەی زانست بیکەینە دەرەوە.



کۆتایی قسەکەم بەوە دەهێنم یاساکانی سروشت هەموو لەپێناوی مرۆڤ و تێگەیشتنی پەرەسەندنی مرۆڤ ڕێکخراون و تەنانەت لەناو هەموو گەردووندا هەسارەی ئێمە و کۆمەڵەی خۆر ناوازەترین کۆمەڵەن کە هەموو زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە بۆ پارێزگاری مرۆڤە، ئەمەش لە هەرەمێتی و پەرەسەندنی سوتفە دورمان دەخاتەوە بۆ دڵنیا بوون لە پەرەسەندنی زیرەک و ئاراستە کراو.

ئەگەر هەرکەس پرسیارێکی هەیە من ئامادەم بفەرموون.

دوای ماوەیەک بیدەنگی لەناو کۆڕەکەدا هیچ کەس پرسیار یان کۆمێنتی نەبوو تا لەکۆتاییدا وتم کۆتایی بە کۆڕەکە دەهێنم بەسەرنج ڕاکێشانتان بە دۆزینەوەی RNA و DNA.

بێجگە پرۆتینەکان و گەردەکان هێزێک هەیە کۆدی ئەوان و زمانیان ڕێکدەخات و کاری خۆیان بەوپەڕی جوانی و دیزاینی زیرەک و ئاراستەکراو دەکەن، لەوانەیە من نەتوانم بەزمانی زانستی بایەلۆجی بۆتان بدوێم و وتەکانم وەکو ئەوەی زانست دەیەوێت دەقیق نەبێت، بەڵام هەموتان کە شارەزان لەبوارەکانی جینۆم، باش لەمەبەستەکەم تێنەگەن، هیوای هیدایەت بۆ خۆم و بۆ ئێوەش دەخوازم، بۆ من گرنگ بوو کە هاتمە خزمەتان و بیروڕاکانمان گۆڕییەوە، ئیسلام پەیوەست نییە بە ماکوان یان خەڵکێکی ترەوە، بەڵکو ماکوان یان هەرکەسێکی تر کە قسە لەسەر ئیسلام دەکات بەگوێرەی توانا و تێگەیشتنی خودی قسە دەکات، ئەگەر من هەڵەم کرد ئەوا ماکوان هەڵەی کردووە نەک ئیسلام، چونکە ئیسلام دینی خوایە مطلّەقە و نەک ڕاستە، بەڵکو لەسەرو ڕاستییەوەیە حەقیقەتی موطلّەقە، کاتێک زانیارییەکانی من وەکو موسڵمان نەگەیشتۆتە ئاستی بەرز، کە باسێکی زانستی یاخود لێکۆڵینەوەیەکی زانستی دەبینیت مانای وانییە ئیسلام و دینی پێغەمبەری خوا ﷺ نوقسانە، لەڕاستیدا ئەوە من و تۆین کە زانیارییەکانمان بە گوێرەی پێویست نییە، دینی خوا حەقیقەتە بڕۆ بگەڕێ سەرچاوەی زیاتر بخوێنەرەوە، بۆ زانیاری ئەم کۆڕە



بەڕێزە، هەڵەی خەڵکی لەوەدایە کە دین پێوەر دەکەن بە زانست و فیکر و فەلسەفە، ڕێک پێچەوانەکەی ڕاستە دەبێت زانست و فیکر و فەلسەفە پێوەر بکەین بەدین، ئەوکات ئەقڵێکی ساغ و باشمان دەبێت لەگەڵ لاشەیەکی تەندروست و ڕۆحێکی پاک.

سوپاس بۆ ئێوە هەرکاتێکی تر پێتان خۆش بوو ئێوە ئامادەی گفتوگۆ بوون ئەوا من بە دڵنیاییەوە ئامادەم، بە ئیسلامەکەم بڕوام وایە کە حەقیقەتی مطڵەقە. ئێوارەیەکی خۆش و دووبارە خوا هیدایەتی منیش و ئێوەش بدات.

بورهان: سوپاس بۆ کاک ماکوان ڕێکخراوی زانست و گەڕان خۆشحاڵ دەبێت بەهەر چالاکیەکی تر کە وەکو کۆڕ و مونتەدا و واتا سەکۆی گفتوگۆ ڕێک بخات ئێوەش بەخێر بێن سەرچاومان.

ماکوان: سوپاس بۆ ئێوەش کاتێکی خۆش.

هەموو هەستاین و من ماڵاوایم لە کۆڕەکە کردوە هاتمە دەرەوە سواری سەیارەکەی گەنم بووم، هیوا و نەبەز بەدوامدا هاتن، تەلەفۆنم بۆ کردن کەمن لەگەڵ گەنمی خوشکم دەبم دوای یەکتر دەبینین، ئەوانیش ڕۆشتن، من و گەنم چووین بۆ جێگایەک بۆ گەص خواردن، پێشتر داوام کرد کە لە مزگەوتێک لابدات تا نوێژی مەغریب بکەم، نوێژی مەغریبم کرد و چوین بۆ نان خواردن، دانیشتین و پرسیم کۆڕەکەت پێ چۆن بوو؟

گەنم: ڕاستی ئەوە یەکەم جارە ئەو شتانە ببیستم، ماشاءاللەت لێبێت بۆ قسە دانەئەمایت، کە شانازیت پێوە دەکەم.

ماکوان: حەزدەکەیت ماکوانی برات کەسێکی دەوڵەمەندی ناسراو بێت، یان کەسێکی دینی بانگخوازێکی وەکو ئێستا بێت؟

گەنم: بە دڵنیاییەوە پارەو سەروەت و سامان هیچ نییە، بەڵام ئەوەی لای تۆیە هەرگیز بەپارە هەژمار ناکرێت، بەهەرحاڵ بالەبیرم نەچێت دایکم و بابە جەمال وتیان پێت بڵێم سبەینێ بۆ نان خواردن وەرە بۆ





ماڵمان، توخوا داوات لێدەکەم بێیت. ئەوانیش زۆر زەختیان لێ کردم کە ڕازیت بکەم، هەستم کرد خۆشحاڵ دەبن.

ماکوان: بەسەرچاو بەڵام بۆ زانیاریت من دووکەس یان کەسێکم لەگەڵ دەبێت، پێیان بڵێ ئاساییە، ئەگەرنا دەیخەینە کاتێکی تر.

گەنم خێرا تەلەفۆنی کرد بۆ شیرین خانی دایکی وتی لەگەڵ کاکم دانیشتووین دەڵێت بەیانی دێم بۆلاتان بەڵام دوو کەسی ترم لەگەڵ دەبێت.

شیرین: پێی بڵێ حەز دەکەین دانیشتنەکە خێزانی بێت و با کەسی لەگەڵ نەبێت، پێی بڵی قسەی تایبەتمان هەیە بەیەکەوە.

ماکان: بڵێ باشە لەخزمەتیاندا دەبم.

گەنم بەدایکی وت کە من بەتەنها دەچم و تەلەفۆنەکەی داخستەوە و وتی: زۆر خۆشحاڵ دەبم کە بەیانی دێیت، چیت بۆ دروست بکەم؟

ماکوان: لەڕاستیدا هیچ سیقە و متمانەم بە جەمالی مێردی دایکت نییە، بەڵام ئەگەر بێجگە لە من و جەمال پیاوی تری لێ بوو هەڵدەسم دەڕۆم یان پێشتر تۆ پێم بڵێ، با داوای لێبوردن بکەم و نەیەم، باشە؟

گەنم: بەخوا کاکە بابە جەمال ئەوەندە کەسێکی خراپ نییە، هەست دەکەم ڕێزی تۆی لایە.

ماکوان: یاخوا وابێت، ناچێتە دڵم بەڵام لەبەر دایکت هەر دەبێت ڕێزی بگرین.

گەنم: کاکە بەڕاست ئادەم و حەوا دایک و باوکیان هەبووە؟

ماکوان: ئەی گەنم گیان خۆ لەوی کامێرای شاراوە نەبوو، ئەی هەموویم باس نەکرد بەبەڵگەوە، ئیتر هەر هەمان وەڵامی ئەولام پێیە، بەڵێ ڕاستە ئادەم و حەوا دایک و باوکیان هەیە، بۆ زانیاریت قسەیەک هەیە دەڵێن ئادەم پێش حەوا ژنێکی تری هەبووە.



گەنم: وەڵاهی سەیرە ئەم زانیارییانە یەکەم جارە بزانم.

ماکوان: هەر تۆ نیت خەڵکی تر زۆرە وەکو تۆ و بەردەوام نوێ دەبێت بۆ خەڵکی تریش، بمبەرەوە بۆماڵەوە زۆر ماندووم.

گەنم: بەسەرچاو.



## بڕینی بلیتی فڕۆکەو گەڕانەوە بۆ نەرویج

گەنم گەیاندمیە ماڵەوە داوای زۆر کرد کە سبەینێ بڕۆم بۆ ماڵیان، لەڕاستیدا لە فرتوفێڵی جەمال زۆر دەترسام دەمزانی خاوەنی هیچ پەیمان و قسەیەکی خۆی نییە، چونکە هەرکەس نیشتمان فرۆش بوو، هەرگیز جێگای بڕوا نییە.

بەهەرحاڵ بڕیارمدا بڕۆم، بەدوای دەمانچەکەمدا دەگەڕام نەمدەزانی لەکوێیە، لەدایکم پرسی نەیزانی، لە پێشڕەوم پرسی نەیدەزانی، وتم پێدەچێت لای نەبەز بێت.

تەلەفۆنم کرد بۆ نەبەز وتم وابزانم دەمانچەکەم لە داشبۆردی سەیارەکەی تۆدایە، ئەتوانی تەماشایەکی بکەیت و بۆم بهێنیت ئەگەر عەزێت نییە، بۆ بەیانی ئیشم پێیەتی دەچم بۆ جێگایەک دەبێت پێم بێت.

نەبەز: وا دەڕۆم تەماشا دەکەم، ئەگەر هەبوو هەر ئەم شەو بۆت بهێنم یان بەیانیش دەبێت؟

ماکوان: تۆ دڵنیام بەکەرەوە دوایی ڕێک دەکەوین.

نەبەز: لەناو داشبۆردەکەدایە، ئیشی چیت بە دەمانچەیە کە ئیشت بە دەمانچە بوو واتا دەچی بۆشەڕکردن یان تەقە لە خەڵک دەکەیت؟

ماکوان: زۆرجار هیچیان ناکەیت، تەنها بەرانبەرەکەی دەترسێنیت بەیانی بۆم بهێنە یان نا لای نەسرین خانی دایکت دایبنێ لەوێوە بەیانی بەتەکسی دێم خۆم دەیبەم.

نەبەز: ماکوان زۆر حەزدەکەم بتبینم کارم پێتە، وتم بەخوا دەڵێیت وەرە کەچی نەتوت، ئیشم پێتە دێم بۆلات.





ماكوان: جا ڕۆڵە ئەو هەموو نازونوكە چییە، وەرە و تەواو خۆ خێرە هیچ ڕووی نەداوە؟

نەبەز: نا شتێكی زۆر زەرور هەیە دەمەوێت باسی بەكەم، كەهاتم هەموو شتێک دەزانی.

ماكوان: باشە بەخێر بێیت چاوەڕێم.

میوەم حازر كرد تا هات...

هاتە لام لە حەوشەكە بەیەكەوە دانیشتین دەمانچەكەی دامێ وتی: توخوا بۆ چیتە؟

ماكوان: جا سوێند بۆ دەخۆیت، بەیانی دەچم بۆ ماڵی گەنم حەز دەكەم پێم بێت، متمانەم بە جەمال نییە، لەبەر ئەوەیە.

دەی با منیش بێم لەگەڵت؟

ماكوان: بیرم لێ كردەوە تۆ و هیوا بەرم، بەڵام دەڵێن حەز دەكەین تایبەت بێت و قسە باسی خێزانی دەكەین، منیش واتم باشە خۆم دێم، بەڵام ئەگەر سبەینێ ئیشت نییە و دەوام ناكەیت لەو دەوروبەرە بە، ئەگەر تاقەتت بوو بە پێشڕەویش دەڵێم لەگەڵتا بێت، بەڵام باسی هیچ مەكە باشە؟

نەبەز: پێویست ناكات خۆم لەو ناوە دەبم دوكانی كوڕێكی ڕەفیقم لەوێدایە دەچمە لای ئەو.

ماكوان: ترێ بخۆ ئەوە بۆ وا بە ئاقڵی دانیشتویت ئەڵێی لەگەڵ دایک و باوكت هاتویت بۆ میوانی، بڵێ بزانم چیت دەوێت، قسە بكە.

نەبەز: ئاخر ئاسایی وەریدەگریت و توڕە نابیت؟

ماكوان: قسەكە نەبەز چی بووە؟






نەبەز: هیچ نەبووە، تۆ دەزانیت ئێمە نمەکی ماڵی یەکمان کردووە، خۆت باش دەزانی چاوی خیانەت حەز لێناکەم، من دەزانم تۆ سەیرانی خوشکم وەکو خوشکەکانی خۆت تەماشا دەکەیت، منیش ناتوانم هاوڕێ و پشت وپەنات بم چاوم خیانەت بکات، دەمەویت بێمە داخوازی گەنمی خوشکت.

ماکوان: هەتیو زۆر کەریت.

نەبەز: نەموت تورە دەبیت؟

ماکوان: کورە گەنم دەستگیرانی هەیە، دەنا من خۆم بۆت داوا دەکەم، وا نەزانی پێم ناخۆشە، لەتۆ پیاوترم دەست ناکەوێت.

کەوام وت هەناسەیەکی هەڵکێشا، زۆر بەزەیم پیاهاتەوە.

نەبەز: بەخوا شوم و نەگبەتم هیچم بۆ نابێت. لەگەڵ هیوا و وریا قسەم کرد ئەوان پێت بڵێن، وریا وتی من کاری وا ناکەم، هیواش وتی ڕووم نایەت، باشتر خۆم هاتم، ئەم دەستگیرانە سەگبابەی کێیە؟

ماکوان: بۆ بڕۆین لێی بەین و پەشیمانی بکەینەوە؟

نەبەز: ئەی قەیچیەکات.

ماکوان: من ئەڵێم کەری بڕوا ناکەیت، ئەزانی دەستگیرانەکەی کامە بوو؟ ئەو کوڕە بوو ئەمڕۆ لەتەنیشت هیوا وە دانیشتبوو یەکەم پرسیاری لەمن کرد.

نەبەز: ئەو جیقنە بوو؟

ماکوان: بەڵێ؛ ئەو جیقنە بوو، من زەواجەکەم ڕاوەستاندووە لەبەر ئەوەی بێ دینە، وتومە تا دیندار نەبیت خوشکی خۆمت نادەمێ.

نەبەز: ئێ کە کافر و بیدین و سەگوسەگبابە بۆچی بیدەینێ؟



ماکوان: بۆ تۆ سەڵاحەدینی ئەیوبیت؟ هەردوکیان دڵیان بەیەکەوەیە، نەبەز کاری قۆڕ نەکەیتِ نامەوێت گەنم دڵی بشکێت، چونکە ئەو کچە زۆر ماندووە با ئەمەشی بەسەر نەیەت.

نەبەز: ئێ کافرە بێدینە نابێت.

ماکوان: دەزانم نابێت، بەڵکو بگەڕێتەوە و خوای گەورە هیدایەتی بدات.

نەبەز: باشە ئەگەر خوا هیدایەتی نەدات، ئەیدەی بە من؟

ماکوان: هەتیو خۆ تەزبیح نییە، خوای گەورە هیدایەتی بدات، من دەڵێم دڵیان بەیەکەوەیە ئینجا چی بەم بە تۆ گەنم خۆی خاوەن بڕیارە.

نەبەز: ئێستا من چی بکەم؟

ماکوان: هیچ بڕۆرەوە بۆ ماڵەوە یان لێرە بخەوە و گەنم لەبیر بکە بۆ تۆ نابێت و حەزی لە کەسێکی ترە، لەبەردەستی خۆمان پەروەردە نەبووە، ناتوانین دڵی بگۆڕین و ناشمەوێت بیگۆڕم، بادوایی من تاوانبار نەبم و لەکۆتاییدا ببمە هۆکاری تێکدانی ژیانی.

نەبەز: باشە شەو شاد، خوا حافیز.

ماکوان: خوات لەگەڵ لەبیری بکە بە قسەم بکە.

بۆ بەیانی چوومە نووسینگە لەگەڵ کاک توانای دیزاینەری گۆڤاری بزاڤ خەریکی دیزاینی گۆڤاری بزاڤ بوین تەواویان کرد کاک دلێر و کاک کاروان و کاک محمد سالار و ئەوانی تر بڕیاردەری ناردنی بوون بۆ چاپخانە، ئەو ڕۆژە زۆر دڵخۆش بووم، لەئێوارەدا گەنم تەلەفۆنی کرد وتی کاکە حەز لە کوبە دەکەیت؟

ماکوان: هیوایەتمە دەستخۆش بێت شازی خوشک، ئەرێ گەنم دەنگوباسی وەرزێر چی بوو تەلەفۆنی بۆ نەکردویت؟

گەنم: نەوەڵڵا کاکە تەلەفۆنی نەکردووە، بەس حەز دەکەم بەڕاستی پێت بڵێم کە ئێستا کەسێکم بەتەواوی خوام ناسیووە ڕاستی ئەگەر پێت بڵێم ناچێتە دڵمەوە بڕوام پێ بکە لەبەر تۆ ناڵێم، بەڵام لەبەرچاومدا لە مەیمون و بەراز دەچێت.

ماکوان: ئاخر ئەوان خۆیان دەڵێن بنەڕەتیان مەیمون و بەرازە، بڕوا بکە لەنەوەی ئەو دوانەن ، بەهەرحاڵ هۆکارەکەی ئەوەیە هیچی تر نییە کەسی تر نەچۆتە جێگاکەی لە دڵتا؟

گەنم: ئەیەڕۆ کاکە تۆ چی دەڵێی، نەبەخوا نامەوێت بەدایکم وت هەموو شتەکانی بۆ دەگێڕمەوە.

ماکوان: ئەی دایکت وتی چی؟

گەنم: وتی خۆت دەزانیت، خۆ بەزۆر ناتدەین بە شو.

ماکوان: ئاگات لەسنووری خۆت بێت ئەگەر ئەو کوڕە موسڵمان بوو خواناس بێت وەعدە لەسەرمان کە شوی پێ بکەیت، ئەگەر کەسی تر چۆتە دڵتەوە با بزانم لێم مەشارەوە.

گەنم: کاکە بەخوا سەیرە بڕوام پێناکەیت، ئەگەر ئەو پیاو بێت و موسڵمان بێت، بەخوا پەشیمان نیم بەڵام سەروچاوی پێناچێت چونکە من دەیناسم، ئەوە لەبەر تۆ نەیاندەوێرا قسە بکەن دەنا زۆر کوفر دەکەن، من دەیانناسم بەخوای گەورە قەسەم کەس لەدڵ و مێشک و بیرمدا نییە، بەڕاستی وەرزێریشم لەبیرنییە.

ماکوان: سوپاس بۆ خوا، کچی باوکی خۆتی دوای تۆزێکی تر دێمە خزمەتان بە جەمالی میردی دایکت بڵێ خزمەتی زۆری ماکوان بکە (بەپێکەنینەوە).

ماڵاوایمان لەیەک کرد و خێرا تەلەفۆنم کرد بۆ نەبەز، پرسیم لەکوێیت؟



نەبەز: دە خولەکی تر دێمە بەردەرکی سەرا لە ئەسحابە سپییەوە سەردەکەوم، وەرە بەردەم کتێبخانەی سلێمانی یان چایخانەی شەعب باشە؟

ماکوان: باشە.

چوومە ئەوێ و هات مۆڕەی لێدەکردم، وتم ئەوە چییە نەبەز بۆ مۆڕە دەکەیت؟ ئێ گەنم دەستگیرانی هەیە من بڵێم چی.

نەبەز: ئێ تۆ برا گەورەیت، مەیدە بەو کافری سەگبابە و تەواو.

ماکوان: ئەی ئەگەر گەنم وتی شو بە نەبەز ناکەم چی دەکەیت؟

نەبەز: هیچ وەکو خوشکی خۆم سەیری دەکەم، هیچی کەمتر نابێت لە سەیران.

ماکوان: دەبا مژدەیەکی خۆشت بەمێ، بەخوا ئێستا قسەم لەگەڵ کرد هەواڵی دەستگیرانەکەیم پرسی وتی: چاوی دەرێ بێدینی کافرە لە مەیمون و بەراز ئەچێت، ئەگەر هات و هەر لەسەری بێدینی مایەوە ئەوا سوپاس بۆ خوا گەنم هاتۆتە ئەو بڕوایەی کە وازی لێبهێنێت، ئەمەش لەڕاستیدا دڵخۆشکەرە، نەک لەبەرخاتری تۆ، بەڵکو واتای وایە گەنم بووە بە خواناس و ئیماندارێکی باش.

نەبەز: بەخوا ئەمشەو دوعای دنیام کردووە کە خوا هیدایەتی نەدات.

دەستم کرد بە پێکەنین وتم: ڕۆڵە گوناحت دەگات، دوعای هیدایەتی بۆ بکە.

نەبەز: دوای ئەوەی کە گەنم شوی کرد دوعای هیدایەتی بۆ دەکەم، ماکوان تۆ برامی شەرەفی تۆ شەرەفی منە، بەڵام دەمەوێت خۆت بزانیت گەنمی خوشکت ئافرەتێکی زۆر بەڕێزە زۆر دەمێکە بەدوای کچێکی وادا دەگەڕێم، توخوا هاوکاریم بکە.




ماکوان: تۆ زۆر لەو گەورەتریت تۆ موالیت ٨٠یت ئەو وابزانم ساڵی ٩٠ لەدایک بووە، بۆ تۆ نابێت.

نەبەز: من دەڵێم هاوکاریم بکە، تۆش قورسی دەکەیت.

ماکوان: نەبەز پێ زیاد ڕامەکێشە دەی لێخورە بۆماڵی گەنم، کاتم نەما بابڕۆم. لەم دەوروبەرە بەو تەلەفۆنەکەت با مەشغوڵ نەبێت، نەوەک لەپڕ تەلەفۆنت بۆ بکەم دوای نان خواردن، ئەگەر زانیم باسەکە هیچ نییە دوای سەعاتێک هەڵدەسم خۆت تەلەفۆنم بۆ بکە باشە بڵێ گەورەم لەدەوام زەرورە بانگت دەکەن، باشە؟

نەبەز: زۆرباشە.

ماکوان: حەز دەکەم شتێکت پێ بڵێم نەبەز وەکو پێشڕەوی برام تەماشات دەکەم، تۆ ئەگەر ژن بهێنیت خۆم دەچمە داوای بۆت، وانەزانیت گەنم قابیلت نییە و من پێم ناخۆشە، بەڵام خۆت باش دەزانیت نامەوێت کەس بریندار بکەم لەبواری ژنهێنان و هاوسەرگیریدا، دە دابەزە ئەوەی پێم وتی بیکە.

نەبەز: قوربانی تۆ بم هەر ئەوەت لێ ڕادەبینم، فەرموو دابەزە.

نەبەز ڕۆشت و چووم بۆماڵی گەنم پێشوازییەکی زۆر نایاب و ڕێزدارانەم لێکرا، هەم لەلایەن جەمالەوە هەم لەلایەن شیرین خانیشەوە، گەنم زۆر خۆشحاڵی دەربڕی و کەمێک دانیشتم و هەندێک قسەوباسمان کرد و لەگەڵ کاک جەمال ئاگام لێی بوو لەدەوری ئەوە خولی دەخوارد دەیویست بزانێت من چ کارەم، منیش هەر دەموت کاری ڕۆژنامەنووسی ماندووی کردوم.

نان و سفرەیەکی زۆر جوان ڕازێنرابوەوە بانگ کرامە سەر سفرەکەیان من و گەنم لەتەنیشتی یەکەوە بووین و کاک جەمال و شیرین خان و منداڵەکانی تریان هەموویان لای یەکەوە دانیشتبوون، لەکاتی نانخواردن دەمانچەکەم دایە دەستی گەنم وتم بیخە جێگایەک تا نانەکەم دەخۆم





ئیزعاجی کردووم، هەڵبەت لەبەرچاوی هەموویان دا هەڵسا بڕوات وتم دابنیشە نەموت خۆت ماندووکە، بێنە بیخەمە ژێر مێزەکە وردە وردە دەستمان کرد بە نانخواردن، جەمال هەستا ڕۆشت لەخۆوە هەستم بە شتێکی زۆر نائاسایی کرد، زانیم شتێک لەئارادایە، بەڵام هەموو منداڵەکانی و خێزانەکەی لەگەڵ منداڵ، وتم هەر بیرکردنەوەی نێگەتیڤی خۆمە بەردەوام بووم لەنان خواردن جەمال هەر نەهاتەوە هەموو سەر سفرەکەیان چۆڵ کرد، من و شیرین خان و گەنمماینەوە.

شیرین: گەنم ئەگەر تەواو بوویت دەمەوێت هەندێک قسەی تایبەت لەگەڵ کاک ماکوان بکەم.

گەنم: دەمێکە تەواو بووم، ببورن وا دەچم چایتان بۆ ئامادە دەکەم.

شیرین: باشە دەست خۆش کچی خۆم، کاک ماکوان تۆ نمەکی ماڵی ئێمەت کرد، دەزانم کوڕێکی دیندارى و پارێزەری نهێنیت و هەست بە ئازار و موعاناتی خەڵکی تریش دەکەیت، چونکە باوکیت و خاوەن خێزانیت.

ماکوان: بەڵێ؛ بە دڵنیاییەوە، خێرە؟

شیرین: خێر دەبێت ان شاءالله، دڵت هیچ نەکات بۆیە جەمال هەڵسا ڕۆیشت ئەو لەودیو دانیشتووە، قسەکانی بۆ من بەجێ هێشت، ڕووی نەبوو لەگەڵ تۆ قسە بکەت.

کاکە ماکوان من خێزانی (عەبدولکەریمی حەمەی سەعیدی پێنجوێنی) نەبووم، بەڵکو من خێزانی پیاوێکی ناوچەی پشدەر بووم بەناوی (عەبدولکەریمی حەمەی سعیدی پشدەری) باوکی جەنابت زۆر ناسراوە و خەڵکی هەموو خانەوادەی ئێوە دەناسن، بەڵام عەبدولکەریمی پشدەری هاوسەری پێشووی من کەس نایناسێت، چونکە هەموو ژیانی لەبەغداد بووە، ساڵی ١٩٩٢ لە ڕێگای کەرکوک-بەغداد گیانی لەدەست داوە، دوایی






وێنەکانیت نیشان دەدەم، دایکی عبدولکەریم ناوی (سەلما وسو عوسمان) بوو، نازانم ناوی دایکی باوکی بەڕێزتان چییە؟

ماکوان: خونچە صابر.

شیرین: زۆرباشە دوایی هەموو ناونیشانێک لەنفوسی ڕانیەت ئەدەمێ دەتوانی خۆت دڵنیابیتەوە.

ماکوان: ئەی ئەم فیلمە چییە. چۆن گەنم خوشکی منە و بۆ پێشتر واتان نەوتووە؟

شیرین: لەسەر سفرەکەمان دانیشتویت، تکایە پەلە مەکە با هەموویت بۆ ڕوون بکەمەوە، بەڵام تکایە لەبەر گەنم ئاسایی بە تا بەویش دەڵێین.

گەنم ساڵی ١٩٩٦ زۆر بچووک بوو تووشی نەخۆشی زەردووی بوو، من ئەوکات شوم نەکردبوو بە جەمال، بەڵام پێشتر بڕیاری زەواجمان دابوو، ئەو لە موعارەزەی تورکمان بوو منیش لەبەر وەرگرتنی ئازوقەی مانگانە دەچووم بۆ بەرەی تورکمانی لێرە لەگەڕەکی ڕیعایە بوو، پارەم نەبوو ئازوقەیان ئەدا کە دەنگیان بدەینێ، بەهەرحاڵ جەمالم ناسی و شوم پێکرد، گەنم نەیدەزانی جەمال باوکی نییە، باوکیشی لە ڕێگای بەغداد-کەرکوک مردوە بە ڕووداوی هاتوچۆ، من نەمتوانی تەرمەکەی بهێنمەوە بۆ سلێمانی یان بۆ پشدەر و ناوچەی خۆیان، کەسوکاری هەمو لە بەغداد بوون و ڕێگایان نەدا بیهێنمەوە، زۆر سەرت نایەشێنم ساڵی ٢٠٠٣ پێش ئەوەی حکومەتی عێراقی بڕوخێت خوشکێکی جەمال لەچەمچەماڵ تووشی ڕووداوی هاتوچۆ بوو تۆ خۆش.

ماکوان: خوا لێی خۆش بێت.

شیرین: هێنایانەوە بۆ سلێمانی تەرمەکەیان لە سلێمانی ناشت لە گردی سەیوان، لەنزیک گۆڕەکەی باوکی ڕەحمەتیت، هەموو جارێک لەگەڵ جەمال دەچوین بۆ گردی سەیوان بەلای گۆڕی باوکتا تێپەڕ دەبووین





ناوەکەی (عەبدولکەریمی حەمەی سعید پێنجوێنی) بوو زۆر ببورە من بۆیەی پێنجوێنیەکەم هەڵکەند بەس ناوی باوکت و باوانی مایەوە.

بۆ دڵئارامی گەنم کە زەردوویەکەی زۆر لاواز و بێتاقەتی کردبوو هەر دەیپرسی باوکم کێیە، منیش کەس ناناسم لەکەسوکاری باوکی هەڵبەت براو کەسوکارەکەی دەناسم وەکو ناسین بەڵام لەشاری بەغداد بوون لەوێ دەژین، لە ئێمەیان نەپرسیوەتەوە، گەنمیش داوای باوکی دەکرد بزانێت کێیە، خۆ بەخوا جەمال لەباوک باشترە بۆی، بەڵام دەیزانی کە جەمال باوکی نییە، بۆیە من درۆم لەگەڵ کردو گۆڕەکەی باوکتم نیشان دا و وتم ئەوە قەبری باوکتە.

ماکوان: ئێ لەسەر قەبری باوکم نووسراوە شەهید کرا، ئەو نەیپرسی باوکم چۆن شەهید کرا؟

شیرین: وەڵڵاهی کوڕی خۆم ئەو دەیزانی باوکی بە ڕووداوی هاتوچۆ مردووە، هەڵبەت من بۆم باسکردبوو، بەڵام وشەی شەهیدیەکەی زۆر ئاسایی وەرگرتبوو، هەرگیز پرسیاری لەسەر نەکردووە. من وامدانابوو ئەگەر بپرسێت دەموت بەڵێ شەهیدە بەڕووداوی هاتوچۆ مردووە بە شەهید حساب دەکرێت، لەم مانگەدا پرسیاری زۆری لێ کردم، لەدوای ئەوەی تۆو ئەو سوتفەی یەکتان کردبوو، ئەو زۆر دەگمەن نەچوو بۆ سەرقەبران، بۆیە هەرگیز بیرم لەوە نەکردبوەوە کە کەسێکی ئێوە ببینێت، پێشم وتبوو کە پێنج شەمان و جومعان نەڕوات چونکە باوکت گوناهبار دەبێت، ئیتر ئەو بڕۆشتایە شەممە یان یەکشەممە دەڕۆشت و خۆمانی لەگەڵ بووین.

ئەو ڕۆژە جەمال لەجادەکە چاوەڕێی دەکرد کە تووشی بەڕێزتان بوبو، جا کاکە ماکوان بەدڵنیاییەوە تازە تۆ کوڕی ئەمماڵەی، گەنم هەر خوشکی تۆیە، بەڵام گەنم وتی تۆ پلانی ئەوەت هەیە کە بەکەسوکارت بڵێیت، منیش دەزانم کە ئەم کێشەیە گەورەتر دەبێت، بۆیە بڕیارمدا ئەمشەو بەهەردووکتان بڵێم، جا تۆ هاوکارم بە با بەگەنمیش بڵێین بەڕاستی ئەوە



حەقیقەتەکەیە کە بۆم باسکردیت، باوەڕ ناکەیت فەرموو بڕۆ نفوسی ڕانییە خۆم دێم لەگەڵت هەمووی بۆ دەردەهێنم.

ماکوان: بەڵێ باوەڕ دەکەم، بەڵام بەڕاستی من گەنم وەکو خوشکی خۆم مامەڵەم لەگەڵ کردوو هەست و سۆزی برایەتی ١٠٠٪م بۆی جوڵا، جا من چی پێبڵێم، بڵێم برات نیم؟ بەخوا من دڵم نایەت، فەرموو خۆتان پێی بڵێن.

گەنم خۆی کرد بەژوورا و چاوی پڕ بوو لەگریان وتی: پێویست ناکات هیچ بڵێیت، گوێم لە هەموو شتێک بوو، خوا من بکوژێت بۆ چ دایک و خێزانێک هەمە، ڕایکردە دەرەوە.

ماکوان: بۆ کوێ گەنم؟ هەموو لە پەنجەرەکەوە تەماشمان دەکرد سواری سەیارەکەی بوو بەگریانەوە ڕۆشت، خێرا تەلەفۆنم بۆ نەبەز کرد وتم لەکوێیت، وتی بەرانبەرماڵی جەمالم، وتم فریای گەنم کەوە شوێنی بکەوە بە سەیارەکەی ڕۆشت زۆر تووڕەیە لێت ون نەبێت.

نەبەز: وەڵا بینیم هاتە خوارەوە سواری سەیارەکەی بوو، ئێستاش چاوم لێیەتی.

ماکوان: شوێنی بکەوە لێت ون نەبێت، منیش بە شوێنتا دێم، ئەگەر ڕێگاکەی لێ بگریت کارێکی باش دەکەیت، چونکە تووڕەیە نەوەک کارێکی نەخوازراو ڕووبدات.

نەبەز: خەمت نەبێت کەوتمە شوێنی.

شیرین: بەقوربانتان بم فریای کەون.

جەمال: کاک ماکوان بابڕۆین بەیەکەوە، تەلەفۆنەکەی نەبەزم لێداو دەنگەکەیم دا بەدەرەوە، پرسیم لەکوێن؟ بامنیش بێم لەگەڵ کاک جەمال دام.



نەبەز: وا لەڕێگای مەحکەمەم زۆر خێرا دەڕوات، بەرەو جادەی فرۆکەخانە دەڕوات.

ماکوان: هەرچیت کردووە ڕێگای پێبگرە و مەهێڵە بڕوات باشە برا؟

نەبەز: تەلەفۆن بۆ دەوریەکانی ئاسایشی دەوری فرۆکەخانە بکەم بیوەستێنن؟

ماکوان: کارێکی زۆر باش دەکەیت وابکە، با هەرچییان کردوە بیوەستێنن.

تەلەفۆنی داخستەوە بە جەمال-م وت: کوڕی باش با زوتر ئەم قسەیەت بکردایە.

جەمال: بەخوا ترسام وتم ڕۆژنامەنووسە و لەسەرمان دەنووسێت، زۆر خۆم بەدوور گرت پاشان تەماشام کرد هەر ڕۆژنامەنووس نیت پێدەچیت شتی تریش بیت، بۆیە لەڕاستیدا نەموێرا هیچ بڵێم وتم با گەورەتر نەبێت.

ماکوان: بەهەرحاڵ هەرچی بم بەڵام بۆ کێشەیەکی لەم شێوەیە هاوکاری دۆست و دوژمنم.

جەمال: تازە شتەکە ڕۆشت.

نەبەز تەلەفۆنی کردەوە و تی: کاک ماکوان لەناو سەیارەکە وەستاندوویانە و دەگری دانابەزێت.

ماکوان: بە ئاسایشەکان بڵێ تەنها بەری لێبگرن و نەهێڵن بڕوات، با بەئارەزووی خۆی بگری، بەڵام ئاگادار بە قسە و شتی پێ نەڵێن.

نەبەز: خەمت نەبێت، خۆشم دابەزیوم چاوم لێیەتی، لەنزیک فرۆکەخانەیە لەسەرجادەکە لای داوە، خێرا وەرن چونکە ئاسایش چاوەڕێ ناکات.




ماکوان: باشە واهاتین، کاک جەمال تۆزێ خێرا بڕۆ وەستاندویانە زۆر باشە، کە نزیک بوینەوە لەناو سەیارەکەدا دەگریا، بە ئاسایشەکانم وت ببورن ئەوە خوشکی منە کێشەیەکی هەیە لەگەڵ دایکم بۆیە وا دەکات، خێرا دامبەزاند و لەگەڵی چوومە دواوە لەسەیارەکە دانیشتین، بە نەبەزم وت سەیارەکەی خۆت بە دەستی ئاسایشەکانی هاوڕێت وەرە لێخوڕە، سویچەکانم لەگەنم وەرگرت.

نەبەز سەیارەکەی خۆی دایە دەستی هاوڕێکانی و وتی بۆ کوێ بڕۆم؟ لێخورە بۆ ماڵی خۆتان.

نەبەز چووە ماڵەوە گەنم دابەزاند و تەلەفۆنم کرد بۆ شیرین خان وتم سەلامەتە و لەگەڵ مندایە، بەڵام کاک جەمال-م لێ ون بووە، پێی بڵێت ئەویش خەمی نەبێت، سەیران و دایکی نەبەز کەوتنە پرسیار کردن، من و نەبەزیش بێدەنگین، نەبەز نازانێت چی ڕوویداوە، لەپڕ توڕە بوو لە دایکی و سەیران وتی نابینن ئەو کچە بەستەزمانە چۆن ئەگری دە بەس پرسیار بکەن.

نەسرین: بۆیە ئەپرسم بزانم کێیە و چی ڕوویداوە و بۆ ئەگری؟

نەبەز: خوشکی خەسرەوە، تازە یەکتریان دۆزیوەتەوە، دڵت ئاوی خواردەوە، منیش نازانم چی بووە، لەمردن ڕزگارمان کردووە وازی لێ بێنن باهێمن بێتەوە قسەمان بۆ دەکات.

ماکوان: نەسرین خان پەلەمان لێ مەکە دوایی هەموویت بۆ باس دەکەم.

گەنم بینی سورو ڕەش هەڵگەڕابوو، هەنسکی هەڵئەدا و هەناسەی بۆ نەئەدرا، زۆر بەزەیم پیا دەهاتەوە.

نەسرین: زانیم باوکی بەسەر ئەو ئامە خانەی داکیت ژنی تری هەیە، بەخوا پێشتریش ئەموت، ئەها ئەوەتا قسەکەم هاتە دی.





ماکوان: نازانم نەسرین خان تۆ بۆ نەبویت بە شیکاری سیاسی کە ئەوەندە خوێندنەوەت بۆ ڕووداوەکان واقیعیە؟

هەموو دەستمان کرد بە پێکەنین، گەنمیش زەردەخەنە گرتی، بە سەیرانم وت بیبە با دەموچاوی بشوات.

نەبەز: کاکە چیبووە بۆ دەگری؟

ماکوان: ئاشکرا بوو کە خوشکم نییە و هیچ پەیوەندی بە منەوە نییە.

نەبەز: بۆ ئەوە دەگری کە خوشکت نییە؟

ماکوان: نا؛ بۆ ئەوە دەگری کە دایکی درۆی لەگەڵ کردووە.

نەبەز: ئەی ئێستا چی بکەین؟

ماکوان: هیچ با دەموچاوی بشوات و کەمێک ئارامی بکەمەوە دەیبەینەوە بۆ ماڵی خۆیان.

گەنم هاتەوە وتم: بۆ وادەکەیت خۆ برایەتی بە تەسکەرە و دەفتەرنفوس نییە، تازە پێت خۆش بێت و پێت ناخۆش بێت من براتم و وازت لێناهێنم، جا بۆ خۆشی و دڵئارامی تۆ ئەم کارەیان کردووە.

گەنم: چاک خەجاڵەتی لای تۆش بووم کاک ماکوان.

ماکوان: ئەوە چییە، بڵێ کاکە ماکوان ئەڵێی لەبیرت چۆتەوە کەمن برا گەورەتم.

گەنم: وەڵڵاهی بەداخم کە برای باوکیم نەبوویت، داوای لێبوردن لەهەموتان دەکەم.

ماکوان: نەتهێشت نانەکەم بخۆم، نازانم تۆ بڵێی چایەکەت نەکوڵا بێت؟ هەستە خوشکی جۆم بابڕۆین دایکیشت دڵی لە نارەحەتیدایە و جەمالی فەقیریش ڕەنگی بوو بوو بە خەڵوز، هەموو خەمی تۆیانە،






بابڕۆین خوشکە ئازیزەکەم، نەبەز سویچەکانی بەرێ بابڕۆم دەمانچەکەم بهێنمەوە لەوی لەبیرم چووە.

نەبەز: خۆم دەتانگەیەنم، با لەگەڵت دابنیشێت، ناتوانێت سەیارە لێبخورێت.

گەنم: نا؛ ئاساییە کاک نەبەز، بڕوا بکە زۆر ئاسایم، هەر حاڵەتێک بوو تورەی کردم.

نەسرین: یەعنی خوشکت نییە؟

ماکوان: نەوەڵڵا لێکۆڵینەوە و تەحلیلەکەت فشە دەرچوو.

هەموو دایانە قاقای پێکەنین.

نەبەز: بەخوا هەر خۆم ئەتانگەیەنم بفەرموو،

ماکوان: باشە فەرموو بابڕۆین، چوومە تەنیشتی نەبەز بەهێواشی چپاندم بە گوێیدا وتم ئەزانم کوێت دێشێت بۆت بشێلم؟

نەبەز: نەبەخوا بەس کاکە ئەعصابی تەواو نییە

ماکوان: وەی لەبەر ئەصعابت بمرم، بڕۆ لێخوڕە بۆ ماڵی جەمال.

هاتینە دەرەوە جەمالمان بینی بەسەیارەیەکەوە وەستابوو، وتم ئەی بۆ نەهاتیتە ژورەوە.

جەمال: ئاساییە کاک ماکوان گیان نەمویست ئیسراحەتان لێ تێک بدەم، وتم با گەنمیش ئارام بێتەوە، زانیم وازی لێناهێنیت.

ماکوان: دەی کاک جەمال من ئێستا گەنم دەهێنمەوە، جەنابت پێشتر بڕۆ، شیرین خان ئارام بکەوە بڵێ گەنم هەرچی وت وەڵامی نەداتەوە، ئەوە باشترین ڕێگایە لە ئێستادا بۆ ئارام کردنەوەی گەنم.

جەمال: بەسەرچاو خواتان لەگەڵ.



ماکوان خوات لەگەڵ.

هاتمەوە بۆلای سەیارەکە گەنم وتی ئەوە جەمال بوو زانی لێرەم؟

ماکوان: بەڵێ زانی، بەڵام چونکە منت لەگەڵ بوو ئەویش ئارام بوویەوە حەزی کرد من بتبەمەوە بۆ ماڵەوە، مەگەر من برای گەورەت نیم؟

نەبەز دەرچۆ بڕۆ بۆ ماڵی گەنمی خوشکم، ئاوا بێدەنگ دامەنیشە، کە چووینە ماڵەوە ئاسایی وەریبگرە من ماوم و دایکت و براوکەسوکارت هەمو ماون، چیت دەکرد من بمردمایە خەمێکی تر بوو بۆت.

گەنم: خوا نەکات.

ماکوان: دەمادام وایە تۆ کچێکی خواناسیت و ئیمانداری سوپاسی خوای گەورە بکە بۆ ئەو هەموو نیعمەتەی پێیبەخشیویت، ئاقڵی و ئیمانداری و جوانی شەخسێت و پارەو ڕزق و ڕۆزی باش، ئەمانە پێویستە دوعای خێری لەسەر بکەیت و سوپاسگوزاری نیعمەتی خوا بیت و کوفری نیعمەت نەکەیت.

گەنم: هەرگیز کوفری نیعمەت ناکەم.

ماکوان: با کردت بەڵام دووبارەی مەکەوە، خۆشت دەزانیت بۆکوێ دەچیت، بەهەرحاڵ ئەوەی ڕابورد بووە ئەزمون بۆمان.

بەدەم قسەکردنەوە چووینە بەردەمی دەرگای ماڵیان و کاک جەمال خوڵکی کردین، نەبەز سویچەکانی دایە دەست کاک جەمال و من چوومە سەرەوە، کاک جەمال خوڵکی نەبەزی کرد، بەڵام نەبەز وتی من کارم هەیە و دوایی دێمەوە بۆلای کاک ماکوان.

چوومە ژورەوە و گەنم چووە ژورەکەی خۆی، من و کاک جەمال و شیرین خان دانیشتین باسی ئەوەم کرد دڵنیابن منداڵ زۆر لەگەورە بەتواناترە، بۆ وەرگرتنی ئازار و ناسۆرەکان، ئەگەر هەرچی ڕوویدا پێویستە





بەڕاستی و دروستی پێیان بڵێین تا کێشەی تری لێ دروست نەبێت، بەهەرحاڵ باش بوو.

باسەکەتان کردەوە سوپاس بۆ خوا بەوە کۆتایی هات، ئەوکات من کەسوکارم ئاگادار بکردایەتەوە پێدەچوو ناخۆشتر بوایە، ئێستا بە گەنم وت من هەر برای ئەوم، وەکو خوشکی خۆم دەمینێتەوە بگرە زیاتریش.

جەمال: زۆر سوپاس کاک ماکوان، هەر ئەوەمان لێ چاوەڕێ دەکردیت زۆر مەمنونی بەڕێزتانم بۆ هاوکاریتان.

ماکوان: لەخزمەتام کاک جەمال، ئەرێ بەڕاست دوکانێک لە خوارەوە بلیتی تەیارە دەفرۆشێت، خەڵکی باشن؟

جەمال: بەڵێ کاک ماکوان هەموو کەسی خۆمانن.

ماکوان: دوایی بڕۆمە لایان بلیتی نەرویج/ئۆسلۆم دەست کەوێت لە سلێمانی یان هەولێر کێشە نییە.

جەمال: جا ئێستا لەوێن بزانم پێیان ناڵێم.

ماکوان: زۆرباشە، دەمەوێت منو شیرین خان بڕۆین بۆلای گەنم ئەگەر ئیجازە هەبێت؟

شیرین: فەرموو بابڕۆین.

لەدەرگاکەیم دا چووینە ژورەوە.

ماکوان: کاتێک من منداڵ بووم، زۆر حەزم دەکرد وەکو تۆ ژوورم هەبێت، بەڵام سەربانیان دابومێ سەگم تیا بەخێو دەکرد بۆ شەڕ، ڕۆژێک لە سینەما بووم سەیری فیلمی هیندیم دەکرد، زۆر سەرنجی ڕاکێشام پاڵەوانی فیلمەکە جلەکانی دا بەشانیدا و ماڵی بەجێهێشت، دایک و باوکی شوێنیکەوتن کە ئەڕوات، بەهەرحاڵ منیش هاتمەوە بۆ ماڵەوە ویستم لاسایی ئەو پاڵەوانی فیلمەکە بکەمەوە، جلەکانم کۆکردەوە دام بەشانما کە بڕۆم وتم هەڵبەت نەنکم و باپیرم دەڵێن دانیشە بۆ کوێ دەڕۆیت، دەزانی



من دایکم و باوکم بەخێویان نەکردووم، باپیرو نەنکم گەورەیان کردووم، وەڵڵا جلەکانم دا بەشانما و نەنکم هات وتی ئەی کوێرایت دایە ئەوە ئەو جلانەم بەجوانی قەد کردووە بۆ وا تێکت داون.

باپیرم هەڵسا وتی ئەو جلانە بۆ کوێ ئەبەیت، یەک دوو زلەم خوارد، دوایش بەو گەرمایە بەپێی پەتی کردمیانە کۆڵان، قاچم هەموو سوتا، تا چوومە سێبەرێک. تۆش ماشاءاللەت لێبێت لەژووری سبلیت و تەلەفزیۆن و هەموو شتێکی جوانت هەیە.

تۆزێک قسەی خۆشم بۆکرد بە پێکەنینەوە بەجێم هێشت و هاتم بۆلای جەمال، وتم ماڵاوا بێت ئیتر پێناچێت زۆر یەکتری ببینین.

جەمال: من لەخزمەتاندام، هەفتەی داهاتوو بلیتیان هەیە بۆنەرویج لە ڕێگای تورکیاو قەتەرەوە، کامیانت دەوێت لەخزمەتاین.

ماکوان: زۆرباشە بەیانی خۆم قسەیان لەگەڵ دەکەم، ئەگەر دەکرێت ئەو دەمانچەیەم بۆ بهێنە لە ژێر مێزی نان خواردنەکەدایە، تا ئەوچوو بیهێنێت هاوارم کرد گەنم چاوەڕێم بێیت بۆ نووسینگە.

گەنم: بەسەرچاو.

شیرین: خوای گەورە سایەی برایەتیت کەم نەکات، دەزانم درێغیت نەکرد.

ماکوان: حەز دەکەم شتێک بڵێم، سوێند بەخوا چەندە خەفەت چووە بەدڵی گەنمدا دوو ئەوەندە بەدڵی مندا زۆر ناڕەحەت بووم کە ئەو کچە بەڕێزە خوشکی ڕاستیم نەبوو، بەڵام دڵم بەوە خۆشە کە تا ئەو ڕۆژەی دەمرم هەروەکو خوشکی خۆم مامەڵەی لەگەڵ دەکەم و هەرواش دەبم لەگەڵیدا، دڵم پڕبوو بۆی.

شیرین خان دەستی کرد بە گریان و بەجێم هێشت، ماڵاوایم لێکردن کاک جەمال هاتە خوارەوە لەگەڵمدا وتی خۆم ئەتگەیەنم.






ماکوان: نا بزانم ئەو کوڕانەی کە لەگەڵم بوون بزانم چییان لێهات، هەموو پرژوبڵاو بونەوتەوە با بیاندۆزمەوە، تۆ بڕۆ سەرەوە بۆلای شیرین خان.

تەلەفۆنم کرد بۆ نەبەز وتم لەکوێیت کاکە؟

نەبەز: سەیارەکەم لە قلیاسان بوو چووم هێنامەوە، ١٠ خولەکی ترلای ماڵی جەمال دەبم.

ماکوان: زۆرباشە.

نەبەز هات و گەیاندمیە ماڵەوە، هەرچەندە زۆر دڵخۆش بوو، وتم بۆچی دڵخۆشی؟

نەبەز: گەنم خوشکت نییە، دەتوانم بڕۆمە داوای ئێستا.

ماکوان: ئێ ڕۆڵە وا ئەزانی من پێم ناخۆشە؟ من دەبێت خۆم ژنت بۆ بهێنم، ئێ کەرە من برای بم باشترە یان ئێستا کە جەمال و وەرزێر و باوکی خاوەنی بڕیارن؟ من کاریگەریم لەسەری هەبوو دەمتوانی پەشیمانی بکەمەوە، کەچی ئەوەندە بێئەقڵی دلت خۆشە کە خوشکی من دەرنەچوو.

نەبەز: خۆ ڕاست دەکەیت، بەڵام کاکە ئەوەندە تورەیت زوو تورە دەبیت، وامزانی باشترە و نەجاتم بوو لەتووڕەبوونی تۆ، بەڵام ڕاست دەکەیت. باشە ئێستا من چیبکەم؟

ماکوان: ئێ بڕۆ داوای ناڵێیت حەقی بەسەر منەوە نەماوە.

نەبەز: ئێ تۆ دەچیتە داوای بۆم وایە؟

ماکوان: من حەقم چییە، تۆ ناڵێیت گەنم خوشکت نیە و من دەچمە داوای.

نەبەز: ئەی نەتوت خۆم ژنت بۆ دەهێنم؟



ماکوان: با وتم، بەڵام من بەردەوام گەنم بەخوشکی خۆم دەزانم و نامەوێت بەزۆر بیدەم بەشو، ئەگەر توانیت ڕازی بکەیت من وەعد دەچمە داوای قسەت ماوە؟

نەبەز: ئەی قوربانی ئەو قسەیەت بم ئەوە قسەی پیاوە.

ماکوان: باشە بەسەرچاو، بەڵام ئیشی قۆڕ نەکەیت، بڕۆیت لە وەرزێر بدەن و دووری خەنەوە، باشە؟

نەبەز: بۆ فەریکە نۆک ئەدزین.

ماکوان: فەریکە نۆک نییە، بەڵام گەنمە سەیرێکی کردم تێگەیشت دەستی کرد بە پێکەنین.

چوومە ماڵەوە زۆر ماندو بووم، خێرا خەوم لێکەوت، بەیانی هەڵسام جەمال تەلەفۆنی کرد وتی کاک ماکوان لە نووسینگەکەم بلیتت بۆ کەی دەوێت، لە سلێمانی و هەولێریش هەیانە.

بەپێکەنینەوە وتم: کاک جەمال دەتەوێت نەجاتت بێت بەدەستمەوە، بۆ نزیکترین کات دەمەوێت، بەڵام بڵێ چەند کیلۆم بۆ هەیە؟

جەمال: دەڵێن ٣٠ کیلۆ.

ماکوان: بزانە ناتوانن کیلۆی زیادە بەرم، چونکە کتێبم زۆر پێیە، تەنها کتێبەکانم ٣٠ کیلۆ دەبێت، من دەزانم ستاندارد ٣٠ کیلۆیە، بەڵام زیاتر ناتوانن؟

جەمال: دەڵێت لە مەتار قسەیان لەگەڵ دەکەین، بلیتەکەشت دیاری گەنمە.

ماکوان: نا؛ ئەگەر بە گەنم بێت حەزناکات من سەفەر بکەم، دەزانم تۆیت جا من قبوڵ ناکەم و نامەوێت کاکی خۆم.

جەمال: برا من خۆم حەز دەکەم، خزمەتێکت پێشکەش بکەم، جا ئەوە چییە بایی ٤٠٠ یۆرۆیە، من دە ئەوەندە قەرزاری تۆم.

ماکوان: نان خواردنی ماڵەکەت دانەوەی هەموو قەرزەکانی من بوو برا.

جەمال زۆری کرد و پارەی بلیتەکەی داو بۆ هەفتەی داهاتوو ڕۆژی شەممە کاتژمێر ٣ی شەو تەیارەکەم دەفڕی لە سلێمانییەوە بۆ تورکیا/ئەستانبوڵ و لەوێ بۆ نەرویج/ئۆسلۆ.

ماوەی ئەو هەفتەیە خۆم کۆکردەوە و هەندێک دیاری و کتێبی باشم کڕی، خوا حافیزیم لە هاوڕێکانم کرد، پێش گەڕانەوەم بەچەند ڕۆژێک گەنم هات بۆ نووسینگە پێشتر ئاگاداری کردبوومەوە.

گەنم: کاکە زۆر خۆشحاڵ بووم کەتۆم ناسی بەڕاستی هەستێکی زۆر خۆش و جوانم هەبوو ئەو ماوەیە.

ماکوان: گەنم گیان من خۆشحاڵ بووم بە خوشکایەتیت، کاتی تریش زۆرە کە بەخزمەتی جەنابت بگەمەوە، بەڵام ئامۆژگاریت دەکەم کە شو بە وەرزێر نەکەیت، چونکە وازی لە پڕینسیپەکەی خۆی نەهێنا بۆ عیشقەکەی، تۆ خاوەنی عیشق بە بەڵام بە پڕینسیپەکەی کە خوای گەورە بۆی داناوین، پێشنیارت بۆ دەکەم شوبکەیت بە هاوڕێیەکی من نەبەز، کوڕێکی باش و بێ فرتوفێڵە، جا ئازادی ئەمە پێشنیارە من ڕۆژی شەممە دەگەڕێمەوە، ئەگەر نەمبینیت خوات لەگەڵ.

خواحافیزیم لەو کرد و لەباسی نەبەز هیچی نەوت وتی: خوا ئاسانی بکات (ئەو قسەیە لەخۆمەوە فێربوبوو) هەر دەیوت خوا ئاسانی بکات.

پاشان تەلەفۆنم کرد بۆ دوکتۆر چالاک ماڵاوایم لێکرد و وتم سڵاوی من بەهەموو لایەک بگەیەنە و من دەگەڕێمەوە بۆ وڵاتی نەرویج ڕۆژی شەممە، لەدوای ماڵاوایی لەویش، ماڵاوایم لە نەبەز و وریا و هیوا کردو ئێوارەی جومعە خەریکی جانتا پێچانەوە بووم لەپڕ دایکم خۆی کرد بە

ژوورا وتی ڕۆڵە لەبەردەرگا قەرەباڵغییەکی زۆرە بزانە چییە، پێشڕەوی برات شەڕی نەکردبێت، کەوای وت ترسام و خێرا ڕامکرد کە چوومە خوارەوە، خۆپیشاندان بوو لەبەردەم ماڵماندا.

لەباخەکەی دوکتۆر چالاکەوە جەماعەت هاتبوون بۆ خوا حافیزی لەمن:

دوکتۆر چالاک، ئەنوەر، حاجی سەمیر، دلاوەر، کامەران، حاجی عەبدولکەریم، گەڵا، ئازار، سازان، خەجیج، سرەو، سروە، وشە هاتبوون.

بەخێرهاتنی ئەوانم کرد لەپڕ نامیق و فایەق هاتن، فەرمووم لەهەموویان کرد بۆ ژووری میوان و بەخێرهاتنی گەرمم کردن، نیو سەعات نەدەبوو لەگەڵ ئەواندا بووم شیرین خان و گەنم و کاک جەمال هاتن.

ژورەکە مەجالی هیچ نەبوو، وتم حەتمەن کۆمەڵێکیان دەڕۆن، کەچی هەموو دانیشتن هێشتا جێگام بۆ شیرین خان وجەمال نەکردەوە وریا و نەبەز و دایکی و سەیران و خێزانی وریا هاتن.

جێگا نەما ژنان جیابوونەوە و پیاوانیش بەجیا منیش ئەمدیواو دیوم ئەکرد بۆ لایان لەکۆتاییدا بەهەموویانم وت پرنسیپی خۆشەویستی لەیاد مەکەن هەرگیز لەیاد ناچن، گەورەترین مەبدەئی خۆشەویستی یادی خوای گەورەیە، تەڕەفی خوا بن هەرگیز زایەتان ناکات، خوا حافیزیم لێکردن و ئەوانم بەجێ هێشت، تا ئێستا کە ئەم ڕووداوانە بۆ خوێنەری بەڕێز دەخەمە سەر پەڕاو سەرنویشتی ئەو بەڕێزانەی کە ناسیمن بەمشێوازەی لێهات.

ئازار و خەجیج بەهۆکاری نەخۆشییەکەنا مردن، کامەران چاک بوویەوە.

سرەو نەشتەرگەری بۆ کراو گرێکەی مێشکی لابران و باش بوویەوە، بەڵام دەبێت چارەسەری کیمیایی وەربگرێت تا دووبارە سەرهەڵنەداتەوەو بەردەوام لەژێرچاودێریدا بێت.

سازان بەهۆکاری نەخۆشییەکەی مرد.

گەڵا نەشتەرگەری چاندنی مۆخی بۆ کراو سەرکەوتوو بوو، بەڵام بەداخەوە دلاوەر مرد بەهۆکاری نەخۆشییەکەی.

ئەنوەر و فایەق و نامیق بەهۆکاری نەخۆشییەکانیان مردن، وشە چاک بوویەوە.

گەنم و نەبەز هاوسەرگیریان کردوە و دوومنداڵیان هەیە، حاجی حەسەنی باوکی وریا و نەسرین خانی دایکی نەبەز عەمری خوایان کرد.

سەیرانی خوشکی نەبەز هاوسەرگیری کرد.

باپیری منیش عەمری خوای کرد، وا ئێستا منیش لە زیندانەوە بەدڵی پڕ ناسۆرەوە مەملەکەتی عیشقی دووەم دەنووسم و ڕووداوەکان بۆ خوێنەر دەگێڕمەوە.

کۆتایی بەم مەملەکەتەش هات.

ماکوان کەریم
زیندانی ئیولەشمۆ
٢٠٢٤/٠٢/١٤
دانیشن بەخێر



هەرکات زۆر سەختت لێ گوزەرا و
نائومێد بووی و
گەیشتیتە کۆتایی خەت
بەردەوام بە خۆت بڵێ:
بەموو دەگات بەڵام ناپچڕێت، چونکە
خوا هەیە، خوا هەیە، خوا هەیە

پڕۆژەی داهاتوو کتێبی مەملەکەتی پێغەمبەرانە کە خوێندنەوەیەکی نوێیە بۆ ژیانی پێغەمبەران!

# پێرست

# MAKWAN KERÎM

MEMILEKETÎ 'ÎŞQ

مەملەکەتی

# عیشق

خۆشەویستی بۆ خودا خۆشەویستییەکی شیرین و بێکۆتایە کە مرۆڤ بە کامڵبوون و هۆشیارییەوە و بە ڕووناکییەکی گەشاوەی ڕێنماییەوە بەرەو خودا دەڕوات و دەزانێت کە کۆتاییەکی باش و شیرین بەدوای خۆیدا دەهێنێت. خۆشەویستی واتە ژیان بە ئامانج.

خۆشەویستی بۆ خودا دەرگایەکی بەنرخە کە گەشە دەکات و بەرەو باشیت دەبات لە بەندە ڕاست و دروست و شایستەکاندا. خۆشەویستی هێزێکی سەیرە کە بەرگەی ئازار و کێشەکان ئاسان دەکات و هەستی گەورەیی و شەرەف و ڕێز لە مرۆڤدا دروست دەکات.





کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی

لقی یەکەم: هەولێر - بەرانبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

لقی دووەم: چوارڕیانی شێخ مەحموود - بەرانبەر مزگەوتی مەحموود عەللاف

٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤

 M.Ktebxan

نرخ: ٨٠٠٠

Cover Design: **Braw** Al-Najjar